ئەریك فرۆم

# بەناوی (( ژیان ))دوە

وەرگێڕانی

ئازاد بەرزنجی

چاپی دووەم

سلێمانی ٢٠٠٣

# بەناوی (( ژیان ))ەوە

بابەت: فەلسەفی
نوسینی: ئەریك فرۆم
وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی
تیراژ: دانە
ژمارەی سپاردن: ی ٢٠٠٣
چاپی: دووەم

# پێرست

# پێشەکی

کاتێـك (پـۆڵ ڕۆبنسـۆن) کتێبـی (چـەپی فرۆیـدی) ی بڵاوکـردەوە خوێنــەرانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو، چونکە لەناو لیستەی چەپو رادیکالیـەتی فرۆیدیدا نـاوی بیریـارێکی بـەناوبانگی فـەرامۆش کردبـوو کـە ئەسـتەمە بتـوانین نکـوڵی لـە قـووڵی ئەندێشــەو تێڕوانینــی ڕخنەگرانــەی بــۆ دنیــا بکــەین... ئــەو بیریــارەش ((ئەریك فرۆم)) ە.

((ئـەریك فرۆم)) یەکێکە لـەو بیریارانـەی لـە دەیـەکانی ((١٩٣٠)) دا لـە زانکـۆی فرانکفۆرت وانەیان دەوتەوەو پێکەوە بڵاوکراوەیـەکیان دەردەکرد کە تایبـەت بـوو بــە لێکۆڵینــەوەی فەلســەفیو کۆمەڵایــەتی.. ئــەم گروپــە ئــەمڕۆ بــە بیریــارانی ((قوتابخانەی فرانکفۆرت)) دەناسرێن. گروپێك کە دەیانویست لە دوای ئەزمونی ستالینەوە و بە هـۆی دەستکەوتەکانی فکری مۆدێرنەوە جارێکی دی بگەڕێنـەوە بـۆ مـارکسو (مـارکس) لـەو خوێندنـەوە دەقیـە ڕزگـار بکـەن کـە چـەند بـووە هـۆی لەدایکبوونی ستالین، هێنـدەش بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بووە هـۆی مردنـی هـەموو ئـەو خەونانـەی مـارکس مـژدەی سـەرهەڵدانی دابـوون. لـەم ئاسـتەدا فـرۆم ڕووی کـردە ئـەو ئاسـۆ تازانـەی میتـۆدەکانی ((فرۆیـد)) کردبوویانـەوەو هـەوڵی دا شـیکردنەوەی دەروونـی کـە دامەزرێنەرەکـەی لـە بنەڕەتـدا بـۆ تێگەیشـتن لـە تـاك دایمەزرانـدبوو، دەوڵەمەنـد بکـات بـەو تێڕوانینـە سۆسـیۆلۆجیەی لـە جەوهـەرو ناوەرۆکدا لە ژێر کاریگەریی ((مـارکس)) دایـە. ((فرۆم)) لـە چاوپێکەوتنێکدا (کە وەرگێڕانە کوردیەکەی لەم کتێبەدا دەخوێننەوە) دەڵێت کە پڕۆژەکەی بریتی‌یـە لـە دۆزینەوەی ئەو پەیوەندیە شاراوەیەی لـە نێوان بوداو مەسیحو باخۆفنو فرۆیـدو مـارکسدا هەیـە. بـەڵام ئـەم ڕسـتەیە هەڵخەڵەتێنـەرە گـەر وا تێبگـەین کـاری فـرۆم

تـەنها وتنـەوەی بـیرو ڕا هاوبەشـەکانی ئـەو پیـاوە دیذیـو بیریارانەیـە، بـەڵکو ڕاستتروایە بڵـێین فـرۆم لـە ڕێگـەو بـە هـۆی ئـەو بیریارانـەوە تێزێکـی تـازە بەرهـەم دێنێـت کـە تایبەتـە بـەخۆی. تێزێـك کـە ڕخنـەگرە لەئاسـتی دنیـادا و هیومانیستانەیە لـە ڕووی ئەخلاقیـەوەو گۆڕانخـوازە لـە ئاسـتی سیاسیدا. لێـرەوە ئەو چەند ڕستە کورتەی ((پۆڵ ڕوبنسون)) لە پێشەکەی کتێبەکەیدا کردویەتی بە بەهانـە بـۆ فـەرامۆش کردنـی نـاوی فـرۆم، تـا ڕادەیـەکی زۆر بـێ ویژدانیـە. ((روبنسـون)) دەڵێـت: ((چـەند جارێـك پرسـیارم لێ کـرا بۆچـی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە ((ئـەریك فـرۆم)) ی فەرامۆش کـرد کـە وەك یـەکێك لـە شۆڕشـگێڕانی قوتابخانـەی شیکردنەوەی دەروونـی، ناوبـانگێکی گـەورەی بـۆ خـۆی پێکـەوە نا. وەڵامـی ئەمـە ئاسـانە: بـێ گومـان فـرۆم لـەڕووی سیاسـیەوە لایـەنگری چـەپی فرۆیدیـە، بـەڵام پارێزگـارێکی دەمـارگیرە سـەبارەت بـە مەسـەلەی ((جـنس)) و نکـوڵی لـەو گرنگیـە دەکـات کـە فرۆیـد بـۆ جنسـی داناوەو ئـەو نرخـەش کـە ((ڕایـش)) و ((ڕوهـایم)) و ((مارکوزە)) بە جنسیان بەخشیوە(١) ئەگەر چی ڕاستە فرۆم وەك فرۆید گرنگی بـە مەسەلەی جنس نەداوە بەڵام کورتکردنەوەی جیاوازیی نێوان ئەم دوو بیریـارە بـۆ مەسەلەی جنسی تا ڕادەیەك کارێکی نازانستیانەیە. لە بنەڕەتدا جیاوازیی نێـوان فـرۆمو ئـەو بیریارانـە لەسـەر دژ بـوون یـان لایـەنگیری و گرنگـی دان بـە مەسـەلەی جنسی نیە (وەك ((روبنسون)) دەیەوێت دەری بخات) بەڵکو جیاوازیەکی سـەرەکی هەیـە لـە تێڕوانینـی هـەر یەکێکیانـدا بـۆ مـرۆڤ. ((فـرۆم)) هـەرگیز ئـەو بڕوایـەی فرۆیـدی قبـوڵ نـەدەکرد کـە پێـی وایـە ئـەزمونو پێویسـتیی جنسـی بزوێنـەرو دروسـت کـەری سـەرەکیی کەسـێتیی مرۆڤـە. ئـەو بەریانـە سۆسـیۆلۆجیە مارکسـیەی فـرۆم ایـی هـاتبووە دەرێ، ڕێگـەی لێ دەگـرت ((جـنس)) بەتاکـە بزوێنـەری سـەرەکی مـرۆڤ دابنێـت. لێـرەوە چـەند جارێـك لـە نوسـینەکانیدا ئـەو ڕەخنەیەی دوو بارە کردەوە کە لە نمونەی مرۆڤی فرۆیدی دەگرت. بەبڕوای فـرۆم نمونەی ئەو مرۆڤەی فرۆید (لە کارەکانی سەرەتایدا) لـە بـەردەم خۆیدا دایـنابوو، دەربڕینێکـی سـایکۆلۆژیی ئـەو مرۆڤـەبوو کـە بـازاڕی سـەرمایەداری بەرهـەمی

هێنابوو: وەك چۆن هەموو كەسێك لەبازاڕدا تەنها بە دوای سودو قازانجی خۆیدا دەگەڕێتو لەو پێناوەشدا پەیوەندی بەكەسانی دیەوە دەكات، هەروەها فرۆید (بە بڕوای فرۆم) مرۆڤی وەك كەسێك دەبینی كە بەدوای تێركردنی ئارەزووە جنسیەكانیدا دەگەڕێتو تەنهاش لەو پێناوەدا پەیوەندی بەكەسانی دیەوە دەكات، واتە پەیوەندی نێوان مرۆڤەكان پتر لە سەر بناغەی تێركردنی ئارەزووە سەركوت كراوەكانە. لەم تیۆرەیەدا مرۆڤ وەك بوونەوەرێكی خود پەرستو تەنیاو جیا لە كۆمەڵ دەردەكەوێت كە تاكە خەمی سەرەكی تێركردنی ئارەزووە جنسیەكانیەتی... خاڵێك كە فرۆم ئامادە نەبوو قبوڵی بكات، ئەو بە زمانێك كە بیری ماركسمان دەخاتەوە دەڵێت: ((پەیوەندیی مرۆڤو كۆمەڵگا وەستاو نیە. ناتوانین بڵێن تاكە كەس بە كۆمەڵێك غەریزەوە لە شوێنێكدا ڕاوەستاوەو كۆمەڵیش وەك شتێكای جیا كە ئارەزووەكانی تێریان سەركوت دەكات، لە شوێنێكا دی! گەرچی هەندێك پێداویستی وەك برسێتی و تینوێتی و غەریزەی جنسی لە هەموو مرۆڤێكدا هەیە، بەڵام ئەو ئارەزوانەی سروشتی مرۆڤ دیاری دەكەن وەك عەشق، نەفرەت، شەهوەتی دەسەڵاتو ئارەزوی تەسلیم، هەموو ئەمانە بەرهەمی پرۆسەیەكی كۆمەڵایەتین... جوانترین یان ناشرینترین ئارەزوەكانی مرۆڤ بەشێك نین لە سروشتێكی نەگۆڕو بایۆلۆجی، بەڵكو لەو ڕەوتو پرۆسەی كۆمەڵایەتیەوە سەرهەڵدەدەنی كە دروستكەری مرۆڤە))(٢)، واتە فرۆم هەرگیز ئەوە قبوڵ ناكات بڵێین مرۆڤ بە درێژایی قۆناغە مێژوییەكان دەتوانێت یەك شوناسو ماهیەتی هەبێت بەڵكو هەر قۆناغێكی كۆمەڵایەتی . ئابووریی دیاریكراواو سایكۆلۆجیای دیاریكراوی خۆی بەرهەم دێنیٚ.. لێرەوە فرۆم بڕوای وایە ئەو مرۆڤەی فرۆید سیماكانی دیاری دەكات تا ئەو شوێنە ڕاستە كە بڵێین بەرهەمی سیستمێكی كۆمەڵایەتی – ئابووریی دیاریكراوە كە ئەویش سەرمایەداریە. بەم مانایەش فرۆم بڕوای وایە فرۆید لەگشت كەسێك زیاترتوانیویەتی بە وردی سایكۆلۆژیای ئەو مرۆڤە بخوێنێتەوە كە بەرهەمی سەرمایەداریە.. مرۆڤێك كە تەنها بیر لە ئارەزوەكانی خۆی دەكاتەوە و بەردەوام لە ململانێدایە لەگەڵ

کۆمەڵدا. بەڵام گرفتی فرۆید (بەبڕوای فرۆم) لە ویوە دەست پێدەکات کە بڕوای وایە ئەو پێناسەیەی بۆ مرۆڤ کردویەتی بۆ هەموو سەردەمو قۆناغەکان دەگونجێتو سەرنجی ئەوەنادات هەر قۆناغێکی دیاریکراو سایکۆلۆژیای مرۆڤەکان بە شێوەیەکی دیاریکراوو جیاواز دەکێشێت. بە مانەیەکی دی وەك چۆن لای مارکس ئەوە بوونی کۆمەڵایەتییە، هۆشیاری کۆمەڵایەتی دەست نیشان دەکات، هەرواش لای فرۆم ((ئەوە شێوەی ژیانی مرۆڤە، کەسێتی مرۆڤ دەست نیشان دەکات... شێوەیەك کە لە منالیدا بە هۆی خێزانەوە (کەنوێنەری هەموو چۆنایەتیەکانی کۆمەڵە) بەرەو ڕووی بۆتەوە)) (٣) بەبڕوای فرۆم تەنانەت فرۆیدیش لە دواکاریەکانیدا پاشە کشەی لەو تێڕوانینە کردبوو کە پەیوەندی مرۆڤوکۆمەڵگا وەك ڕوو بەرێکی پێك دادان تەماشا دەکات کە هەرکەس تیایدا بە دوای قازانجی خۆیدا دەگەڕێت، چونکە فرۆید لە دواکاریەکانیدا دەیگوت ((ئامانجی ئیرۆس یەکگرتنو یەکپارچەیی خانەکانەولە مەش گرنگتر ئامانجی ژیاری بەوە دانا کە دەیەوێت پارچەکانی مرۆڤایەتی لە یەکە یەکی گەورەدا پێکەوە گرێ بدات))(٤) بەبڕوای فرۆم تیۆرەی غەریزەی ئیرۆس کە فرۆید لە دواکارەکانیدا کردی بە بزوێنەری سەرەکی مرۆڤ، کۆڕانێکی بنەڕەتی بەسەر سیماکانی ئەو مرۆڤەدا هێناوە کە فرۆید لە کارەکانی سەرەتایدا کێشابووی.. چونکە لەم تیۆرەدا ((چیدی مرۆڤ وەك ئامێرێکی تەنیاو خود پەرست دەرناکەوێت، بەڵکو زیاد لەهەموو کاتێك لە پەیوەندیدایە بەکەسانی دیەوە و بە هۆی غەریزەکانی ژیانەوە دەجولێت، کەوای لێ دەکەن پێویستی بە یەکێتی لەگەڵ کەسانی دیدا هەبێ، ژیانو عەشقو پەرەسەندن، یەك شتنو زۆر قوڵترو بونیادی ترن لەشادیو مەیلی جنسی))(٥).

فرۆم لەو تێڕوانینەوە کە مرۆڤ بەر لە هەرشتێك بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، بڕوای وایە گەورەترین گرفتی مرۆڤ بریتیە لە دۆزینەوەی جۆرێك لە پەیوەندی بە دنیاوە. ((وەك چۆن برسیەتی دەبێتە هۆی مردن هەرواش ئەنجامی تەنیاییو جیا بوونەوەی تەواو نەخۆشی دەروونیە))... ((هیچ مرۆڤێك ناتوانێت بێ هاوکاریی

کەسانی دی بژی. لە هەر کلتورو کۆمەڵێکدا کە بەخەیاڵدا دێت، مرۆڤ بۆ مانەوەی خۆی پێویستی بە کەسانی دی هەیە.. تەنانەت ((رۆبنسۆن کرۆزۆ)) ش کەسێکی وەك ((جمعە))ی لەگەڵدا بوو... بیّ ئەو نەك هەر رەنگە رۆبنسۆن شێت بوایە، بەڵکو بشمردایە)) (٦). بەڵام لە تێڕوانینی فرۆمدا چیرۆکی پەیوەندی یان جیا بوونەوەی مرۆڤ لە دنیاو کۆمەڵ، لە هەمان کاتدا چیرۆکی گێڕانەوەی ئازادیە، چونکە مرۆڤ چەند پێویستی بە پەیوەندی کردن بە دنیای دەرەوە هەیە، هێندەش پێویستی بە فەردیەتو خود بوون.. واتە بە ئازادی)) هەیە. لێرەوە بەبڕوای فرۆم کێشەی سەرەکیی مرۆڤ لەو پرسیارەدا خۆی ئاشکرا دەکات: چۆن پەیوەندی لەگەڵ کەسانی دیدا بکەین، بیّ ئەوەی ئازادی یان تاك بوونی (فەردیەت) خۆمان لەدەست بدەین؟ ... پرسیارێك کە بووە خەمی سەرەکی یەکەمو گرنگترین کتێبی ((ئەریك فرۆم)): (ڕاکردن لەئازادی) .. کتێبێك کە خوێندنەوەی بۆ هەموو ئەو کەسانە پێویستە کە دەیانەوێت قوڵتر لەو مرۆڤانە تێبگەن کە بڕیار بوو لە دوای ڕۆشنگەریەوە دەرگاکانی ئازادی بکەنەوە، بەڵام نەك هەر تەسلیمی هێزە تاریکەکان بوونەوە، بەڵکو لەسەر شانی خۆیان هەڵیان گرتنو لەسەر تەختی دەسەڵات دایان نان. کیّ وێنەی ئەو چەند ملیۆن مرۆڤەی لە یاد دەچێت کە لەبەردەم وتارەکانی ((فۆهەرەر)) دا شەیدایانە هوتافیان دەکێشاو بە بڕیارێکی ئەو ئامادە بوون بە دنیایەك باوەڕەوە بۆ کۆمەڵکوشتنی ئەو مرۆڤە نە ناسراوانە بچن کە هەرگیز خراپەیان بەرامبەر نەکردبوون. هەمیشە لە پشت ئەو هەزاران مرۆڤانەی لە ڕێکخستنێکی ئاسنیندا ڕیز دەبنو بە ئاسانی ئامادەی کوشتن دەبن، شتێکی کوشندەتر لە ترس هەیە. فرۆم لە پێشەکەی ((ڕاکردن لە ئازادی)) دا دەڵێت: ((ئێستا بە ناچاری ئەو ڕاستیە دەزانین کە ملیۆنەها مرۆڤی ئەڵمانی بە هەمان شەوقەوە ئازادیی خۆیان دۆڕاند کە باوانیان جەنگیان لە پێناودا کردبوو.

(ملیۆنەها مرۆڤ) لە جیّی ئەوەی داوای ئازادی بکەن، بە دوای ڕێگاکانی ڕاکردن لەئازادی دەگەڕان.. ملیۆنەهای تریش هیچ گرنگیەکیان پیّ نەداو بڕوایان وابوو بەرگری لە ئازادی نرخی شەڕکردنو گیان بە خت کردن نیە))(٧). ئەم کتێبە

شۆڕ بوونەوەیە بەناو ئەو هەلو مەرجە سایکۆلۆژیانەی ڕێگا بۆ دەسەڵات گرتنی فاشیەت هەموار دەکەن.. لەم ئاستەشدا کاری فرۆم تەواو کردنی کاری مارکسە. لە کاتێکدا مارکس ئەو هەلو مەرجە ئابوریانەی دەپشکنی کە دەبوونە هۆی باڵا دەستی چینێك ئەوا فرۆم هەلو مەرجە سایکۆلۆژیەکانی دەپشکنیٚ و بڕوای وایە بیٚ ئەو هەلەو مەرجە سایکۆلۆژیە سەرمایەداری نەیدەتوانی بناغەکانی خۆی پتەو بکات.., بە مانایەکی دی بۆ سەرمایەداری تەنها شێوەیەکی ڕێکخستنی ئابووری پێویست نیە بەڵکو لەوەش گرنگتر سایکۆلۆژیایەکی مەسرەفکەرو ئارەزووی ناوبانگ دەرکردنو کارکردن پێویستە بۆ ئەوەی سەرمایەداری بتوانێت خۆی سەقامگیر بکات. فرۆم بۆ دروست بونی ئەم سایکۆلۆژیایەش ئەو ئاینزا ڕۆژئاوایانە ئەپشکنیٚ کە ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە دروست بوونی کەسایەتی تاکی ڕۆژ ئاواییدا... بە تایبەتی ئاینزای ((مارتین لوٚثەر)) و ((کالون)) لێرەشدا پرۆژەی فرۆم لە پرۆژەی ((ماکس ڤیبەر)) نزیك دەبێتەوە. بەو جیاوازیەوە کە گەر خەمی ((ڤیبەر)) گەڕان بێت بەدوای ئەو ئاینزایانەدا کە ڕێگەیان بۆ ئەو شێوازە لە عەق لانیەت کردەوە کە بە بڕوای ((ڤیبەر)) تایبەتمەندی سەرمایەداری ڕۆژئاواییە، ئەوا فرۆم لەو ئاینزایانەدا بە دوای ئەو خۆ گونجاندن و ئارەزووی کارو ئیرادەی تەسلیمەدا گەڕا کە مەرجی سایکۆلۆژی سەرمایەداری بوون. بۆ ((ڤیبەر)) ئەوە گرنگ بوو تێبگا چی بووە هۆی ئەوەی ((شتە پیرۆزەکان لەگەڵ شتە دنیاییەکانو ئیمان لەگەڵ ساماندا ڕێك بکەون))(٨). لە کاتێکدا بۆ فرۆم گرنگ ئەوە بوو تێبگا چی بوو وای لیٚکرد جارێکی دی مرۆڤ ئامادەی تەسلیم کردنەوەی ئەو ئازادیە بێت کە لەدوای ڕێنسانسو ڕۆشنگەریەوە وا دەزانرا بە دەستی هێناوە. بەلاٚم ئەبیٚ ئەوە بڵێین لە تێڕوانینی فرۆمدا هیچ تەسلیم بوونێك بیٚ هەست کردن بە وەڕسیو بیٚ هوودەیی ناتوانیٚ ڕوو بدات. تەسلیم بوون نەك هەر کۆتاییەك بۆ پرسیارو گەڕانەکانی مرۆڤ دانانێت بەڵکو سەرەڕای ئەوەش دەبێتە هۆی پەشێویی دەروونی. چونکە وەك چۆن مرۆڤ ناتوانیٚ بیٚ پەیوەندی کردن بە دنیاو کەسانی دیەوە بژی، هەرواش ناتوانێت بیٚ پەشێویو نەخۆشی

دەروونـی تەسـلیمی هێـزە دەرەکیـەکان بێـت. دوا جـار چـونکە خواسـتی ئـازادیو خـود بـون هێنـدەی پەیوەنـدی کـردن بـە کەسـانی دیـەوە، بـۆ مـرۆڤ پێویسـتە. بـەم مانایـەش فـرۆم بـڕوای بـە دیالـەکتێکی دەروونـی هەیـە: لـە لایـەك پێویسـتی بـە پەیوەندی کردنو لە لایەکیش پێویستی بە ئازادییە. گەر پەیوەندیەکان ئازادی زەوت بکـەن دەبنـە هـۆی پەشـێوی دەروونـی... بـە شـێوەیەك کـە لـە دوا جـاردا مرۆڤـەکان ناچـار دەکـات بـە دوای شـێوازێکی تـری پەیوەندیـدا بگـەڕێن کـە زیـاتر دەرفەت بۆ ئازادیان بهێڵێتەوە. بە مانایەکی دی خواستو ئارەزوی ئازادیو خـود بوون لە تێڕوانینـی فرۆمـدا هـەمان حوکمی غـەریزەی هەیـە لـە تێڕوانینـی فرۆیـدا. لای فرۆیـد غـەریزە بنەڕەتیـەکان لـەلای کۆمەڵـەوە سـەرکوت دەکـرێن. بـەڵام بـەم سەرکوت کردنە فشاری غەریزەکان تەواو نابیٚ، بەڵکو مرۆڤ ناچار

دەکـات (ئەگـەر ڕێگـەمان بێـت ئـەم دەبڕینـە بـەکار بهێـنین) بـە شـێوەیەکی دیبلۆماسـی ڕێگەیـەکی دی بدۆزنـەو.. پرۆسـەیك کـە لـەدوا شیکردنەوەدا دەبێتـە هۆی بنیاد نانی ژیار. لای فرۆم هەمان هاوکێشـە بـەڵام بـە زمانێکی جیاواز خـۆی ئاشکرا دەکات: مرۆڤ ناچارە بە پەیوەندی. بەڵام پەیوەندیە مێژووییـەکان دەبنـە هـۆی لـە دەسـتدانی یـەکێك لـە بنـەڕەتی تـرین خواسـتەکانی مـرۆڤ کـە ئـەویش خواسـتی ئـازادیو خـود بوونـە.. ئەمـەش لـە دوا جـاردا دەبێتـە هـۆی ئـەوەی مرۆڤەکان بە دوای پەیوەندیی نوێدا بگەڕێن و پەیوەندیە کۆنەکان جیٚ بهێڵن.. پرۆسەیەك کە لەدوا جاردا دەبێت بگات بە دۆزینـەوەی  پەیوەندیـەکی تەندروست کـە پارێزگـاریی ئـازادیی مرۆڤـەکان دەکـات. ئەگـەر چـی ئەمـە شـتێك نیـە فـرۆم بـە ڕاشکاوی درکاندبێتی بەڵام دەتوانین لە ژێر نوسینەکانیەوە  بیخوێنینەوە.

فرۆم لە کتێبی دووهەمیدا بە ناوی ((مرۆڤ بۆ خودی خۆی)) هـەر لـە سـەرەتاوە دەست دەکات بەباسکردنی پەشێویە دەرونیـەکانی مرۆڤـی ئـەم سـەردەمە: مروڤـی ئەمڕۆ هەست بە ئاسایش ناکات و زیاتر توشی سەرلێشێوان بووە. کـارو کۆشـش دەکـات بـەڵام لـە چالاکیەکانیدا هەسـت بـەبیٚ هـوودەیی دەکـات لـە کاتێکـدا هێـزو توانای بەسەر مادەدا زیادی کردووە بەڵام لـە ژیـانی تایبـەتی خۆیـدا، خـۆی بـەبیٚ

توانا دەبینێت))(٩). فرۆم لەم کتێبەدا هەوڵ دەدات ئەخلاق لەسەر بناغەیەکی هیومانیستانە دابمەزرێنێ‌و بڕوای وایە لە هەموو مرۆڤێکدا جگە لەو ویژدانەی ناوی دەنێ ((ویژدانی دەسەلاتخواز)) (ئەوەی فرۆید ناوی نا ((بەرزەمن)) )، ویژدانێکی هیومانیستانە هەیە کە بریتیە لە ((دەنگی خودی ڕاستی خۆمان‌و بانگهێشتمان دەکات بۆ گەڕانەوە بۆ خود.. بۆ ژیانێکی پڕ بەرهەم‌و بۆ پەرەسەندنێکی هاوئاهەنگ.. واتە بانگهێشتمان دەکات بۆ ئەوەی ببین بەوەی بە زەبر (بالقوە) هەین))(١٠). بەبڕوای فرۆم ئەخلاق کۆمەڵێك ڕێسای دیاری کراو نیە کە لەدەرەوە بەسەر مرۆڤدا سەپێنرابێت، بەڵکو ئەخلاق بریتیە لە هەوڵدانی مرۆڤ بۆ ئەوەی خودی خۆی بێت‌وتەسلیمی ئەو پەیوەندیانە نەبێت کە ئازادیی زەوت دەکات. خود بوون لە تێڕوانینی فرۆمدا بریتیە لە تەقاندنەوەی توانا بەزەبریەکانی مرۆڤ لەڕێگەی کارایی‌و بەرهەرم هێنانەوە. لێرەوە بڕوای وایە ((گرفتی ئەخلاقیی ئەم سەردەمە گرنگی نەدان‌و بێ هودەیی مرۆڤەبەرامبەر بەخودی خۆی))(١١) ئەو مرۆڤەش کە خودی خۆی لەدەست دەدات دەبێتە هۆی پەشێویی دەرونی (وەك لەسەرەوە باسمان کرد) ئالێرەدایە مەسەلەی ئەخلاق‌و مەسەلەی ئازادی بەیەك دەگەن... لێرەوە فرۆم لە پێشەکیی ئەمەکتێبەدا دەڵێت: ((مرۆڤ بۆ خودی خۆی)) بەردەوامی پرۆژەی ڕاکردن لە ئازادیە. لە نەسکی یەکەمی ئەم کتێبەدا دەڵێت: ((مرۆڤ بە هۆی عەقڵەوە جیهانێکی مادیی وای دروست کردووە کە لە خەون‌و ئەفسانەی پەریەکان‌و یۆتۆپیای تێپەڕاندووە. هێزە فیزیکیەکان بەشێوەیەك کۆنترۆڵ کراون کە مرۆڤ دەتوانێت هەل‌و مەرجێکی پێویست بۆ ژیانی شایستە بە مرۆڤ‌و پڕ بەرهەم بۆ خۆی دەستەبەر بکات. ئەگەر چی مرۆڤ بە هەندێك لە ئامانجەکانی‌نەگەیشتوە بەلام گومانی تێدا نیە ئەم ئامانجانە ئێستا لەبەر دەستدان. ئێستا بۆ یەکەم جار مرۆڤ دەتوانێت بزانێت کە یەکیەتی ڕەگەزی مرۆڤ چی دی خەون‌و خەیاڵ نیە، بەڵکو ئەگەرێکی واقعیە. کەوابوو ئایا مرۆڤ مافی ئەوەی نیە کە شانازی بەخۆیەوە بکات‌و بڕواو هیوای بە ئایندەی مرۆڤ هەبێت؟))(١٢) لە دوا نەسکی ئەم کتێبەدا وەلامی ئەم پرسیارانە بە

ئیجـابی دەداتــەوەو بــڕوای وایــە ((قۆنــاغی ئێســتا قۆنــاغێکی گواســتنەوەیە. سەردەمی ئێمە دەرەنجامو سەرەتایەو لە هەناوی خۆیدا هەڵگری گەلێك توانایـە)). بەم مانایەش ئەگەر چی فرۆم ڕەخنە لە هەندێك لە تێزەکانی ڕۆشنگەری دەگرێت، بـەڵام بڕێکـی زۆر لـەو خۆشـبینیو ئومێدەواریـیـە سەردەمیڕۆشـنگەری لەگـەڵ خۆیـدا هـەڵگرتوون، لـە ڕاسـتیدا ئـەو خۆشـباوەڕیو خۆشـبینیەی ڕۆشـنگەری بەرامبەر بە عەقڵ هەیبوو، فرۆم بەو ناکۆکیە دەرونیانەی هەیە کە پاڵنـەری مـرۆڤن بۆ دۆخێکی تەندروستتر. بە ڕاستیش مەسـەلەی ئومێد یەکێکە لـەو مەسـەلانەی فرۆم کتێبێکی تایبەتیی بۆ تەرخان کردووە بە ناوی ((شۆڕشی ئومێد)) ەوە. لای ئـەم بیریـارە ئومێـد چاوەڕوانکردنی ئاینـدە نیـە بـەو مانایـەی ((چاوەڕوانکردنی ڕوداوێك بێت کە سبەینێ یان ساڵێکی دی یان سـەردەمێکی دی دێتـەدی))(١٣) . چونکە بەبڕوای فرۆم لەپشت ئەم جۆرە ئومێدەوە ((بت پەرستیی ئایندەومێـژوو و بـاوان ڕادەوەسـتێت. بـت پەرسـتیەك کـە لەشۆڕشـی فەرەنسـیو خـەڵکانی وەك ڕوبسپیرەوە دروست بوو. کە ئایندەی وەك بتێك دەپەرست))(١٤). بەبڕوای فرۆم ئومێـدواری واتـە: ((هـەموو کاتێـك ئامـادە بـوون بـۆ ئـەو شـتەی کـە لـە دایـك نــەبووە))(١٥). ((ئومێــدواری حاڵــەتێكو چــۆنایەتیەکی بوونــە.. ئامادەییــەکی دەروونیــە.. ئامادەییـەکی کۆبـۆوەو هێشـتا مەسـرەف نـەکراو بـۆ کـارایی)). بـەم مانایـەش ((کاتێـك ئومێـد لـەناو دەچـێت ژیـان بـە زەبـر یـان بـەکردەگی لـە نـاو دەچێت)). لێرەوە فرۆم ئومێدەواری بەیەکێك لە هەرە پێویستیە زیندوەکانی مـرۆڤ دادەنێـتو لـەم کتێبـەدا هـەموو ئـەو دەرەنجامـە وێرانکاریانـە دەخوێنێتـەوە کـە نائومێـدی بـۆ مرۆڤـی دروسـت دەکـات، بـەڵام لێرەشـدا فـرۆم لـەوە ئاگادارمـان دەکاتـەوە کە ئومێدواری یـان نائومێدیی تاکە کـەس دەرەنجـامی ئومێدواری یـان نائومێـدیی ئـەو کۆمەڵـە یـان چینەیە کە مرۆڤ تیایـدا گـەورە دەبێـت ((کەسـێك کـە لـەرێی ئـەزموونی خۆیـەوە ئومێدەوار دەبـێ کاتـێ دەبینـێ کۆمـەڵ یـان چینەکەی ئومێدی خۆی لە دەست داوە، ئەوا ئەویش نائومێد دەبێت))(١٦).

لە ڕاستیدا فرۆم هەمیشە لە نوسینەکانیدا لە تاکەوە بۆ کۆمەڵو لە کۆمەڵەوە بۆ تاك دەگوێزێتەوە... بە شێوەیەك ناتوانین بە وردی تێبگەین فرۆم چ لایەکیان تاوانبار دەکات: تاکە کەس کە توانا بەزەبریەکان ناخاتە گەڕ یان ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتیە- ئابوریەی تاکە کەس لە ژێر کارتێکردنیدایە؟ بە بڕوای ((هربرت مارکوز)) ئەگەر چی فرۆم ئاماژەی خێرا بۆ هەلو مەرجە کۆمەڵایەتیەکان دەکات بەڵام پتر ئەو تاکە کەسە تاوانبار دەکات کە فرۆم خۆی ئاشکرای کردووە چۆن سیستەمەکە ناچار بە تەسلیم بوونی کەسایەتی خۆی کردووە. لێرەدا ((مارکۆز)) هێرشێکی توند دەکاتە سەر فرۆمو لە خانەی لادەرەکان (تحریفیەت) دا دایدەنێت. لادەرێك کە ئەگەر چی خۆی وەك ڕەخنەگرێك دەردەخات بەڵام ئەمە جگە لە هەڵخەڵەتاندن هیچی دی نیە. چونکە فرۆم ((ئەگەر چی بەشێکی زۆری کتێبەکانی تەرخان کردووەبۆ ڕەخنە لە ((ئابوری بازاڕ)) و ئایدۆلۆژیاکەی کە دەبن بەبەربەست لەبەردەم پەرەسەندنی بەرهەمهێناندا، بەڵام لێرەدا ڕادەوەستێتو ئەم ڕەخنەیە ناگەیەنێتە ئەو جێگەیەی مامەڵەیەکی ڕەخنەگرانە بکات لەگەڵ بەهای بەرهەمهێنانو بەهای کەسایەتیدا کە ڕاستەوخۆی بەهای ئەو کۆمەڵگایان کە لەسەرەتاوە ڕەخنەیان لێگیراوە))(١٧) لێرەوە مارکۆز بڕوای وایە نوسینەکانی فرۆم ((وا لەخوێنەر دەگەیەنن دەکرێت ((بەها بەنرخەکان)) لەو هەلو مەرجەدا پراکتیك بکرێت کەلەسەرەتاوە غەدری لەو بەهایانە کردووە))(١٨). لە ڕاستیشدا تێڕوانینی فرۆم بۆ مرۆڤ گرفتی گەورە دەخولقێنێ. ئەو لە پێشەکەی کتێبی ((ڕاکردن لەئازادی)) دا دەڵێت: ((وەك چۆن مرۆڤ خوڵقاوی مێژووە، هەرواش مێژوو خوڵقاوی مرۆڤە)). بەڵام گومانی تێدانیە گرفتەکان لەوە گەورەترن بەم ڕستە شیعریانە چارە سەر بکرێن. چونکە لەلایەك مێژوو وەك خوڵقاوی مرۆڤێك تەماشا دەکرێت کە بڕیارە خواستی ئازادیو عەشقو (هەموو ئەو ئارەزوانەی فرۆم ناویان دەهێنێت) ئارەزووی ڕیشەیی بن لە دەرونیدا.. لە لایەکیش لەناوسیستمێکی کۆمەڵایەتیو ئابوریدا دەژی کە فرۆم لەهەر کەسێك زیاترو ورد تر دەرەنجامە وێرانکارەکانی لەئاستی سایکۆلۆژیدا باس کردووە. ئایا لێرەدا

دژايەتيەكى قولْ لە تێڕوانينى فرۆمدا خۆى ئاشكرا ناكات؟ گومانى تێدا نيە تا ئەو دەمەى لە چوارچێوەى تێڕوانينى فرۆمەوە سەرنج بدەين، هيچ دژايەتيەك لە گۆڕێ نيە، چونكە فرۆم سيستمى ديموكراتى كۆمەڵگاى سەرمايەدارى وەك قۆناغێكى پێشكەوتو كراوەدەنرخێنێو ((بڕواى وايە ژيارى تەكنۆلۆژى بەرەو ئەوە دەڕوات پەيوەنديەكانى دايك سالارى كە لەسەر بناغەى لێبوردنو خۆشەويستى دامەزراوە، بخاتە جێى پەيوەنديەكانى ئەو كۆمەڵگا باوك سالاريەى پێش سەرهەڵدانى ديموكراتى لەئارادا بووە.... چونكە ژيارى تەكنۆلۆژى پێويستى بە كارى كۆيىو ڕێكخراو هەيە)) واتە مرۆڤەكان ناچار دەكات بەردەوام لە پەيوەنديدا بن بەيەكەوە.

بەگشتى فرۆم گەرچى ڕەخنەگرێكى كۆمەڵگاى سەرمايەداريە بەلاّم خۆشبينە بەرامبەر بەو دەستكەوتانەى ديموكراتىى ڕۆژئاوايى هێناويەتە ئاراوەو بڕواى بە ئايندەيەكى باشترو ئينسانى تر لە ناو هەمان ئەو هەلو مەرجە كۆمەلاّيەتيە ئابوريەدا هەيە... كە لەسەرەتاوە خولْقێنەرى كەسايەتيەكى بىّ هودەو سامان پەرستو نامۆيە (وەك فرۆم خۆى ئاشكراى كردووە) لە ڕاستيدا فرۆم بىّويستى خۆى لە ناو هەمان چوارچێوەى سيستمى سەرمايەداريدا پێشنيار دەكاتو ڕەخنە دەگرێت... كارێك لە دوا دەرئجامدادەبێتە هۆى زياتر سەقامگير بوونى سيستمەكە نەك گۆڕينى... ئەمەش ڕەنگە گەورەترين ڕەخنە بێت كە بتوانين لە پرۆژەى ئەم بيريارە بەناوبانگەى بگرين. بەلاّم بەهيچ شێوەيەك ئەم ڕەخنەيە لە گرنگىو بەهاى فرۆم كەم ناكاتەوە، چونكە كەم كەس هەيە هێندەى ئەو وردبينىوقووڵى پيشان دابێت لە شيكرنەوەى دەروونناسى كۆمەلاّيەتيدا. لە ڕاستيدا تێگەيشتنمان بۆ ئەم سەردەمەو بۆ گرىّ سايكۆلۆژيەكانى مرۆڤى ئەم سەردەمە، بىّ خوێندنەوەى ئەريك فرۆم، تێگەيشتنێكى فەقيرە، لێرەوە وەرگێڕى كوردى بەهەڵبژاردنى بۆ كتێبێكى ئەم بيريارە بەناوبانگە، خزمەتێكى گەورەى خوێنەرى كورد دەكات كە تا ئێستاش هيچ سەرچاوەيەكى كوردى لەسەر ئەم بيريارە لەبەر دەستدا نيە، بە تايبەتيش كتێبێكى هەڵبژاردووە كە دەتوانين بڵێين

کورتەی هەموو ئەو بۆ چوونو تێڕوانینانەیە کە فرۆم لە کتێبەکانی تریدا بە درێژی لەسەریان ڕاوەستاوە. ((بەناوی ژیانەوە)) دەکرێت باشترین دەروازە بێت بۆ تێگەیشتن لە زۆربەی تێزەکانی ئەم بیریارە کە یەکجار ترسناکە گەر سەدەی بیست جیٚبهێلێنو هێشتا هیچی لەبارەوە نەزانین.

**پەراوێزەکان:**

١) اليسار الفرويدى – پول روبنسون ت: لطفى فطيم ، شوقى جلال . دار الطليعة للطباعة والنشر . بيروت. الطبعة الاولى ١٩٧٤. ص ,١٩

٢) گريز أز آزادي اريك فروم. ت: عزت ا لـله فولادوند. انتشارات مرواريد . چاپ ششم ١٣٧٠. ص ٣٢و ,٣٣

٣) هـ . س. پ

٤،٥) انا تومى ويرانسازى انسان، اريك فروم – ت: أ. صبورى. نشر فرهنگ . چاپ دوم ١٣٦٤ . ص ,٦٧٣

٦،٧) گريز از آزادي

٨) مدر نيته وانديشه انتقادى . بابك احمدى . نشر مركز . چاپ اول ١٣٧٣ . ص ,٣١

٩،١٠،١١،١٢) انسان براى خويشتن . اريك فروم. ت: اكبر تبريزى . انتشارات كتابخانه بهجت.

١٣،١٤،١٥،١٦) انقلاب أميد . اريك فروم. ت مجيد روشنگر . انتشارات مرواريد . چاپ اول ١٣٢٧

١٧،١٨) ايروس والحضارة . هربرت ماركوز . ت: مطاع صفدى . دار الآداب .١٩٧٠

# خۆشگوزەرانی و بێزاری
# لە كۆمەڵگای ئێمەدا

## - كەسێتیی كارلێكراو

باسەكەمان دەربارەی ((خۆشگوزەرانیو بێزاری))یە، سەرەتا دەبێ‌بزانین مانای ئەم دوو وشەیە چییە. لەهەر لێكۆڵینەوەیەكدا، بەم لێكۆڵینەوەیەی ئێمەشەوە روونكردنەوەی ماناكان شتێكی زۆر پێویستە، كاتێ لەتەواوی لق و چەمكە ناوەكیو لاوەكیەكانی مانای وشەیەك گەیشتین، باشتر لە بابەتێكی دیاریكراو پەی بەمەبەستەكانی دەبەین. مێژووی ناسینی وشە لە تێگەیشتندا یارمەتیمان دەدات.

دەستەواژەی ((كۆمەڵگای خۆشگوزەران- یان كۆمەڵگای رەفاه)) لەساڵی ١٩٥٨ەوە كاتێ (جۆن كینیپ گالبرایت) كتێبێكی بەهەمان ناونیشانەوە بڵاوكردەوە" هاتە نێو زەین و رۆشنبیریی ئێمە (ئەمریكا)وە، وشەی affluence (خۆشگوزەرانی - یا فرەیی) لە كرداری fluere ی لاتینییەوە كەمانای toflow (رشتن)ە هاتووەو لەگەڵ وشەی fluid (شل یا رەوان)دا یەك رەگیان هەیە. مانای ژێرەوەیی ئەم وشەیە overflow واتە پڕبوون تا سنووری لێ رژان یان تێپەڕاندن (تجاوز)ە. هەموو دەزانین ئەم شێوە پڕبوونەش دەشێ سوودمەند یان زیانبەخش بێت. ئەگەر رووباری میسیسیپی لێی بڕژێ كارەساتی لێ دەكەوێتەوە. بەڵام ئەگەر چاڵەگەنمی جووتیار پڕبێت و گەنمی لێ بڕژێ دەبێتە مایەی خۆشیو

بەرەکەت. بۆیە فرەیی زاراوەیەکی روون نییە. دەشێ نیشانەی زۆریەك بێت کە ژیان خۆش دەکات، بە پێچەوانەی ئەو ژیانەوە کە تەنها بریتییە لە ململانێ لە پێناوی مانەوەدا، هەروەها دەشێ نیشانەی زۆریەك بێت کە ئەنجامەکەی وێرانکەرو تەنانەت مەرگباریشە. بەکورتی فرەیی باش هەیەو فرەیی خراپ.

دەربارەی وشەی abundance (فرەیی)و superfluity (زۆری)ش ئاڵۆزییەك لە ئارادا نییە. گەرچی مانای رەگەکانیان کەمێك لێك جیاوازن.

abundance لەوشەی unda لاتینییەوە هاتووە کە مانای wave (شەپۆل)ەو زمانی ئینگلیزی مانای ئەسڵی لەهەردوو وشەی undulatio وundulant دا پاراستووە. abundanceیش بەمانای overflowing (لێ رژان و تێپەراندن) دێ، بەم پێیە مانایەکی پۆزەتیڤی هەمەلایەنەی لە زمانی ئێمەدا بەدەست هێناوە. زەویەکی بە پیتوفەڕ (Abundant) زیاد لە ئەندازەی ئاسایی بەروبوومی هەیە. ئەم زەوییە (زەویی فرەیی)یەو ((تەورات)) وا باسی دەکات کە وەك ئاوی رەوان شیرو هەنگوینی لێیە. یان وادابنێ لە دەعوەتێك بوویت کە مەیو بادەکانی بە لاتەوە خۆش بوون. تۆیش بەمجۆرە وەسفی دەکەیت: ((بادەکەی دەتوت ئاوی رەوانە)) لەم دووبارەدا مانای رەوان حاڵەتێکی پۆزەتیڤانە بە خۆوە دەگرێ. واتە لەم دوو حاڵەتەدا کەمو کورتی نەبووە، سك هەڵگوشین نەبووە، مرۆڤ پێویستی بەوە نەبووە لە پێناوی دابین کردنی گوزەرانیدا ئەمرۆ زۆر ئیش بکات و سبەینێش هیچی نەبێ بیخوات.

بەڵام ئەگەر بمانەوێ لایەنە نەگەتیڤەکەی وشەی ((لێ رژان)) ovrerflowing پیشان بدەین" وشەی superfluous (زیاد یان زۆری) بەزەینماندا ختوورە دەکات. ئەم وشەیەش وەکو وشەی affluent لەکرداری fluere ی لاتینییەوە ریشە دەگرێو ((superfluity)) هەر ((superflowing))ە. بەڵام لێرەدا flow over بارێکی تەواو نەگەتیڤانەی هەیەو بەمانای زێدەرۆیی (افراط) و بەفیڕۆدان دێ. ئەگەر بەکەسێك بڵێیت ((ئامادەبوونی تۆ لێرە زیاد (overflous)ە)) مەبەستت ئەوەیە کە پێی بڵێیت ((بۆچی ناڕۆیت؟)). بەم پێیە هەر کاتێك باس لە فرەیی (affluence) بێت دەبێ

لەخۆمان بپرسین کە ئایا مەبەست لـیٚ‌ی مانا پۆزەتیڤەتی –پیت وفەڕ– یان مانا نەگەتیڤەکەی –زیادی–.

ئیٚستاش بگەڕیٚینەوە سەر وشەی بیٚزاری (ennui) (ملل، سأم –و–).

مانای ئەسلٚی‌ی ئەم وشەیە لەمانا باوەکەی کە وەڕسی و دلّتەنگی‌و مەلەلە قوولٚترە. ڕەگی هەردوو وشەی ennui (فەرەنسایی)و annoyی ئینگلیزی کرداری Inodiareی لاتینی‌یە کەبەمانای ((بزواندنی هەستی دلّهەلٚکەندن)) دیٚ.

ئیٚستا کە ماناو مەبەستی ئەم وشەیەمان زانی دەبیٚ بپرسین ئایا ((زیادی)) superfluity لەئەنجامدا وەڕسی‌و بیٚزاری‌و دلّهەلٚکەندنی لیٚ ناکەویٚتەوە؟ ئەگەر واش بیٚت ئەوا دەبیٚ ئیٚمە ڕووبەڕووی کۆمەلٚیٚك پرسیاری دژوار سەبارەت ((کۆمەلٚگای خۆشگوزەران– یا کۆمەلٚگای ڕەفاه)) ببینەوە. مەبەستیشم لە ((ئیٚمە)) کۆمەلٚگای پیشەسازیی نویٚ (مۆدیٚرن)ە کە لە ولاٚتەیەکگرتووەکانی ئەمریکاو کەنەداو ئەوروپای خۆرئاوادا پەیدابووە، ئایا ئیٚمە ژیانمان لە خۆشگوزەرانیدایە؟ چ کەسیٚك لەکۆمەلٚگای ئیٚمەدا ژیانیٚکی خۆشگوزەرانی هەیە؟ ئەو خۆشگوزەرانی‌یە چ جۆریٚکە؟ فرەییە یان زیادی. بەمانایەکی دی، خۆشگوزەرانی‌یەکی باشە یان خراپ ؟ ئایا ئەو خۆشگوزەرانیەی ئیٚمە بیٚزاری لیٚناکەویٚتەوە؟ ئایا هەمیشە فرەیی دواجار دەبیٚتە هۆی بیٚزاری؟ ئایا خۆشگوزەرانی‌یەکی باش‌و بزویٚن کە فرەیی لەگەلٚدابیٚت‌و نەبیٚتە مایەی بیٚزاری چۆنە؟ ئەمانە کۆمەلٚیٚك پرسیارن کەدەمەویٚ لیٚرەدا بیانخەمە بەرباس‌و لیٚکۆلٚینەوە.

بەلاٚم سەرەتا با سەرنج لەلایەنی سایکۆلۆژیی مەسەلەکە بدەین. بەو پیٚ‌یەی کە من خۆم دەروونشیکارم" لەم باسەدا چەند جاریٚك ئاماژە بۆ لایەنە سایکۆلۆژیەکان دەکەم. بۆ ئەوەی بە شیٚوەیەکی باشتریش لە بابەتەکە بگەن پیٚویستە سەرنجی ئەوە بدەن کە ڕوانگەی من بۆ مەسەلەکە سایکۆلۆژیای قوولٚ (Depth Psychology)، یان هەمان دەروونشیکاری‌و تویٚ‌تویٚ کردنی دەروونیە. شتیٚکیشتان بیر دەخەمەوە کە ڕەنگە زۆربەتان پیٚ‌ی ئاشنا بن. بۆ تویٚژینەوەی سایکۆلۆژیانەی ڕۆحی مرۆڤ دوو ئیمکان‌و دوو دەروازە لە ئارادایە. هەنووکە

سایکۆلۆژیای ئەکادیمیانە بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕوانگەی قوتابخانەی ڕەفتارگەرایی (السلوکیە– Behavorsim)ەوە لە ڕەگەزی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، بە واتایەکی دی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە بەتەنها بایەخ بەوە دەدات کە دەکرێ ڕاستەوخۆ ببینرێو جێی سەرنجدان بێت، هەر بۆیە توانای ئەندازەگیری‌ەو هەڵسەنگاندنی سنووردارە، لەبەر ئەوەی شتێك ڕاستەوخۆ نەبینرێ قابیلی هەڵسەنگاندن نی‌یە – یان لانی کەم بەوردی هەڵناسەنگێنرێ.

سایکۆلۆژیای قووڵ یان دەروون شیکاری (شیکاریی دەروونی) ڕێگایەکی تر دەگرێتە بەرو ئامانجی تری هەیە. ئەم ڕێبازە بەتەنها بایەخ بە کردەوەو ڕەفتاری بینراوی مرۆڤ نادات، بەڵکو دەگەڕێ بەدوا ماهیەتی ڕەفتارو ئەنگێزە شاراوەکانیدا.

با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستم چەند نموونەیەك بهێنمەوە: بۆ نموونە دەتوانیت وەسفی زەردەخەنەی کەسێك بکەیت، دەتوانیت وێنەی فۆتۆگرافی‌ی ئەو زەردەخەنەیە بگریت، یان لەڕێی زاراوەکانی کۆئەندامی ماسولکەوە دەموچاوەکە توێ‌توێ بکەیت و شتی لەم بابەتە" بەڵام زۆر باش دەزانیت کە جیاوازی هەیە لەنێوان زەردەخەنەی کەسێك کە ڕقی لێتە بەڵام وا پیشان دەدا کە خۆشی دەوێیت و زەردەخەنەی هاوڕێیەکدا کەبەدیدارتان شادمان دەبێ، دەتوانیت سەدان زەردەخەنە بژمێریت کە لەحاڵەتی دەروونی‌ی جیاجیاوە سەرهەڵدەدەن. هەموویان زەردەخەنەن" بەڵام هەریەکێکیان لەگەڵ ئەوی تردا جیاوازە، جیاوازی‌یەك کە لەتوانای هیچ ئامێرێکدا نیە ئەندازەی بگرێو پەی پێ بەرێت، ئەم کارە تەنها لە مرۆڤ دەوەشێتەوە کە ئامێر نی‌یە– بۆنموونە تۆ، تۆ نەك تەنها بەهۆی مێشکتەوە بەڵکو– وەکو پێشینان دەڵێن– بەدڵی خۆشت هەست بەو جیاوازیانە دەکەیت، تەواوی بوونتان پەی بە هۆو ئەنگێزەی ئەو زەردەخەنانە دەبات. دەتوانیت هەست بکەی ئەوەی دەیبینیت چ جۆرە زەردەخەنەیەکەو، ئەگەر ئەو هەستە شك نەبەیت لە ژیاندا دووچاری گەلێ نائومێدی دەبیت.

سەرنجی جۆرە رەفتارێکی تر بدە: بۆ نموونە شێوەی نان خواردن. کەسێك نان دەخوات. زۆر چاکە. بەڵام چۆن دەیخوات؟ یەکێك بەهەڵپەوە نان دەخوات. یەکێکی تر هەوڵ دەدات دەستووری نانخواردن و هەندێ داب و نەریتی سەر سفرەو چاککردنەوەی قاپەکەی خۆی بپارێزێت. کەسێکی دی بەهێمنی و بەسادەیی‌و بەبێ هەڵپە نانەکەی دەخوات و لە نانخواردنەکەی چێژ دەبینێت.

نموونەیەکی تر بهێنینەوە. دەبینیت کەسێك هات وهاوارێتی، رووی خۆی گرژ کردووەو چاوی بووە بە گۆمی خوێن. بەوەدا بۆت دەردەکەوێ کەتوورە بووە، بێگومان توورەبووە. بەڵام ئەگەر زیاتر ای ێی وردبیتەوەو لەهەستی رابمێنیت (لەوانەشە ئەو کەسە باش بناسیت) ناکاو تێدەگەیت کە دەترسێ‌و تۆقیوەو توورەبوونەکەشی کاردانەوەی ئەو ترسەیە. ئەگەر زیاتریش ورد بیتەوە دەبینیت کەسێکی لاوازو بێدەسەڵاتەو، لەهەموو شتێك، تەنانەت لە ژیانیش دەترسێت. بەمجۆرە سێ حاڵەت لەو کەسەدا بەدی دەکەیت: توورەیە، دەترسێت و لەناخیشەوە هەست بە بێدەسەڵاتی دەکات. ئەم سێ بینینە راستن، بەڵام هەریەکەیان پەیوەندیی بەناسینێکی جیاوازی بونیادی رۆحی ئەو کەسەوە هەیە، هەستی بێدەسەڵاتی قووڵترین حاڵەتی دەروونی ئەوە بەڵام توورەیی رووکەشترین حاڵەتی رۆحیەتی‌و بەواتایەکی دی ئەگەر کاردانەوەی تۆش بەرامبەر ئەو توورەبوون بێت ئەوا حوکمی کەسێکی توورە بەسەریدا دەدەیت‌و لەراستیدا ناتوانیت پەی بەتەواوی بوونی ئەو بەریت. بەڵام ئەگەر بڕوانیتە ئەو دیو رواڵەتی توورەی ئەوەوەو کەسە ترساوو بێدەسەڵاتەکە ببینیت، ئەوکات رەفتارێکی دی بەرامبەر بەو کەسە دەنوێنیت. ئینجا دەبینیت کە توڕەییەکەی نامێنێ, چونکە ئیتر هەست ناکات هەڕەشەی لەسەر ماوە. لەروانگەی دەروونشیکارییەوە – کەلەهەموو مەسەلەکانی ئەم باسەدا گرنگیی پێ دەدین– لە دەرەوەڕا ناڕوانینە رەفتاری مرۆڤ. بەڵکو دەڕوانینە ئەنگێزەکانی، ئەو مەبەستانەی بەدوایاندا دەچێت و هەروەها ئاستی ئاگایی‌و بێ ئاگایی ئەو لێیان. ئەوەی جێی بایەخی ئێمەیە چۆنێتیی رەفتاری ئەو مرۆڤەیە. تیۆدۆر رایك کە

یەکێکـە لـە هاوکلرەکـانم دەیـوت: ((دەروونشـیکار بـەگوێی سـێیەمی شـت دەبیستێ)) ئەمەش قسەیەکی زۆر بەجێیە. یان بە دەربڕینێکی سادەتر دەتوانین بڵێین ((دەروونشیکار بەینی دێڕەکان دەخوێنێتەوە))و دەروونشیکار نەك تەنها رواڵەت بەڵکو ناوەوەش دەبینێت. ئەو دەڕوانێتە ناخی کەسێتی کە هەر کاردانەوەیەکی دەربڕین و نیشانێکی پەتییە. بەڵام رەنگی ئەو کەسێتییەی بەخۆیەوە گرتووە، رەفتاری هەر کەسێك تایبەتە بەخودی ئەو کەسە خۆیو بە وردو درشتیەوە هەڵسوکەوتێکە کەتەنها لەوەوە دەوەشێتەوە، بەم پێیە دووکەس نابینینەوە کە کردەوەیان وەکو یەك بێت، بەنیسبەت ئەوەشەوە کە دوو مرۆڤ تەواو لەیەك بچن دەشێ خسوسیاتی دوو کەس لەیەك بچن، بەڵام هەرگیز ئەو دوو کەسە تەواو وەکو یەك نین. دوو کەسمان بەرچاو ناکەوێ وەکو یەك دەست بەرزبکەنەوە، وەکو یەك بەڕێدا بڕۆن و وەکو یەك سەر ڕابوەشێنن. هەر ئەمەشە وات لێ دەکات هەندێ جار بەجۆری رۆیشتنیدا کەسێك بناسیتەوە" تەنانەت بەبێ ئەوەی روخساریشی ببینیت. شێوەی رۆیشتنیش وەکو دەموچاو دەکرێ ببێتە تایبەتمەندێتی تاکەکەس. بگرە رەنگە رۆیشتن تایبەتمەندێتییەکی ناسێنەرتربێت لەدەموچاو. چونکە دەکرێ سیمای دەموچاو بگۆڕرێ" بەڵام شێوەی رۆیشتن دژوارترە.

دەتوانین بەسیمامان درۆ بکەین، گیانەوەران توانای ئەمەیان نییە. بەڵام درۆکردن بەلەش دژوارترە، گەرچی مرۆڤ دەتوانێ فێریشی ببێت.

پاش ئەم پێشەکییە، دێمە سەر بابەتی ((مەسرەفگەرایی))و وەکو مەسەلەیەکی سایکۆلۆژیانە یان باشترە بڵێم وەکو کێشەیەکی سایکۆپاپولۆجی (Psychopathological Problem) لێی دەدوێم. لەوانەبە بپرسن جا ئەمە چ شتێکی نهێنی تێدایە؟ ئێمە هەموو مەسرەف دەکەین، هەموو کەسێك دەبێ بخوات و بخواتەوەو جلوبەرگ بپۆشێت، هەمووما‌ن پێویستمان بەخانوو هەیە. بەکورتی ئێمە لەکەرەسەکان پێداویستییەکانی خۆمان دابین دەکەینو ئەم کارەش ناو دەنێین ((مەسرەف- یا سەرف کردن)) ئیدی چ مەسەلەیەکی سایکۆلۆژی لەمەدا

هەیـە. رێـك ئەمـە ڕێو ڕەوشـی سروشـتە: دەبـێ مەسـرەف بکـەین تـا بـەزوویی بمێنینەوە.

بێگومـان ئـەوەی مەبەسـتی منیشـە هـەر ئەمەیـە، بـەڵام مەسـرەف تـا مەسـرەف کەوتووە. جۆرە مەسرەفێك هەیـە لـە چاوچنۆکیەوە سەرچاوە دەگرێ: زۆر لـەخۆ کردن بۆ خواردن، کڕین، خاوەندارێتیو مەسرەفی زیاد لە پێویست.

لەوانەیە بپرسن وبڵێن ئایا ئەمە مـەیلێکی ئاسایی نییـە؟ ئایـا هـەموومان حـەز ناکـەین کـە داراییمـان لـە زیادبوونـدا بێـت؟ کەواتـە مەسـەلەکە ئەوەیـە کـە پـارەی تـەواومان نییـە تـا شـتی پـێ بکڕین نـەك ئـەوەی ئـارەزووی دارایـی زیـاتر شـتێکی نـاڕەوا بێـت.. چـاکە، مـن دەزانم کـە زۆربـەتان وا بـیر دەکەنـەوە. بـەڵام دەشـێ نموونەیـەك پیشـانمان بـدات کـە مەسـەلەکە بـەو ئاسـانییە نییـە وەك لەیەکـەم بینیندا خۆی دەخاتە ڕوو.

نموونەکەی منیش لای هیچتان نامۆ نییـەو هیوادارم کـەمتان دووچاری ئـەوە بووبن. کەسێك بهێننە پێش چاوتان کە دووچاری قەڵـەوی بـووەو کێشـی زیـاد لـە پێویسـتە. دەشـێ قەڵـەوی لەئـەنجامی نـاڕێکیی لووەکانـەوە بێـت، بـەڵام بـەزۆری هۆیەکـەی زۆر خۆرییـە. ئـادەمیزادی قەڵـەو دەیـەوێ بـەردەوام دەمـی بجووڵـێ، حەزی لە شیرینییەو، دەستی بگاتە هەر خواردنێك ناخونەکێکی لێ دەدات. ئەگـەر بـاش سـەرنج بـدەن دەبینیـت کـە ئـەو نـەك هـەر بـەردەوام خـەریکی خواردنـە بـەڵکو هەمیشـە بـەدوای خواردنیشـدا دەگـەڕێت. ئـەو پێویسـتی بـەوە هەیـە بخـوات، وەك چـۆن هەنـدێ لەوانـەی جگەرەدەکێشـن نـاتوانن جگـەرە نەکێشـن" ئـادەمیزادی قەڵەویش ناتوانێ نەخوات. دەزانین کەواز هێنان لەجگەرە دەبێتە هـۆی کردنـەوەی ئیشتیهاو زۆر خواردن و پاشانیش قەڵـەوی. بـەڵام موعتادەکـان بـەبیانووی ئـەوەی جگەرەنەکێشان دەبێتە هۆی قەڵەوی واز لەکێشان ناهێنن. بۆچـی ئێمـە ئـەم جـۆرە بیانووانـە بۆخۆمـان دەهێنینـەوە؟ چـونکە وەکـو پێداویسـتی دەروانینـە خـواردنو خواردنـەوەو جگەرەکێشـان و کـڕینی شـتومـەك. پزیشـکەکان لـەوە ئاگادارمـان دەکەنـەوە کـەزۆر خـۆری، مەشـروب خواردنـەوەو جگـەرە کێشـان دەبێتـە هـۆی

سەکتەی دڵو مەرگی زوو. ئەگەر خەڵکی گوێ لەئامۆژگاریی پزیشکەکان بگرنو ئەو خووانەیان تەرك بکەن، زۆربەیان لە پرێکا دووچاری نیگەرانی، نائارامی، دەمار گرژیو خەمۆکی دەبن. لەگەڵ ئەوەدا کە نەخواردنو نەخواردنەوەو نەوازهێنان لەجگەرە مرۆڤ دووچاری ترس دەکات. مەسرەفی زۆر لای ئەم جۆرە کەسانە رێگایەکە بۆ رزگاربوونیان لەخەمۆکی. مەسرەف گفتی تەندروستیو سەلامەتی دەدات، بەڵام ناتوانین بە مەسرەف چارەسەری نیگەرانیو خەمۆکیی پەنهان بکەین. هەموومان ئەوەمان تاقی کردۆتەوەو بینیومانە کە وەختێ تووڕەو دڵتەنگ دەبین بەرەو لای یەخچاڵ (سەللاجە)ەکە دەچین تا شتێك بدۆزینەوەو بیخەینە دەممانەوە" گەرچی ئیشتیهای خواردنیشمان نەبێ، بەواتایەکی دی خواردن و خواردنەوە دەتوانن رۆڵی دەرمانێکی ئارامبەخش ببینن، بەتایبەتی کە ئەمان تامیان لە دەرمانیش خۆشترە.

ئادەمیزادی دڵتەنگ (خەمۆك _کئیب) هەست دەکات بۆشاییەك لە دەروونیدا هەیە، وا هەست دەکات ئیفلیج بووەو هێزێکی بزوێنەری تێدا نەماوە، کاتێ مەسرەفێك دەکات لەوانەیە بۆ ماوەیەکی کەم هەست بەو بۆشاییەو ئیفلیجیەی نەمێنێت و دەڵێت: منیش کەسێکم، شتێك لەدەروونمدا هەیەو مەسرەف دەکەم، دەیەوێت بە مەسرەف ئەو بۆشاییەی دەروونی خۆی پڕ بکاتەوە. کەسێکی لەم جۆرە کەسێتیەکی کارلێکراو Passive ی هەیەو، گەرچی هەوڵ دەدات مەیلی ئازار هێنی خۆی بۆ مەسرەف رەت بکاتەوە بەڵام ((مرۆڤێکی مەسرەفکەر- یا بەرخۆر- ئیستهلاکی)) (Homo consumens)ە.

ئێستاش کە مانای ((کەسێتی کارلێکراو))م روون کردەوە بێگومان دەپرسن کە مەبەستم لێی چییە، زۆر چاکە. بابزانین کارایی (چالاکی) چییەو کارلێکراوی (کەوتنە ژێرکاریگەری -و-) چییە؟

کارایی (چالاکی) واتە کارێکی ئامانجدار کەپێویستیی بەهێز هەیەو دەشێ جەستەیی یان فیکری بێ، وەرزشیش چالاکیە، بەکارێکی سوودمەندی دەزانین، وەرزش هەم تەندروستمان دەکات و هەم پلەو پایەی وڵاتمان بەرز دەکاتەوەو

هەندێ جار بەناوبانگو پارەداریشمان دەکات. هەر کەسێك کاربکات کارایە (چالاك– Active). بەمجۆرە کەسە دەڵێین ((سەرگەرمی کارە))و سەرگەرمبوون بەکارێکەوە واتە خۆ خەریککردن بە پیشەیەکەوە.

ئێستاش بابزانین کارلێکراوی (ناکارایی_ passivity) چیە؟ ئەگەر ئەنجامی بەرچاوو دەسکەوتی بینراو نەخەینە روو ئەوا کەسێکی کارلێکراوین. با نموونەیەکی روون بهێنمەوە: کەسێك بهێنەرە بەرچاوت کە بێدەنگ و بێ جووڵە دانیشتووەو چاوی بڕیوەتە دیمەنێك. ئەم کەسە هیچ کارێك ناکات و تەنها چاوی بڕیوەتە شوێنێك، هەر بۆیە ناتوانین پێی بڵێین کە چالاکە. یان کەسێك بهێنەرە پێشچاوت کە نوقمی دونیای رامان (تأمل) (Meditation) وە دەیەوێ لەخودی خۆی، لە هەستەکانی، لە حاڵەتەکانی خۆیو دەروونی خۆی وردبێتەوە. ئەگەر ئەو بە شێوەیەکی رێکوپێك ئەم کارە ئەنجام بدات لەوانەیە بۆ چەند سەعاتێك لەو بارەدا بمێنێتەوە. کەسێك کە هیچ لە حاڵەتی ئەو نازانێ بە کەسێکی کارلێکراوی لەقەڵەم دەدات، ئەو سەرگەرمی کارێك نیە. لەوانەیە هەموو تەقەللای ئەو بۆ دەرکردنی هەموو هزرو بیرێك بێت لە مێشكو زەینی خۆی.

بیر لە هیچ ناکاتەوەو بەتەنها جەستەیەکەو هیچی دی. لەوانەیە ئەو حاڵەتە بەلای ئێوەوە سەرسوڕهێنەر بێت، بەڵام خۆتان ئەوە تاقی بکەنەوە، تەنها بۆ دوو دەقیقەش بێت، ئەوسا دەزانن چەند دژوارە. هەمیشە شتێك بە مێشکتاندا تێدەپەڕێ. هیچترینو بێ بایەخترین شتی ئەم دنیایە بە زەینتاندا گوزەر دەکات، ئەوسا دەبینن کە بەرامبەر هێرشی ئەو بیرۆکانە چەند بێ دەسەڵاتنو بەرگریتان پێ ناکرێ. بەکورتی بێ جووڵە دانیشتنو دەرکردنی بیرو هزر لە مێشکی خۆتان کارێکی سەختەو تەحەمول ناکرێ.

لە کەلتووری هیندیو چینیدا رامان بایەخێکی ژیاذی هەیە. بەڵام لای ئێمە (خۆرئاواییەکان) واذیە" چونکە ئێمە پەخسیری پلەو پایە پەرستین، بۆیە وا دەزانین کە دەبێ هەر چیەك دەکەین لە پێناوی ئامانجو مەبەستێکدا بێت. دەبێ ئەنجامێکمان دەست بکەوێو شتێکمان چنگ بکەوێ. بەڵام گەر بۆ تاقە جارێکیش

ئامانجو مەبەست فەرامۆش بکەیتو بتوانیت بگەیتە قۆناغی چڕکردنەوەی بیرو بەسەبرەوە خەریکی راهێنان بیت ئەو کات دەبینی چۆن هەمان ئەو ((بێکاری_ بەتاڵی_ Idleness))ە دەبێتە مایەی تەڕوبڕیی جەستەو رۆح. مەبەستم ئەوەیە ئەمرۆ تەنها رەفتارێك بە چالاکی لەقەڵەم دەدەن کە ئەنجامێکی لەبەرچاوی هەبێت. ناکاراییەك کە بەرهەمێکی دیارینەبێ بەرەفتارێکی بێهوودەی دەژمێرن، لەم رۆژگارەی ئێمەدا کاراییو کارلێکراوی بەپێی ئەو مەسرەفەی دەیکەین هەڵدەسەنگێنرێ. ئەگەر ئەو شتە زۆرانە سەرف بکەین کە ((فرەیی خراپ)) دەیخاتە بەردەستمان، ئەوا لە راستیدا چالاکیمان کارلێکراوی (ناکارایی)ە. کەواتە چ جۆرە چالاکییەك خولقێنەری ((فرەیی باش))ەو سەروەتەو دەتوانێ ریّمان بۆ خۆش بکات تا ببینە کەسێکی بالاّتر لە مەسرەفکەر (بەرخۆر)ێك؟

## - بیزاری لە کۆمەڵگای ئێستادا

سەرەتا با بزانین پێناسەی کلاسیکی کاراییو کارلێکراوی لای ئەرستۆو سپینۆزاو گۆتە و مارکس و بیرمەندانی تری جیهانی خۆرئاوا لەدوو هەزار ساڵی رابردوودا چییە. کارایی واتە هێنانەکاری هێزە خودییەکان کە مایەی بزواندنی تواناو حاڵەتەجەستەییو عاتیفیو هێزی وهونەرییەکانمانن. لەوانەیە هەندێکتان نەزانێ مەبەستی من لە هێزە خودییەکانی مرۆڤ چییە، چونکە ئێمە خوومان بەوەوە گرتووە کەگوێمان لەوشەی هێز دەبێت ئامێر لەزەینماندا بەرجەستە دەبێت نەك مرۆڤ. بڕواشمان وایە هێزەکانی مرۆڤ بەپلەی یەکەم دەبێ بەئاراستەی داهێنانی ئامێرو مەکینە کەناڵیزە بێت، ئێمە چەند زیاتر بکەوینە ژێر کاریگەریی هێزی مەکینەکانەوە زیاتر لەسەیرو سەمەرەیی هێزەکانی مرۆڤ خافڵ دەبین، وامان لێ دێ ئیتر باوەڕ بەو گوتەیەی سۆفۆکلیس ناکەین کە لە شانۆنامەی ((ئەنتیگۆنا))دا دەڵێت:((شتە سەیرو سەمەرەکانی جیهان زۆرن، بەلاّم هیچیان هێندەی مرۆڤ سەیرو سەمەرە نین)).

بەلای ئێمەوە ئەو موشەك (ساروخ)ەی بەرەو مانگ دەڕوات زۆر سەرسوڕهێنترە لەبوونی مرۆڤو، جاری وایە لافی ئەوەش لێ دەدەین کە هەندێ لە داهێنانەکانمان لە خولقاندنی مرۆڤ لەلایەن خواوەندەوە سەیرو سەمەرەترە.

ئەگەر بمانەوێ لەهەستو هۆشو هێزەخودییەکانی ئاگادار بین" دەبێ شێوازی بیرکردنەوەی خۆمان بگۆڕین. ئێمە بەتەنها بەهرەی قسەکردنو بیرکردنەوە شك نابەین، بەڵکو توانای بینینی قووڵترو توانای خۆشەویستیو توانای هونەریشمان هەیە. هەموو ئەو خەسڵەتانە خۆیان لەخۆیاندا هەنو پرەنسیپی پاداشتو سزاش بەسەر هەموو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤدا بالادەستە. خەلات و سزا دوو ئەنگێزەی گەورەن کە مرۆڤ وەکو گیانەوەرانی دی کاردانەوەی بەرامبەریان هەیە. مرۆڤ فێر دەبێت ئەو کارانە ئەنجام بدات کەخەلاتی بەدوادا دێتو لەوکارانەش دوورەپەرێز دەبێت کە ترسی سزایان لێ دەکەوێتەوە، بەتەنها تەمێ کردن (ئاگادارکردنەوە) بەس نییە بەڵکو هەڕەشە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ کاری نادروست نەکات. بێگومان پێویستە هەندێ کەسان تەمێ بکرێن تا مەترسیی سزادان بە هەڕەشەیەکی گاڵتە وەرنەگرن.

ئێستاش بابزانین مەبەست لە ((ناچاربوون)) چییە، باکەسێکی مەست بهێنینە بەر چاومان، ئەویش دەشێ ((کارا)) بێت، هاوار دەکاتو دەمانچەکەی دەخولێنێتەوە. یان کەسێك کە بەزاراوە سایکۆلۆژییەکەی پێی دەڵێن ((شێت_Maniac)). کەسێکی وەها زیاد لە پێویست کارایەو بە خەیاڵی خۆی دەتوانێ یاریدەی هەموو جیهان بدات، بەپەلە بەڕێدا دەڕوات، ئاسمانو ڕێسمانت بۆ دەهۆنێتەوەو هەرچییەکی بەدەستەوە بێت یاریی پێ دەکات. بەجۆرێکی سەرسوڕهێن کارا دەنوێنێ، بەلام ئێمە دەزانین کە بزوێنەری کەسە مەستەکە بادەیەو، کۆمەڵێك تێکچوونی ئەلکترۆکیمیش شێتەکەی ناچارکردووە بەو جۆرە هەڵسوکەوت بکات، هەرچەندە هەردووکیان لە ترۆپکی کاراییدان.

هەر چالاکییەك کە وەکو کاردانەوەیەکی پەتیی ئەنگێزەیەك یا ناچاربوونێك یان حاڵەتێکی سەرچاوەگرتوو لە خرۆشانی عاتیفی (Passion)ەوە بێ لەڕاستیدا

کارلێکراوی‌یە"گەرچی بنەمایەی جووڵەش، هەردوو وشەی (passion) (خرۆشانی عاتیفی) و (passive) (کارلێکراو) لەدوو وشەی possio و passivus ەوە وەرگیراون کە ڕەگی هەردووکیان کردارێکی لاتینی‌یەو بەمانای ئازارچەشتن (to suffer) دێ، کەواتە وەختێ بەیەکێك دەڵێین کەسێکی passionate (عاتیفی)یە واتە پێناسێکی ناڕوون ولاوازیمان کردووە، شلایرماخەری فەیلەسووف وتوویەتی: ئێرەیی (حەسوودی) واتە هەڵچوونێك کەدەبێتە مایەی ئازار. کارایی لای ئەو بیرمەندانەی ناوم بردن بریتی‌یە لەبەکاربردنی ئەو هێزانەی کەلەرەگەزی بەشەریدا هەن، بەڵام عادەتەن بە پەنهانی‌ودواکەوتوویی ماونەتەوە.

چەند دێڕێکی نووسینێکی ((کارل مارکس))تان بۆ دەهێنمەوە، دەبینن کەهەمان ئەو مارکسە نی‌یە کە لە ڕێی کتێبە زانکۆییەکانو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی چەپو ڕاستدا ناسیوتانە. مارکس لە کتێبی ((دەسنووسە ئابووری‌و فەلسەفی‌یەکان))دا دەنووسێت: ((ئەگەر خاڵی دەستپێکردنی ئێوە ئەوە بێت کە مرۆڤ مرۆڤەو پەیوەندیی لەگەڵ جیهاندا مرۆیییە، بەم پێیە تەنها دەتوانیت بە خۆشەویستی لەخۆشەوسیتی‌و بە متمانە لە متمانەو هتد بگەیت. ئەگەر بتەوێ کار لە خەڵك بکەیت ناچاریت بەشێوەیەکی واقیعی بیانخولقێنیت و بۆ خەبات هانیان بدەیت. هەر جۆرە پەیوەندیەکی ئێوە لەگەڵ خەڵكو -سروشت-دا دەبێ گوزارشتێکی تایبەتی لە حەقیقەتی خودی ئێوەو لە ژیانی فەردیی وابەستە بە ئامانج و مەبەستەکانی ئێوە بێت. ئەگەر کەسێکت خۆش بوێ بەڵام نەتوانیت خۆشەویستی تێدا ببزوێنیت، واتە ئەگەر خۆشەویستی ئێوە وا لەبەرامبەر نەکات بە خۆشەویستی وەڵامتان بداتەوە، ئەگەر یەکێکت خۆش بوێ بەڵام تۆ نەبیتە مایەی خۆشەویستی لای ئەو" ئەوکات خۆشەویستیەکەتان بێ دەسەڵاتەو ئەنجامەکەی ناخۆشی‌یە.))

ئاشکرایە کەلێرەدا مارکس وەکو جۆرێك لەکارایی باس لە خۆشەویستی دەکات. ئادەمیزادی ئەمڕۆ بڕوا ناکات کە دەتوانێ لە ڕێی خۆشەویستی‌یەوە خولقێنەر بێت. ئامانجی ئاسایی‌و بگرەتاکە ئامانجی ئەوەیە کە خۆی لای خەڵك

خۆشەویست بێت نەك ئەم خەڵكی خۆش بوێت تا هەستی خۆشەویستییان تیا بورووژێنێتو لەم ڕێیەوە شتێكی تازە بخولقێنێت، شتێك كە پێشتر لە جیهاندا نەبووە، هەر بۆیە ئەمرۆ خەڵكی ((كەوتنە داوی خۆشەویستیەوە)) بە مەسەلەیەكی ڕێكەوتی لەقەڵەم دەدەنو یان وا دەزانن لەڕێی كڕینی كاڵای جۆراوجۆرەوە كە گوایە دەبێتە هۆی ئەوەی خۆشەویستی بكات دەتوانن خۆشەویستی بەدەست بهێنن. بۆ نموونە وەكو كڕینی مە عجوونی دانو جلوبەرگی جوانو ئۆتۆمۆبێلی كەشخەو گرانبەها. لەراستیدا من نازانم مەعجونی دان یا جلوبەرگی شیك دەبێ چ كاریگەرییەك لەسەر خەڵك بكات، بەڵام دەتوانم جەخت لەسەر ئەو راستیەیە ئەسەفبارە بكەم كە خەڵكانێك كەسانێكیان خۆش دەوێت لەبەر ئەوەی ئۆتۆمۆبێلی سپۆرتیان هەیە، بێگومان دەبێ ئەوەش بڵێم كە گەلێ لە پیاوانیش ئۆتۆمۆبێلەكانیان لە هاوسەرەكانیان زیاتر خۆش دەوێ، بەهەر حاڵ لەم جۆرە پەیوەندییانەدا سەرەتا هەردوو تەرەفەكە خۆشحاڵن، بەڵام پاش ماوەیەك لەیەكتر بێزار دەبنو جاری وایە رقیشیان لەیەكدی دەبێتەوە، چونكە هەست دەكەن فریویان خواردووە یان هەڵخەڵەتاوبوون. وایانزانیوە خۆشەویستییان لاهەیە بەڵام تەواوی رەفتارو كردەوەكانیان لاف لێدانی خۆشەویستیبووەو خۆشەویستیی كارایان تاقی نەكردۆتەوە.

هەروەها وەختێ -بەمانا كلاسیكەكە- بەیەكێك دەڵێین (كارلێكراو) مەبەستمان ئەوە نییە كە ئەو كەسە بێدەنگ لە گۆشەیەكدا دادەنیشێتو نوقمی بیركردنەوەو رامان دەبێو چاو دەبڕێتە دیمەنێك، بەڵكو مەبەستمان لەوەیە كە ئەو كەسە كۆمەڵێك هێز ڕێنومایی دەكات كەهی خۆی نین، بە واتایەكی دی كاردانەوەی هەیە بەڵام كاری نییە.

هەڵبەت نابێ ئەوەش فەرامۆش بكەین كە زۆربەی چالاكیەكانی ئێمە كاردانەوەیە بەرامبەر ئەنگێزەو حاڵەتی جیاجیا كەلەبەر ئەوەی پێیان ئاشناین، كاتێ ئاماژەیەكی تایبەتمان بۆ دێ وەڵامێكی دیاریكراومان تێدا دەوروژێنێ. پاڤلۆڤ لە تاقیكردنەوە بەناوبانگەكەی خۆیدا خۆراكەكەی بەدەنگی زەنگەكەوە

بەستەوە، بەجۆرێك كە بەبیستنی دەنگی زەنگەكە لیك بەدەمی سەگەكەدا دەهاتە خوارەوە. سەگەكە كاتێ بەرەو خۆراكەكە رایدەكرد زۆر ((كارا))بوو، بەڵام ئەم ((كارایی– چالاكی))ە تەنها كاردانەوەیەك بوو بەرامبەر بە ئەنگێزەیەك. ئەم سەگە وەكو مەكینە (ئامێر) كاری دەكرد. رەفتارگەراكان (السلوكیون– Behavorists)یش بڕوایان وایە كە مرۆڤ بوونەوەرێكی كاردانەوەییە، ئەنگێزەیەكی پێشان بدە یەكسەر كاردانەوەی لا دروست دەبێ. دەتوانین هەمان تاقیكردنەوە لەگەڵ مشكو مەیمونو مرۆڤ و تەنانەت پشیلەشدا ئەنجام بدەین. گەرچی كاردانەوەی پشیلە لاوازە، جەخار كە لەم رووەوە مرۆڤ ئامادەگیەكی پتری تێدایە. رەفتارگەرایی باوەڕێكی پتەوی بەوە هەیە كە ئەو كاردانەوەیە مایەی ئازارە، ئەم قسەیە نەك تەنها سەبارەت بە ئێرەیی راستە، بەڵكو سەبارەت بەهەر هەڵچوونێك كە بەشێوەیەكی نا ئیرادی لە سروشتی مرۆڤێكدا كاری خۆی بكات وەكو: پلەو پایەخوازی، چاوچنۆكی، حەزو خولیا بۆ دەسەڵات و زۆرخۆری. هەموو خووەكان هەڵچوونی ئازارهێنو شێوەیەكن لەشێوەكانی كارلێكراوی، وشەی passion لەبەكارهێنانی ئێستایدا مانای جۆروجۆری لەخۆ گرتووەو مانا روونەكەی خۆی لەدەست داوە. لێرەدا بواری روونكردنەوەی هۆی ئەوە نییە.

ئەگەر سەرنج لەچالاكیی كەسانێك بدەن كە تەنها كاردانەوەیان هەیە، یان كردەوەیان ناچارییەو بەمانا كلاسیكەكە خەڵكانێكی كارلێكراون" دەبینن كە كاردانەوەكانیان ئاراستەیەكی نوێ نادۆزنەوەو هەمیشەش چوون یەكن. بە دڵنیاییەوە دەتوانیت پێشوەخت بزانیت كاردانەوەیان چۆنو چی دەبێت. دەكرێ حیسابی هەموو شتێك بكرێ. لەكن ئەم كەسانە فەردگەرایی لەئارادا نییە، هێزی فیكری هیچ رۆڵێكی نییەو، دەڵێی هەموو شتێك بەرنامەی بۆ دانراوە: هەمان ئەنگێزەو هەمان ئەنجام.

دەتوانیت هەمان ئەم حاڵەتانە لە مشكەكانی ناو تاقیگەشدا بەدی بكەیت. لەو روانگەیەوە كە رەفتارگەراكان مرۆڤ وەك میكانیزمێك تەماشا دەكەن" كۆمەڵێك تایبەتمەندێتیی میكانیكیی دەدەنە پاڵ ئەنگێزەیەكی دیاریكراو كاردانەوەیەكی

دیاریکراو دەخولقێنێت. توێژینەوەو شیکردنەوەی ئەم دیاردەیەو فۆرمەلە Formulationی دەرئەنجامەکانی بەزانست ناودەبەن. دەشێ ئەمە زانست بێ بەلأم زانستێك نىیە تایبەت بە مرۆڤ" چونکە مرۆڤی زیندوو هەرگیز لەدووجاردا یەك جۆر کاردانەوە پیشان ناداتو، لەهەر ساتێکدا کەسێکی ترە، گەرچی دەشێ مرۆڤ هەرجارەو کەسێکی تریش نەبێت بەلأم لانی کەم هیچکاتێك کاردانەوەکانی وەکو یەك نین. هیراکلیتس دەڵێت ((ناتوانیت دووجار لەئاوی رووبارێکدا مەلە بکەیت.)) لەبەر ئەوەی رووبارەکە بەردەوام ئاوی لێ دەڕوات. دەتوانین بڵێین کە سایکۆلۆژیای رەفتار زانستێکە بەلأم تایبەت نىیە بە مرۆڤ، بەڵکو زانستی مرۆڤی لەخۆ بێگانە (نامۆ)یە کە بەچەند شێوازێك نامۆ کراوەو لەڕێی لێکۆڵەرەوانی نامۆشەوە رێنومایی‌و رابەری دەکرێ. دەشێ ئەو زانستە تیشك بخاتە سەر بەشێك لە لایەنەکانی‌سروشتی مرۆیی، بەلأم ناتوانێ مەسەلە ژیانی‌و بەتایبەتی مرۆییەکانی بەشەرمان بۆ روون بکاتەوە.

نموونەیەك دەهێنمەوە تا جیاوازیی نێوان کارایی‌و کارلێکراویمان لا روون بێتەوە. نموونەیەکە کە پەیوەندیەکی گرنگی لەگەڵ سایکۆلۆژیای پیشەسازیی ئەمریکادا هەیە. کۆمپانیای وێسترن ئەلەکتریك داوای لە پرۆفیسۆر ئالتون مایۆ کرد رێگە چارەیەك بۆ زیادکردنی بەرهەمی ئافرەتە کرێکارەکان بدۆزێتەوە. ئەویش بەو گریمانەیە دەستی بەکارەکەی کرد کە ئەگەر بێتوو دە دەقیقە پێش نیوەڕۆو دە دەقیقە پاش نیوەڕۆ پشوویان پێ بدرێ‌و لەو پشووەدا چا یان قاوەیان بدرێتێ ئەوا بەرهەمی کارەکەیان زیاتر دەبێ. ئیشی ئەم ئافرەتە کرێکارانە ئامادەکردنی کلافەی سیم بوو (کەپێویستی بەشارەزایی‌و هەوڵێکی زۆر نەبوو)، تابڵێی کارێکی ناکارایانەیەو تەوەزەلی هێنبوو. ئالتۆن مایۆ مەبەستی خۆی بۆ کرێکارەکان روون کردەوەو پاش نیوەڕۆ دە دەقیقە پشووی دانێ تا ئاوو قاوە بخۆنەوە. راستەوخۆ رێژەی بەرهەمەکە زیادی کرد. بێگومان هەموویان لەئەنجامی پۆزەتیڤانەی ئەو داهێنانە شادمان بوون. ئینجا مایۆ پێش نیوەڕوانیش پشووی دانێ‌و هەمدیسان بەرهەمەکە زیاتر بوو. چەند

هەلومەرجەکانی کار باشتر دەبوو ڕێژەی بەرهەمیش بەرزتر دەبۆوەو وادەهاتە بەرچاو کە تیۆریەکەی مایۆ تەواو کاریگەرو سوودمەند بووە.

هەر پرۆفیسۆرێکی ئاسایی تر بووایە دوای بینینی ئەنجامی پۆزەتیڤانەی بیرۆکەکەی کۆتایی بە تاقیکردنەوەکەی دەهێناو ئامۆژگاریی کۆمپانیاکەی دەکرد کە بەرامبەر زۆرکردنی بەرهەمەکە چاو لەو بیست دەقیقە پشووە بپۆشن. بەڵام ئالتۆن مایۆ کەکەسێکی هۆشمەندو لێزان بوو بە تاقیکردنەوەکەیەوە نەوەستا، دەیویست بزانێ ئەگەر بێتو کاتی پشوودانەکە لابەرێتەوە چی ڕوودەدات. بەم مەبەستە پشووی پاشنیوەڕۆی لابرد، بەڵام زۆربوون لە بەرهەمدا هەروەکو خۆی مایەوە. پاشان پشووەکەی پێشنیوەڕوانیشی لابرد، بەڵام بەرهەم هەر لە زۆربووندا بوو. (گەر کەسێکی دی بووایە وای لەقەڵەم دەدا کەتاقیکردنەوەکەی بێ بەها بووە). بەڵام مایۆ سەرنجیدا کەهەمان ئەو کرێکارە ناشارەزایانە بۆ یەکەم جار خۆشەویستیان لا دروست بووە بۆ ئیشەکەیان، ئیدی کلاًفەکردن کارێکی وەرسکەر نەبوو، چونکە ئەوان لەبەرهەمهێناندا خۆیان بەبەشدار دەزانیو دەیانبینی کە کارەکەیان مەبەستو مانایەکی هەیەو نەك بەتەنها بەڕێوەبەرێتییە بێ ناسنامەکەیان بەڵکو تەواوی هێزە مرۆییەکان سوودی لێ دەبینن. بەگوێرەی ئەمە مایۆ ڕوونی کردەوە کە هەمان ئەو سوودو بەشدارییە بوو کە ئاستی بەرهەمی بەرزکردەوە نەك دووجار پشوودانەکە. ئەو تاقیکردنەوەیە ئیلهامبەخشی ڕێگایەکی تازەبوو بۆ سایکۆلۆژیای پیشەسازی: خۆشەویستی بۆ کار بەمەبەستی زۆرکردنی بەرهەم لە پشوودانو زیادکردنی کرێو خەڵاتی تری مادی گەلێ کاریگەرترە. دواتر لەم بارەیەوە زیاتر دەدوێم. لێرەدا بەتەنها جەخت لەسەر جیاوازیی زەقی نێوان کارایيو کارلێکراوی دەکەم.

وەختێ کرێکارانی وێسترن ئەلەکتریك کارەکەی خۆیان خۆش نەدەویست کارلێکراو (ناکارا) بوون. بەڵام کاتێ لە تاقیکردنەوەکەی کۆمپانیادا بەشدارییان کردو هەستیان بەو بەشداربوونەی خۆیان کرد کارابوونو تێڕوانینێکی تریان بۆ کارەکەی خۆیان لا دروست بوو.

نموونەیەکی تر: گەشتیارێکی گەڕۆك -بێگومان کامێرای فۆتۆگرافی‌ی پێیە- لەگەشتەکەیدا چاوی بە کەژو کێوو دەریاچەو قەڵاو ئاسەواری هونەری دەکەوێت. بەڵام ئەم دیمەنانە سەرنجی راناکێشن" چونکە ئەو زیاتر شەیدای وێنە فۆتۆگرافیەکەی ئەو دیمەنانەیە کە دەیانگرێت، بەلای ئەوەوە حەقیقەتەکە فیلمەکەیە کە خۆی دەبێتە خاوەنی نەك ئەو دیمەنانەی بەراستی بینیونی، ئەم گەشتیارە دوای ئەوەی بوو بەخاوەنی وێنەکان وا پیشانی هاوڕێکانی دەدات وەك ئەوەی خۆی ئەو دیمەنانەی دروست کردبێت، یان دەساڵ دوای ئەوە بە بینینی وێنەکاندا دێتەوە یادی کە ئەوسا لەکوێ بووە، بەڵام هەم وێنەکەو هەم بینینە نادروستەکە دیمەنە ئەسڵیەکە دەشارنەوە. زۆر لەگەشتیاران تەنانەت ئەوەندەش ئەزیەتی خۆیان نادەن کە چاوێکیش بەو دیمەنەدا بخشێنن کە دێتە بەردەمیان، بەڵکو یەکسەر دەست بۆ کامێراکەیان دەبەن، وێنەگری باش لەپێشدا لەو دیمەنە ورد دەبێتەوە کە دەیەوێ وێنەی بگرێت ئینجا دەست بۆ کامێراکەی دەبات، ئەو تەماشاکردنو وردبوونەوەیە جۆرێکە لە کارایی، جیاوازیی نێوان ئەو دووجۆر بینینە لەتاقیگەدا دیاری ناکرێ. بەڵام حاڵەتی دەموچاوی ئەو کەسەکلیلی دیاریکردنت دەداتێ: کەسێك کەشتێکی لا جوان بێ، ئەو چێژەی لەو جوانی‌یە دەیبینێ لەدەموچاویدا رەنگ دەداتەوەو پاشان بڕیار دەدات دە وێنەی بگرێ یان نەو، (کەسانێك هەن گەرچی ژمارەیان زۆر نی‌یە) بەئەنقەست وێنەی دیمەنی دڵگیر ناگرن چونکە لەو باوەڕەدان کە کامێراکە وێنەی ئەو دیمەنە لەیاددا دەشێوێنێت، وێنەکە سەبارەت بەدیمەنەکە سنوورێك بۆ یادەوەریت دادەنێ، بەڵام ئەگەر بەبێ یاریدەی وێنە دیمەنێك بهێنیتەوە یادت دەبینیت سەر لەنوێ لەزەینتدا گیان دەچێتەوە بەری ئەو دیمەنەو زیندوو دەبێتەوە. ئەو یادەوەری‌یە وەکو ئیحای وشەیەك نی‌یە کە دێتەوە یادت، تۆ دووبارە ئەو دیمەنە بۆ خۆت دەخولقێنیتەوە، ئەم جۆرە چالاکی‌یە هێزە ژیانیەکانت تازە دەکاتەوە، روونکی‌و هێزی پێ دەبەخشێت، بەپێچەوانەشەوە کارلێکراوی پەژموردە بێ رۆحتان دەکاتو تەنانەت دەشێ ببێتە هۆی وەڕسی‌و بێ تاقەتیتان.

گریمان بۆ ئاهەنگێك دەعوەت كراویتو پێشوەخت دەزانیت كە فلانەكەس قسەی چیت لەگەڵدا دەكاتو تۆش چیی وەڵام دەدەیتەوەو، ئینجا هەمدیسان ئەو چی دەڵێتەوە. لەم دیمەنە گریمانكراوەدا تۆ لە كۆڕی كۆمەڵێك ئامێردا دەبیت، هەركەسەو باوەڕو تێڕوانینی دیاریكراوی خۆی هەیەو هیچ شتێكی نوێ روونادات. دوای ئەوەی دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە هەست دەكەیت تاسەر ئێسقان بێزارو ماندوو بوویت، بەم حاڵە وەختێ لە دەعوەتەكە بوویت وا دەهاتیتە بەرچاو كە چالاكو زیتیت، خەریكی گاڵتەكردن بوویت، یان تەنانەت دەخرۆشایت، بەڵام تەواوی ئەو قسەو باسو گاڵتانەت لەجۆری ناكارایی (كارلێكراوی) بووە.

تۆو هاوڕێكانت هیچتان نەكردووە ئەوە نەبێ یادگارەكانی رابوردووتان هێناوەتەوە یادی خۆتانو باستان كردوون، دەڵێی بۆ چەندەهەمین جارە فایلێكی تۆزلێ نیشتوو هەڵدەدەنەوە. شتێكی تازە نەهاتۆتە ئاراوەو بێزاری بەسەرتاندا زاڵبوو.

لەكەلتووری ئەمڕۆدا خەڵكی نایانەوێ دان بەوەدا بنێن كە بێزاری چ بەڵایەكە -یان لەوانەیە هەر لێی بێ ئاگا بن، كەسێك بهێننە بەرچاوتان كە لەگۆشەگیریەكی تەواودایە، یان نازانێ چی بكاتو خۆی بەچیەوە خەریك بكات. ئەگەر ئەم كەسە توانای ئەوەی نەبێ هێزە خودیەكانی خۆی لە چالاكیەكی ژیانیدا بخاتەگەڕو شتێك بخولقێنێت، یان هێزی فیكریی خۆی بەكاربەرێت. بێزارییەك بەسەر بیروزەینیدا زاڵ دەبێت كەوەسف ناكرێ. بێزاری یەكێكە لەخراپترین جۆرەكانی ئەشكەنجە. بێزاری دیاردەیەكی نوێیە كە زۆر بەخێرایی تەشەنە دەكات. كەسێك بێزاری بەسەریدا زاڵ بوو بێتو لەبەرامبەریدا نەتوانێ بەرگری بكات بەخەستی دووچاری دڵتەنگیو مەلوولی (كێبە) دەبێت. لەوانەیە بپرسن بۆچی زۆربەی خەڵكی پەی بەمەترسیی ئەم نەخۆشیە نابەنو نازانن ئازارو زیانی بۆ ئێمە چەندە؟ بەڕای من وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر ئاسانە. ئەمڕۆ جۆرو ژمارەی بەرهەمەكان بەڕادەیەك زیادی كردووە كە خەڵكی دەیانەوێ بەكڕینی ئەوانە بێزارییەكەیان بڕەوێننەوە. لەوانەیە مرۆڤ بتوانێبەهۆی خواردنەوەی دەرمانێكی

ئارامبەخش، یان مەی خواردنەوەو بەشداریکردن لە كۆڕو ئاهەنگ وبینین‌و خوێندنەوەی شتی پڕوپووچو بێهودەو دواجاریش دەستدانە رابواردنی سێکسی‌یەوە بۆ ماوەیەکی کەمو بەشێوەیەکی کاتی ئەو بێزاری‌یەی خۆی بشارێتەوە، بەڵام هەموو ئەمانە بۆ هەڵاتنە لە دان نان بە بێزاری‌دا، نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە تەنانەت لەکاتی بینینی فیلمێکدا، یان هەر شتێکی دی کە مرۆڤ بەمەبەستی لەناوبردنی بێزاری‌پەنای بۆ دەبات" ئەو بیرکردنەوانە دەسبەرداری مرۆڤ نابن، ئەوەشت لەیاد نەچێت ئەو ((خوماری))ەی لەئەنجامی پەنابردنە بەر یەکێك لەو هۆیانەوە بەدەستی دەهێنیت هەر خۆی دەبێتە هۆی دڵتەنگی‌و بێزاری، یەکێك لە تایبەتمەندی‌یەکانی تری کەلتووری ئێستا ئەوەیە زۆر هەوڵو تەقەللا ئەدەین تا ((کاتێکی ئازاد)) بەدەست بهێنین" کەچی کاتێ بەدەستی دەهێنین بەفیڕۆی ئەدەین. چونکە ڕێگایەکی دی بۆ بەسەربردنی ئەوکاتە شك نابەین.

## - پێداویستیە دروستکراوەکان

باوەڕی باو - نەك تەنها لەناو خەڵکی عەوامدا بەڵکو لەناو زانایانیشدا - دەڵێت کە مرۆڤ ئامێرێکە بە گوێرەی ئەرکی زانراو و دیاریکراوی فسیۆلۆژی کار دەکات. برسی دەبێت، تینووی دەبێت، پێویستی بە خەو هەیە، پێداویستی‌ی سێکسی‌ی هەیە و هتد... ئەو پێداویستیە فسیۆلۆژی‌و بایۆلۆژیانە دەبێ تێر بکرێن دەنا مرۆڤ دوچاری نیورۆسیس (العصاب-Neurosis ) دەبێ، یان ئەگەر خۆراك نەخوات دەمرێ. بەڵام دوای ئەوەی ئەو پێداویستیانە دابین کران ئیدی کێشەیەك لە گۆڕێ نابێ. بەڵام ئەمە باوەڕێکی هەڵەیە. چونکە هەمیشە دەشێ مرۆڤ دوای تێرکردنی تەواوی ئەو پێداویستیە فسیۆلۆژییانەش هەر بەدبەخت بێ و هەست بە ئارامی نەکات" یان لە ڕووی دەروونیەوە تەواو نەخۆش بێت گەرچی تەواوی ئەو خواستانەشی بەدی هاتبێت. کەسێکی لەم جۆرە ئەنگێزەیەکی ڕۆحی شك نابات تا کارا (چالاك) بێت.

بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەتە چەند نموونەیەك دەهێنمەوە. لەم ساڵانەی دواییدا بە مەبەستی تاقیکردنەوە چەند کەسێکیان لە ئەنگێزە (مێیر) دوورخستۆتەوەو لە شوێنێکی بچووکدا دایانناون کە گەرماو رووناکیەکی نەگۆڕی هەبووە. لە دەلاقەیەکەوە خۆراکیان داونەتێ، بە بێ ئەوەی بزانن کێ خۆراکیان ئەداتێ هەموو پێداویستسیەکانیان تێر دەکرێ بەلاّم هیچ ئەنگێزەیەکیش لە ئارادا نی‌یە. دۆخیان لە دۆخی کۆرپەلەی ناو ڕەحمی دایك دەچێت. دوای چەند رۆژێك دەبینین نیشانەی نەخۆشی بە تایبەتیش نەخۆشی‌ی شیزۆفرینیا لێیان دیاری داوە. گەرچی پێداویستیە جەستەییەکانیان دابین کراوە بەلاّم باری دەروونییان لە ناهاوسەنگیەکی سایکۆلۆژیدایەو دەشێ بەرەو نەخۆشیی رۆحییان بەرێت. ئەوەی بەلای کۆرپەلەوە ئاساییە (گەرچی کۆرپەلە بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی خراونەتە بەر تاقیکردنەوەکە بە تەواوەتی بێ ئەنگێزە نی‌یە) لای کەسانی گەورە دەبێتە مایەی نەخۆشی.

لە تاقیکردنەوەیەکی تردا نەیانهێشت هەندێ کەس خەون ببینن. ئەمە دەکرێ، چونکە وەکو دەزانین کە یەکێك خەون دەبینێ چاوی زۆر بە خێرایی دەجووڵێتەوە. ئەو کەسەی کە تاقیکردنەوەکە ئەنجام دەدات گەر بێتو لەو کاتەدا کەسەکە لە خەو خەبەر بکاتەوە دەبێتە هۆی ئەوەی خەون نەبینێ. وەك دەرکەوتووە ئەمەش دەبێتە مایەی دەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشی لە مرۆڤدا، ئەم تاقیکردنەوەیە دەیسەلمێنێت کە خەون پێداویستیەکی رۆحی‌یە. ئێمە تەنانەت لە خەویشدا لە رووی زەیدی‌و دەروونی‌یەوە کاراین و لە حاڵەتێکدا ڕێ لەو کاراییەمان بگیرێ تووشی نەخۆشی دەبین.

هارلۆ کە دەروونناسێکی گیانەوەرانە لە ڕێی تاقیکردنەوەیەکەوە کە لەسەر کۆمەڵێك مەیمون ئەنجامی دا سەرنجی دا کە ئەو گیانەوەرانە دەتوانن دە سەعاتی ڕێك لەسەر کارێکی ئاڵۆز بەردەوام بن. ئەم مەیمونانە لێبڕاوانە کاری خۆیان دەکردو لە ئەنجامی کارەکەشیاندا بەسەبر بوون. پاداشت یان سزا لە گۆڕێ نەبوو، چونکە هارلۆ میکانیزمی بزواندن – کاردانەوەشی پەیڕەوی نەدەکرد،

دیارە كە مەیمونەكان بە خۆشەویستیەوە كارەكەیان ئەنجام داوە. گیانەوەرانیش، بە تایبەتی مەیمون، دەتوانن كارێكیان خۆش بوێت و مەرج نیيە بە تەنها لەڕێی خۆراكەوە (خەلاَت یان تەمێ) بوروژێنرێن.

سەر لە نوێ نموونەیەكی تر دەهێنمەوە. نزیكەی ۳۰,۰۰۰ سی هەزار ساڵ دەبێ كە مرۆڤ هونەری خولقاندووە. بەلاَم ئێمە لەو باوەڕەوەی كە ئاسەواری هونەریی كۆن ئامانجیان سیحرو جادوو بووە زۆر بایەخی پێ نادەین.

سەرنجی جوانیی بێ هاوتای ئەو گیانەوەرانە بدەن كە لە سەر دیواری ئەشكەوتەكان كراون. ڕێی تێ دەچێت كە ئەنگێزەی ئەو نیگارە هونەرییانە سەركەوتنیان بووبێت لە ڕاووشكاردا. بەلاَم جوانیی ئەو وێنانە نیشانەی چێژو خۆشەویستیی نیگار كێشەكان بووە بۆ جوانی. بە واتایەكی دی خەڵكانێك مەیل و ئارەزوویان بالاَترە لە تەنها ڕازاندنەوەو جوانكردنی ئامرازەكانی ئاشپەزخانە (مەتبەخ)كەیان. دەیانەوێ لەڕێی خولقاندندا كارا بن. دەیانەوێ شێوە بەشتەكان بدەن و هێزە پەنهانەكانی ناوەوەیان بخەنە گەڕ.

كارل بوهلەری دەروونناسی ئەڵمانی زاراوەی ((شەوقی كار)) elight of Function ی بەكارهێنا تا خۆشی و چێژی كاركردن فێری خەڵكی بكات. مرۆڤ كە چێژ لە كاركردن وەردەگرێ لەبەر ئەوە نیيە كە پێداویستیەكانی پێ دابین دەكات، بەڵكو لەبەر ئەوەی كەلە ئەنجامی ئەو كارەدا شتێك دروست دەكات و تواناكانی خۆی دەخاتە گەڕ. هەڵبەتە ئەمە لە فێركردندا ڕۆڵێكی گرنگی هەیە. خانمێكی مامۆستای ناسراوی ئیتالیایی كە ناوی ماریا مۆنتسۆرییە سەرنجی دا كە دەكرێ بە شێوازی كۆنی بەشەوق خستن و ئاگاداركردنەوە منالاَن پەروەردە بكرێن بەلاَم ناكرێ فێربكرێن. لێكۆڵینەوە زۆرەكان سەلماندوویانە كە خەڵكی ئەو شتانە باشتر فێردەبن كە قەناعەت پێكەرو ڕەزامەندی بەخشن.

من خۆم بڕوام وایە كە مرۆڤ كاتێ خۆیەتی كە هێزەكانی ناوەوەی خۆی بخاتە كارو، ئەگەر ژیانیشی لە (هەبوون) و بەرخۆری دا بەسەر بەرێت نەك لە (بوون)دا" ئەوا بەرەو هەڵدێر دەڕوات، دەبێ بە (شت) و تەمەنێكی پڕ لە ئازار و خاڵی لە

سەفاو میهرەبانی بەسەردەبات. شادمانیی راستەقینەش واتە پەروەردەکردن و نەکاربردنی هێزە مرۆییەکان. نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە خستنەگەڕی زەین و فیکر دەبێتە هۆی گەشەکردنی خانەکانی مێشك. ئەمە حەقیقەتێکە کە بە چاو بینراوەو بەڵگە فسیۆلۆژیەکان سەلماندوویانە. دەتوانرێ گەشەی مێشك بە کێشیدا بزانرێ، هەرچۆن گەشەو گەورەبوونی ماسولکەکان لە ئەنجامی کارو وەرزشەوە بە چاو دەبینین. ئەگەر ماسولکەکانی خۆمان ناچار بکەین کاری زیاتر لە کاری ئاسایی خۆیان ئەنجام بدەن لە هەمان قۆناغی گەشەدا دەمێننەوە کە پێی گەیشتوون. ئێستاش دەمەوێ لە رۆڵی چەند فاکتەرێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە فرەیی‌و خۆشگوزەرانی‌دا بکۆڵمەوە. لە مێژووی بەشەردا چەند قۆناغێکی سەرەکیی جیاواز هەن. قۆناغی یەکەم گۆڕانی مەیموونی بێ کلك بوو بۆ مرۆڤ کە لە قۆناغەکانی دی گەلێ درێژتر بوو: سەدان هەزار ساڵی خایاند. ئەم گۆڕانە کات و ساتێکی دیاریکراوی نەبوون، بەڵکو پرۆسەیەکی درێژخایەن بوو کە تیایدا فاکتەرە چەندێتیەکان وردە وردە گۆڕان بۆ فاکتەری چۆنێتی.

ئەم پرۆسەیە کە سەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤ بوو نزیکەی ٦٠,٠٠٠ شەست هەزار ساڵ لەمەوبەر رووی‌داوە، مرۆڤی بیرمەند Homo Sapiens یش واتە ئەو بوونەوەرەی رێك وەك ئێمە بوو ٤٠,٠٠٠ چل هەزار ساڵ لەمەوبەر پەیدا بوو. بەم پێیەش ماوەیەکی کەم بەسەر سەرەتای دروست بوونی ئێمەدا تێپەڕیوە.سەری دێڕ جیاوازی نێوان مرۆڤ و گیانەوەر چی‌یە؟ هەڵبەتە ناکرێ باری ئێستای مرۆڤ بخرێتە چوارچێوەی ئەم جیاوازییانەوە. چونکە مەیمونی بێ کلك بە ماوەیەکی زۆر بەر لە گەشەکردنی مێشکی لەسەر دوو پێی دەڕۆیشت و دەوەستا. ناکرێ بڵێین بەکارهێنانی ئامرازیش شتێکە تایبەت بووە بە مرۆڤ. ئەی هەست؟ نەخێر. چونکە گیانەوەرانیش هەستیان هەیەو جیاوازیی نێوان شتەکان دەرك پێ‌دەکەن، بەڵام مرۆڤی بیرمەند هەستێکی تەواو جیاوازی هەیە: هوشیاری بە خودی خۆی. دەزانێ کە هەیەو بوونەوەرێکی دانسقەیە، بوونەوەرێکی جیاواز لە سروشت و لە هاوجۆرەکانی. ئەو خۆی دەخاتە بەر لێکۆڵینەوە، دەزانێ کە بیر دەکاتەوە و

هەست دەكات. ئەوەنـدەی ئێمـە بـزانین ئـەم تایبەتمەندیانـە لـە گیانـدارانی تـردا نیـیـە. هـەمان ئـەم تایبەتمەندێتیانەشـە جـۆری بەشـەریی كـردووە بـە مـرۆڤ. لـەو ساتەوەی كە مرۆڤ، واتە ئەو بوونەوەرەی كە ئێمە مرۆڤی كامڵمان ناوناوە" هاتۆتـە نێو دونیای بوونەوە نزیكـەی ٣٠,٠٠٠ سـی هـەزار ساڵ لە هەلومـەرجێكی تاقـەت پڕووكێنـدا ژیـاوە. ژیـانی بـە ڕووشـكارو كۆكردنـەوەی گـژوگیا دابـین دەكـرد كـە دەیتـوانی بیخـوات بـەڵام نەیـدەتوانی بیڕوێنێت. هەمیشـە هـەژارو موحتـاج بـووە. بـەڵام ئـەو شۆڕشـەی كـە ئێمـە ناومـان نـاوە چـاخی گـۆڕانی بـەردینی نـوێ نزیكـەی١٠,٠٠٠ دە هـەزار سـاڵ لەمەوبـەر ڕوویـدا. تیایـدا مـرۆڤ دەسـتی بـە بەرهـەمهێنان و دۆزینـەوەی كەرەسـەی مەسـرەفیی خـۆی كـرد. ئیـدی بـە تـەنها پشـتی بـە ڕاوو شـكارو پەیـداكردنی خـۆراك نەدەبەسـت، بـەڵكو خـۆی ببـووە جووتیـارو ئاژەڵـدار. مـرۆڤ بەهۆی دووربینیو هـۆش و لێزانینـی خۆیـەوە توانیی زیاد لە پێویستی خۆی بەرهەم بهێنێت.

ئەمڕۆكـە گاسـنی مرۆڤـی سـەرەتاییمان بەشـتێكی مناڵانـەو تەنانـەت پێكـەنین هێنەر دێتە بەرچاو. بەڵام هەر ئەو گاسنە بوو مرۆڤی لەوابەستەیی بە سروشتەوە ئازادكردو، بەمجۆرە دەستی بەسوود وەرگرتن لە مێشك و توانـای خـەیاڵ و هێـزی خۆی كرد تا بتوانێ بەسەر سروشتدا زاڵ ببێو ژینگەی خـۆی گونجـاوترو لـەبارتر بكـات. ئیـدی مـرۆڤ نەخشـەی دادەنـا، بیری لـە ئاینـدە دەكـردەوەو، بۆ یەكـەم جـار خۆشـگوزەرانیەكی نیسـبیی بەدەسـت هێنـا، مرۆڤـی سـەرەتایی هـەرزوو دەسـبەرداری شـێوازە سـەرەتاییەكانی كشـتوكاڵ و ئاژەڵـداری بـوو. كـەلتووری داهێنـا، شـاری دامەزرانـد و چـاخێكی دی هاتـە ئـاراوە، چـاخێك كـە تیایـدا خۆشگوزەرانیەكی نیسبی پەیدا بوو. مەبەستیشم لـە (خۆشگوزەرانی نیسبی) بارودۆخێكە كە تێیدا هـەژاریو زەبوونی كزبـوو بـوو. بـەڵام ئـەم خۆشـگوزەرانیە هـەمووی نەدەگرتـەوە، كەمایەتیـەك كـە جڵـەوی كۆمـەڵگای لـە دەستدا بوو ڕۆژ بـە ڕۆژ دەسەڵاتی پەیدا دەكرد باشترین شتی بەخۆی ڕەوا دەبینیو بەشـی زۆربـەش پاشماوەی سەر سفرەی ئەو چینە بوو. خوانی پڕ بەرەكەت بۆ هـەموو واڵانـەبوو و

هەموو خۆشگوزەران نەبوون، بەم پێیە دەتوانین بڵێین کە خۆشگوزەرانیی نیسبی (یان هەژاریی نیسبی) هەر لە سەرەتای چاخی بەردینی نوێوە هەبووەو ئێستاش تا ڕادەیەك هەر ماوە.

خۆشگوزەرانیی نیسبی شمشێرێکی دوو دەمە. لە سەرێکەوە خەڵکی توانییان کەلتوور دابمەزرێنن، بینا بکەن، وڵات پێك بهێنن و فەیلەسوفان لە نیگەرانیی گوزەران خاترجەم بکەن. بەڵام لە سەرێکی ترەوە بووە هۆی چەوساندنەوەی زۆربە لەلایەن کەمایەتییەوە. بێ ئەو زۆربەیەش ئابووری گەشەی نەدەسەند.

بە پێچەوانەی لافی هەندێ کەسەوە ئەنگێزەی شەڕ ڕیشەی لە غەریزەی مرۆڤدا نییەو، مەیلێکی سروشتی بۆ وێرانکاری لە مرۆڤدا نییە. سەرەتای سەرهەڵدانی جەنگ لە قۆناغی بەردینی نوێوە دەست پێدەکات ئەو دەمە شتومەك و کاڵای گرانبەها هەبوو بۆ دزی. ژیانی کۆمەڵایەتی بە جۆرێك بوو کە خەڵکی شەڕیان هەڵدەگیرساندو هێرشیان دەکردە سەر ئەو کەسانەی کەرەسەو کاڵایان هەبوو و تاڵانیان دەکرد. ئێمە عادەتەن هۆیەکانی جەنگ ئاڵۆز دەکەین. دەڵێین:((کەوتبووینە بەر هەڕەشەو دەسدرێژی.)) و بەم قسەیە بیانوو بۆ جەنگ دەهێنینەوە. بەڵام ئەفسوس کە ئەنگێزە ڕاستەقینەکانی ئاشکرایە چین.

کەواتە وەك دەبینین خۆشگوزەرانیی نیسبی کە دەسکەوتی چاخی بەردینی نوێیە" لەسەرێکەوە بووەتە مایەی پەیدابوون و گەشەکردنی کەلتوورو ژیارو لەسەرێکی تریشەوە بووەتە مایەی شەڕو چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە. لەو ڕۆژگارەوە تا ئێستا مرۆڤایەتی لە باخچەی ئاژەڵاندا دەژی. لەم ڕووەوە دەکرێ بەراورد بکەین لە نێوان سایکۆلۆژیا کە پشت بە بینین و تۆژینەوە لەسەر مرۆڤ دەبەستێ لەگەڵ سایکۆلۆژیای ئاژەڵان لە ناو باخچەی ئاژەڵاندا – نەك لە سروشتدا–. بۆ دەروونناسان دەرکەوتووە کە ڕەفتاری گیانەوەران لە باخچەی ئاژەڵاندا زۆر جیاوازە لە ڕەفتاریان کاتێ بە ئازادی لە داوێنی سروشتدا دێن و دەچن. سۆلی زوکەرمان سەرنجی دا کە عەنتەرەکان (کە جۆرێکن لە مەیمون–و–

)ی باخچەی ئاژەڵانی لەندەن کە خۆیان هێمن و بێوەین لەوێ شەڕانی و دەسدرێژبکەرن. ئەو سەرەتا وایزانی کە ئەوە خەسڵەتێکی خۆیانە. بەڵام زانایانی دی کە عەنتەرەکەیان لە ناو سروشتدا و بە ئازادی خستبووە بەر تۆژینەوە، تەماشایان کردووە کە شەڕەنگێز نەبووە. ژیان لە ژینگەیەکی گەمارۆدراوداو، بێزاری‌و، سنووربەندیی ئازادی، ئەمانە هەموو ببوونە دروستبوونی خوویەکی شەڕەنگێزانە لەو گیانەوەرەدا، ئەو خووەی کە لە هەلومەرجە سروشتیەکەی ژیانیدا نەیبووە.

مەبەستم لەوەیە کە هەم مرۆڤ و هەم گیانەوەر لە هەلومەرجی ژیانی دیل و ئازاددا رەفتاریان جیاوازە، شۆڕشی مەزنی پیشەسازی گۆڕانێکی گەورەی لە باری مرۆییدا هێنایە ئاراوە، واتە ئەو گۆڕانەی کە لە ڕۆژگاری ڕێنیسانسەوە دەستی پێ کردو لەم سەدەیەدا گەیشتە لووتکە. ئەویش ئەوە بوو کە" لە ناکاودا وزەی میکانیکی جێی وزەی سروشتیی گرتەوە – ئەو وزەیەی کە لە گیانەوەرو مرۆڤەوە وەردەگیرا. مەکینە (ئامێر) هێزێك دابین دەکات کە لە رابوردوودا لە گیانەوەرانەوە بە دەست دەهات. بەمجۆرە ئومێدێکی تازەش هاتە پێشەوە: ئەگەر وزەی میکانیکی بەکاربرێ" نەك تەنها کەمینە بەڵکو هەموو سوود لە فرەیی و خۆشگوزەرانی وەردەگرن. پاش شۆڕشی یەکەم، شۆڕشێکی دیکە ڕوویدا کە ناوی لێنرا شۆڕشی پیشەسازی. لەم شۆڕشەدا ئامێر نەك هەر ناوی جێی وزەی گرتەوە بەڵکو جێی فیکری مرۆڤیشی گرتەوە. مەبەستم زانستی سیبیرنیتیك CYBERNETICS–)و ئەو ئامێرانەیە کە ئامێرەکانی ترو پرۆسەکانی بەرهەمهێنانیان کۆنترۆڵ کردووە.

سیبیرنیتیك بە جۆرێك پێشکەوتووەو بە جۆرێك تواناکانی بەرهەم هێنانی بەرزکردۆتەوە کە دەتوانین پێشبینیی ڕۆژگارێك بکەین کە شێوازە نوێیەکانی بەرهەمهێنان تیایدا خۆشگوزەرانیی رەها (موتڵەق) دابین دەکات – ئەمەش بەو مەرجەی کە ئاگری جەنگ هەڵنەگیرسێ و درم و پەتا بڵاونەبێتەوەو برسێتی نەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ژمارەی دانیشتووان. لە ڕۆژگارێکی وەهادا ئیدی

کەسێك هەژار نابێت و پێویستیی بە کەڵەکە کردنی شتی زیاد لە پێویستی خۆی نابێت، هەموو لەسای خۆشگوزەرانی و فرەییدا دەژین. ئەو دەمە ژیانی مرۆڤ بە زیادی و کەڵەکە کردن چەپەڵ نابێت، بەڵکو فرەییەکی ئیجابی دێتە گۆڕێ و خەڵکی ترسی لە برسێتیو توندوتیژی نامێنێت.

کۆمەڵگای نوێی ئێمە (ئەمریکا) شتێکی تریشی لەگەڵ خۆیدا بۆ هێناوین کە لە رابردوودا نەبووە. ئەم کۆمەڵگایە نەك هەر کاڵا بەڵکو پێداویستیش دروست دەکاو بەرهەمی دێنێ. دەپرسن چۆن؟ خەڵکی بەردەوام هەندێ پێداویستییان هەبووە" وەك ئەوەی دەبێ بخۆن و بخۆنەوە، حەز دەکەن لە خانووی جوان و حەوێنەردا بژین و هتد... بەڵام ئەگەر سەرنجێکی دەوروپشتی خۆت بدەیت بایەخ و کاریگەریی پروپاگەندەت بۆ دەردەکەوێ. وای لێهاتووە بە دەگمەن خواست و ئارەزوو لەناوەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵکو لە دەرەوە را دێتە ئاراوەو بانگەشەی بۆ دەکرێ، تەنانەت ئەو کەسەش کە سەروەت و سامانی هەیەو وەکو دەڵێن دەستی دەڕوات بەرامبەر بەم پروپاگەندە و ئاگادارییانەی بۆ کاڵای جۆراوجۆر دەکرێن خۆی بە زەبوون دێتە پێش چاو، گومانی تێدا نییە کە پیشەسازی پێداویستی دروست دەکات و پاشانیش خەریکی دابینکردنی دەبێت. لە ڕاستیدا پیشەسازی ئەگەر بیەوێ لە سیستەمی ئەمڕۆییدا بە زیندوێتی بمێنێتەوە دەبێ پێداویستیەکان دابین بکات، چونکە هێنانەکایەو دەسکەوتنی سوود مەرجی مانەوەیەتی. سیستەمی ئابووریی هەنووکەیی ئێمە لەسەر ئەوپەڕی بەرهەمهێنان و ئەوپەڕی مەسرەف (بەرخۆری–ئیستهلاك) بەندە. بنچینەی ئابووریی سەدەی نۆزدەهەم ئەوپەڕی کەم مەسرەفی بوو. باوو باپیرانمان کڕینی شتێك کە لە توانای کەسێکدا نەبووبێت بەگوناهیان لە قەڵەم داوەو وتوویانە کە دەبێتە هۆی خراپەکاری. بەڵام ئەمڕۆ ئەو گوناهە بووە بە کردەوەی بەرزو جوان و ئەگەر کەسێك پێویستیی بەو پێداویستیە دروستکراوانە نەبێت و شت بە (قسگ) نەکڕێت و تەنها بە پێداویستیە راستەقینەکانی خۆیەوە بوەستێت، بە کەسێکی نائاسایی لەقەڵەم دەدرێ. بۆ نموونە ئەگەر یەکێك تەلەفزیۆنی نەبێت بە کەسێکی

نائاسایی سەیر دەكرێو جێورێیەكی لە ناو كۆمەڵدا بۆ دانانرێ. ئاخۆ ئەم شێوازی ژیانە بۆ كوێمان دەبات؟ وەڵامەكە ئەوەیە كە زیادبوونی مەسرەف (بەرخۆری) مرۆڤێك دەهێنێتە ئاراوە كە تاقە مەسەلەیەكی پیرۆز هەیە لە ژیانیدا، كە لە ڕاستیدا دینێكی تازەیە. بەهەشتی ئەم كەسە بەهەشتی ئایینە ئاسمانیەكان نیيە كە مژدەی نازو نیعمەتەكان و پەرییەكانی ئەو دنیا بە مرۆڤ دەدات، بەڵكو سوپەرماركتێكی گەورەیە كە هەموو شتێكی تیا دەست دەكەوێ و ئەویش بە گیرفانی پڕ پارەیەوە دەتوانێ لە دراوسێكەی زیاتر شت بكڕێ. نرخی ئەو مرۆڤە لای خۆی یەكسانە بەداراییەكەیو ئەو شتانەی كە هەیەتی و مادامەكی دەیەوێ لە هەموو مرۆڤەكانی تریش باشتر بێت دەبێ زۆرترین سەروەتی هەبێ. لەم ڕوانگەیەوەو لە سیستمێكی ئابووریی لەم جۆرەدا گەرچی خەڵكێكی زۆر لە مەسرەفی خۆشیان زیاتریان هەیە كەچی وێڕای ئەوەش هەست بە نەداری دەكەن چونكە ناتوانن هاوشان لەگەڵ ئەو هەموو بەرهەمهێنراوە زۆرەدا بڕۆن و هەرچی بەرهەم هێنرا هەیانبێت. ئەم بارە ناكارایە دەبێتە مایەی زۆر بوونی مەیلی ئێرەیی و حەسوودی و چاوچنۆكیو، سەرئەنجام هەست بە لاوازیەكی دەروونی و بێ دەسەڵاتی و كەمتوانایيو خۆبەكەم زانی لەو كەسەدا دروست دەكات و مرۆڤ كەسێتیی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە كە (هەیەتی) نەك لە (بوون)یدا.

## – قەیرانی سیستمی باوكسالاری

هەروەكو بینیمان ئەگەر ژیان لەسەر ڕەوتی مەسرەف (بەرخۆری) بڕوات ئەوا دۆخێكی پڕ لە زیادی و بێزاری دەهێنێتە ئاراوە. ئەم مەسەلەیە پەیوەندیەكی نزیكی بەو قەیرانەوە هەیە كە هەموو جیهانی خۆرئاوای گرتۆتەوە، بەڵام شتێكی ئەوەندە زانراو نیيە، چونكە خەڵكی زیاتر سەرنجی نیشانەكان دەدەن نەك هۆیەكان. ئەوەی لێرەدا من مەبەستمە قەیرانی سیستمی باوكسالاری یان بونیادی كۆمەڵگای دەسەڵاتگەرایە Authoritarian Society.

ئەو بونیادە چىیە؟ لە قسەکانمدا پشت بە تیۆرەکانی گەورەترین بیرمەندی سەدەی نۆزدەهەم یۆهان- یاکوب باخ ئۆفن دەبەستم. ئەو یەکەمین کەسە کە بە شێوەیەکی سیستماتیك ئەوەی پیشانداوە کە کۆمەڵگاکان لەسەر دوو بنچینەی کۆمەڵایەتیی تەواو لەیەك جیاواز دامەزراون: دایکسالاری و باوکسالاری. بابزانین جیاوازیی نێوان ئەم دوو بنچینەیە چىیە؟

لە کۆمەڵگای باوکسالاریدا هەروەکو لە کتێبی (سەردەمی کۆن) دا هاتووەو لە رۆژگاری رۆمیەکاندا باوبووەو ئێستاش هەرباوە، باوك خاوەن و جڵەو لە دەستی خێزانە. لێرەدا وشەی (خاوەن) هەمان مانای زمانەوانیی خۆی هەیە، چونکە لە یاسا سەرەتاییەکانی باوکسالاریدا ژنان و منداڵانیش وەکو کۆیلەو مەڕوماڵات بەشێکن لە موڵك و دارایی شەخسیی ئەو کەسە. باوك هەرچییەکی بویستایە دەیتوانی بەرامبەر بەوان بیکات. ئێستا چونکە بیر لە لاوان دەکەینەوە وادەزانین لە چاو ئەو رۆژگارە کۆنەدا پێشکەوتنێکی زۆرمان بەدەست هێناوە. بەڵام نابێ ئەو حەقیقەتە فەرامۆش بکەین کە لە ٤٠٠٠ چوار هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا بنچینەی باوکسالاری بەردەوام لە جیهانی رۆژئاوادا باڵادەست بووە. لە کۆمەڵگای دایکسالاریدا بارەکە تەواو پێچەوانەیە. بەرێزترین کەس کەسەرپەرشتیاری بێ سێو دووی خێزانەو تەنانەت لە خەویشدا نازناوی ((فەرمانڕەوا))ی بەسەردا دانەبڕاوە، دایکە: سیمای دایکانە. لە نێوان خۆشەویستیی باوکانەو خۆشەویستیی دایکانەداجیاوازیەکی زۆر هەیە. ئەم جیاوازیەش گرنگیەکی تایبەتیی هەیە. خۆشەویستیی باوکانە بەپێی سروشتی خۆی خۆشەویستیەکی مەرجدارە. رۆڵەکان لەرێی بەجێهێنانی کۆمەڵێك ئەرکەوە دەتوانن بە دەستی بهێنن. هەڵبەتە نابێ لێرەدا بە خراپ لێم حاڵیبن، من مەبەستم فلان یا فیسار باوك نىیە، بەڵکو خۆشەویستیی باوکانەی رووت (بەمانا تەجریدیەکەی -و-) بابەتی منە کە ماکس ڤیبەر بە ((جۆری ئایدیالی))ی لەقەڵەم دەدا. باوك ئەو کوڕەی زیاتر خۆش دەوێ کە بە شێوەیەکی باشتر خواست و ئاواتەکانی ئەو بەدی دەهێنێت. کوڕێکی لەم چەشنە زیاتر

شیاوه بۆ ئەوەی جێگرەوەو میراتگری باوکی بێت. لە خێزانی باوکسالاریدا عادەتەن یەكێك لە كوڕەكان لە باوكیەوە نزیكترە، ئەمەش دەشێ زیاتر كوڕی گەورە بێ، هەرچەند مەرج نییە. لە كتێبی ((چاخی كۆن))دا لە زۆر شوێندا باسی ئەم جۆرە كوڕانە كراوە. ئەو كوڕە لای باوكی پایەیەكی تایبەتی هەیە چونكە ئەو (( ڕۆڵەی هەڵبژێردراو)) بووە و باوكی ڕەزامەند دەكات، چونكە لە قسەی دەرناچێت.بونیادی دایكسالاری بە پێچەوانەوەیە. دایك بەیەكسانی ڕۆڵەكانی خۆی خۆش دەوێ. ئەوانە هەموو بێ جیاوازی لە ڕەحمی ئەودا گەشەیان كردووە و پێویستییان بە سەرپەرشتیی ئەو هەیە. ئەگەر دایك بەتەنها سەرپەرشتی و دڵنەوایی ئەو ڕۆڵانە بكات كە خۆشحاڵی دەكەن و گوێڕایەڵین، ئەوا زۆربەی مناڵەكانی تر دەمرن. هەروەكو دەزانن مناڵ كەمتر بە قسەو مەیلی دایكیشی ڕەفتار دەكات. ئەگەر خۆشەویستیی دایكیش باوكانە بووایە تۆرەی بەشەر لە نێو دەچوو. دایك مناڵەكەی خۆی خۆش دەوێ لەبەر هیچ نا تەنها لەبەر ئەوەی كە مناڵێتی، هەر بۆیە لە كۆمەڵگای دایكسسالاریدا زنجیرەی پلەداری میراتی نییەو، هەر كەسێ پێویستی بە خۆشەویستیو سۆز هەبێ دەتوانێ بە دەستی بهێنێ.

ئەمەی بۆم باس كردن پوختەی بیرو ڕاكانی باخ ئۆفن بوو. لە كۆمەڵگای باوكسالاریدا بنەمای حوكمڕان: دەوڵەت و یاساو زەوتكردنە. بەڵام كۆمەڵگای دایكسالاری لەسەر بنەمای پەیوەندیی سروشتی بەندە كە مرۆڤەكان پێكەوە دەبەستێتەوە، كۆمەڵێك پەیوەندیی سروشتیو ئامادە. ئەگەر شانۆنامەی ((ئەنتیگۆنا))ی سۆفۆكلیس بخوێنیتەوە هەموو ئەم شتانەی تێدا دەبینیتەوە، بەڵكو بە شێوەیەكی كاملترو سەرنج ڕاكێشتریش. ئەم شانۆنامەیە دەربارەی ململانێی نێوان باوكسالاریو دایكسالارییە. كە یەكەمیان لە ((كریۆن))دا بەرجەستە بووەو دووەمیشیان لە(( ئەنتیگۆنا))دا. لە ڕوانگەی كریۆنەوە یاسای وڵات لەسەروو هەموو شتەكانەوەیە، هەر كەسێ سەرپێچی یاسا بكات سزای مەرگە. بەڵام ئەنتیگۆنا پەیڕەویی یاسای پەیوەندیی خوێن و ئینسانیەت و

هاوسۆزی دەکات. شانۆنامەکە بە شکستی ئەو بنەمایەیا پرنسیپە کۆتایی دێ کە ئەمڕۆ پێی دەڵێین فاشیستی. کریۆن نموونەی پێشەوایەکی فاشیستی تەواوە و بەتەنها بیر لە دەسەلات و دەولەت دەکاتەوە کە دەبێ هەموو خەڵکی بە تەواوی ملکەچی بن.

لەم بوارەدا نابێ ئایینمان لەبیر بچێتەوە. لە رۆژگاری کتێبی ((چاخی کۆن))ەوە تا ئێستا جیهانی خۆرئاوا باوکسالار بووە و خواوەند خاوەن گەورەترین دەسەلات بووە کە دەبێ فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێن. بەلام لە بودیزم (ئایینی بوودایی)دا کە یەکێکە لە ئایینە گەورەکان" سەرچاوەی دەسەلات بوونی نییە. لە کۆمەڵگای باوکسالاریدا ویژدان کە بووە بە دەسەلاتێکی دەروونی پرنسیپێکە کە رۆڵی خۆی هەیە. مەبەستی فرۆید لە ((منی بالا Super ego )) ئەمرو نەهی باوکانەی دەروونییە. واتە ئیدی پێویست ناکات باوکم پێم بڵێ ((ئەو کارە مەکە)). من باوکم خستۆتە ناو خۆمەوە.(باوکە دەروونیەکەی من) فەرمانی پێویست دەردەکات. بەلام ئەو فەرمانانە دەسەلاتی خۆیان لەسەرچاوەی دەسەلاتی باوکانەوە وەردەگرن. ئەم پێناسەیەی فرۆید بۆ ویژدان لە کۆمەڵگای باوکسالاریدا تەواو راستە. بەلام فرۆید سەبارەت بە ((خودی ویژدان خۆی)) ویژدان لە زەمینەیەکی کۆمەلایەتیدا بەهەڵەدا چووە. چونکە لە کۆمەڵگای ناباوکسالاریدا شێوەی تری ویژدان بەدی دەکرێ. نامەوێ و ناتوانم بچمە ناو وردەکاریەوە، بەلام پێویستە جەخت لەوە بکەم کە ویژدانێکی مرۆگەرا (هیومانیستیك– ئینسانی) هەیە کە تەواو پێچەوانەی ویژدانی دەسەلاتگەرایە. ریشەی ویژدانی مرۆگەرا لە بوونی مرۆڤ خۆیدایە کە رێنوێنیی دەکات بۆ کاری باش و سوودمەند لە پێناوی کامڵبوون و گەشە سەندندا. عادەتەن دەنگی ئەم ویژدانە گەلێ نەرم و هێمنە، بەلام بەهەرحاڵ دەتوانین بیخەینە گەڕ. توێژەروان لە بواری فسیۆلۆژیو دەروونناسیدا شتێکیان دۆزیوەتەوە کە دەتوانین ناوی بنێین (ویژدانی تەندروستی–Health Consceience): هەستی جیاکردنەوەی باش لە خراپ. ئەگەر خەڵکی گوێ بۆ دەنگی ناوەوەی خۆیان بدرێن ئیدی فەرمانەکانی

سەرچاوەی دەسەڵاتی دەرەوە بەجیٚناهیٚنن. دەنگی ناوەوە ئیٚمە بە ئاراستەیەکدا ریٚنمایی دەکات کە ئاراستەیەکی دروستی دەروونیو جەستەیی پیٚویستی ئۆرگانیزمەکانمانە. ئەم ویژدانە ریٚی دروستمان پیشان دەداو ناهیٚڵیٚت بە ڕیٚی چەوتدا برۆین.

لە لیٚکۆڵینەوەی قەیرانی هەنووکەیی باوکسالاریدا، یان سیستمی دەسەڵاتگەرادا، ئەبیٚ ئەوە رەچاو بکەین کە لەسەرەوە لای دواین. ئەمرۆ ئیٚمە شایەتی لیٚکترازانی بەها نەریتی (سوننەتی – تەقلیدی)ەکانی خۆراواین هەروەکو بینیشمان ئەم لیٚکترازان و قەیرانە لەسەریٚکەوە پەیوەندیی بە مەسەلەی خۆشگوزەرانیەوە هەیە. ئەمە زیاتر روون دەکەمەوە.

مرۆڤ چەند زیاتر ناچار بیٚ بەرگەی نەداری و بیٚ بەشی بگریٚت" دەبیٚ زیاتر گویٚڕایەڵ و بەجیٚهیٚنەری فەرمانەکان بیٚت تا نەتوانیٚ لە ئاست ئەو نەدارییە سەپیٚنراوە بەسەریدا سەر بەرزبکاتەوەو یاخی بیٚت. وای تیٚدەگەیەنن کە ئەو بیٚ بەشی و (حیرمانە)ی کە دوچاری بووە خواستی خواوەند، یا وڵات، یان یاسا – یا هەر سەرچاوەیەکی ترە. ئەگەر خەڵکی بیٚ سیٚو دوو گویٚ ڕایەڵ نەدەبوون ئەو دەمە هەست بە نەداریش نەدەبوو. لە هەر سیستمیٚکی کۆمەڵایەتیدا کە نەداری لە توخمە پیٚکهیٚنەرەکانیٚتی گویٚڕایەڵی شتیٚکی پیٚویستەز لە هەر کۆمەڵگایەکدا میکانیزمی دەروونیو بونیادە کۆمەڵایەتیەکان نەیانتوانیبیٚت رەگ و ڕیشەی گویٚڕایەڵیو قبوڵ کردنی نەداری لای خەڵك داکوتن" ئەوا ئەو کۆمەڵگایە نەیتوانیوە بەردەوام بیٚت. بۆچی ئیٚمە بۆ دەسەڵاتیٚك مل کەچ دەکەین کە گویٚڕایەڵیو بەرگە گرتنی نەداریی لیٚمان دەویٚت؟ یەکیٚك لە هۆیەکان ئەوەیە کە بەرامبەر بەوە هەرچیەکمان بویٚت بۆمان فەراهەم دەکریٚ.

بیٚگومان هۆیەکی تریش پەیوەندیی بە شیٚوازی نویٚی بەرهەمهیٚنانەوە هەیە. لە شۆڕشی یەکەمی پیشەسازیدا، واتە لە سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، کاتیٚ ئامیٚرە کۆنەکان لە ئارادا بوون، کریٚکار دەبووایە بە ناچاری گویٚڕایەڵ بیٚت" چونکە تاقە ڕیٚی دابینکردنی گوزەرانی خیٚزانەکەی کارەکەی

بوو. گەرچی هێشتا بەشێك لەو گوێڕایەڵیە ناچارییە هەرماوە بەڵام لە حاڵەتی گۆڕاندایەو بەرهەمهێنان لە ئامێری کۆنەوە بۆ تەکنۆلۆژیای نوێ سیبرنیتیك دەگۆڕێ. بە کەوتنەکاری تەکنۆلۆژیای نوێ پێویستی بۆ ئەو گوێڕایەڵییە نەما بۆ سەرچاوەی دەسەڵات کە لە سەدەی پێشوودا هەبوو. ئەمرۆ کاری بە کۆمەڵ دەکرێ و کرێکاران بە ئامێری وەها کاردەکەن کە خۆیان هەڵەکان راست دەکەنەوە – ئەو گوێڕایەڵیەی پێشوو شوێنی خۆی داوەتە دەست جۆرە دیسپلینێك کە پێویستیی بە گوێڕایەڵی نییە. کاری کرێکاران لەگەڵ ئامێرەکانی سیبرنیتیکدا لە یاریی شەترەنج دەچێت. گەرچی ئەم شوبهاندنە کەمێك زێدەڕۆییەکی تیایە، بەڵام هەرچۆنێك بێت تێڕوانینی ئێمە بۆ ئامێر بە ڕەگوڕیشەوە گۆڕاوە. ئەو پەیوەندیەی رابوردوو کە لە نێوان خاوەن کارو کرێکاردا هەبوو بەو جۆرە نەماوە و جۆرە هاوکاریی و وابەستەییەك جێی گرتۆتەوە. بەڵام پێویستە لێرەدا ئەوەش بڵێم کە کەشو هەوای نوێی کارکردنیش ئەوەندە ئیجابی و شاعیرانە نییە. نامەوێ لافی ئەوە لێ بدەم کە شێوازەکانی بەرهەمهێنانی نوێ کۆتایی بە نامۆبوون (بێگانە بوون) هێناوەو ئازادیی دەستەبەر کردووە، بەڵکو جەختی من لەسەر گرنگیی تێپەڕاندنی رابردووە. هۆیەکی تری قەیرانی باوکسالاری یا سیستمی دەسەڵاتگەرا شۆڕشی سیاییە. لە شۆڕشی گەورەی فەرەنسا بە دواوە زنجیرەیەك شۆڕشمان تاقیکردۆتەوە" کە هیچیان بە ئامانج نەگەیشتوون. بەڵام هەموویان سیستمی کۆنیان تێك داوەو بونیادە دەسەڵاتگەرییان خستۆتە ژێر پرسیارەوە. ئێمە شایەتی لە ناوچوونی گوێڕایەڵیی کوێرانەین کە سیستمی فیوداڵی توانای پاراستنی نەبوو. حەقیقەتی شۆڕشێك کە تا رادەیەك سەرکەوتوو بووە، شۆڕشێك کە تەواو شکستی نەهێناوە، پێشانمان دەدا کە یاخیبوون و ملکەچ نەکردن لە توانایدایە سەرکەوتن بەدەست بهێنێ.

لەدەستووری دەسەڵاتگەرادا تەنها گوناهێك هەیە کە ئەویش گوێڕایەڵی نەکردنەو، تەنها یەك کردەوەی بەرزو باشیش هەیە کە: گوێڕایەڵیو ئەنجامدانی فەرمانە. هەڵبەتە هیچ کەسێك بێ هەست بە بێگاری گوێڕایەڵ نابێت – مەگەر لە

کۆمەڵگا دواکەوتووەکاندا – بەڵام لە ڕاستیدا سیستمی فێرکردن و پەروەردەی ئێمە (ئەمریکا) گەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت ئەوە بە گوێی خەڵکدا ئەدا کە بەجێنەهێنانی ئەرکەکان و گوێڕایەڵ نەبوون ریشەی هەموو خراپەکاریەکانە.

بۆ نموونە با بڕوانینە کتێبی ((چاخی کۆن)) ئەوەی ئادەم و حەوا کردیان خۆی لە خۆیدا کارێکی خراپ نەبوو. بە پێچەوانەوە، خواردنی میوەکە بواری زانین و هوشیاری بە باش و خراپ و کامڵبوونی جۆری بەشەری ڕەخساند. بەڵام ئەم دووانە سەرپێچییان کردو ئایینیش ئەو سەرپێچیەیەی بە گوناهی خۆڕسکی لە قەڵەم دا. ئێستا کە سیستمی باوکسالاری کەوتۆتە بەرگومان و تووشی قەیران بووەو بەرەو کەوتن دەڕوات، ئەو گوناهەش کەوتۆتە ژێر پرسیارەوە. لەلاپەڕەکانی ئایندەدا دەربارەی ئەمە دەدوێین.

هاوشان لەگەڵ باسی شۆڕشی چینی ناوەڕاست و چینی کرێکار دانابێ بزاڤی بەرگریکردن لە مافی ئافرەتان (Feminism –فیمینزم)مان لە بیر بچێت. ئەم شۆڕشە سەرباری ئەوەی ناوبەناو شێوەی هەڵچوونی بەخۆوە گرتووە بەڵام پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە، ئافرەتانیش وەکو منالان بە کالاو دارایی مێردەکانیان دەژمێردران. بەڵام ئێستا ئەو تێڕوانینە گۆڕاوە. لەوانەیە هێشتا ئافرەتان لە زۆر لەو مافانە بێبەش بن کە پیاوان هەیانەو مووچەو کرێیان لەوان کەمتر بێت. بەڵام پلەو پایەی گشتی و ئاستی هوشیارییان لەچاو رابوردوودا باشترو زیاتر بووە. هەموو نیشانەکانیش ئەوە دەسەلمێنن کە شۆڕشی ئافرەتان و منالان و لاوان بەرەو پێشەوە دەچێت و ڕۆژێك دێ مافی خۆیانی تێدا بسەنن.

ئێستا با بزانین گرنگترین هۆی قەیرانی کۆمەڵگای باوکسالاری چییە. لەم سەدەیەی ئێستاماندا خەڵکێکی زۆر، بە تایبەتیش لاوان، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە کۆمەڵگای هەنووکەیی ئێمە (ئەمریکا) بێکەڵکەو شایستەی مرۆڤ نییە. دەشێ ئێوە لەگەڵ ئەم ڕایەی مندا نەبن و بڵێن کە دەسکەوتی گەورەمان هەبووەو لە تەکنۆلۆژیاشدا گەیشتووینەتە پلەیەکی بێ وێنە. بەڵام ئەمە لایەنێکی

مەسەلەکەیە. لایەنێکی دیکەی ئەوەیە کە هەر هەمان کۆمەڵگا نەیتوانیوە پێشگیری لە هەڵگیرسانی‌ئاگری دوو جەنگی جیهانی و چەندەها جەنگی بچووك بکات. کۆمەڵگای هەنووکەیی دەستی داوەتە شتێك کە مرۆڤایەتی بەرەو خۆکوژی دەبات. هەرگیز مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژووی خۆی ئەم هەموو ئامرازی وێرانکاریەی لەبەردەستدا نەبووە. پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی ناتوانێ ئەم نارەواییە لە پێشگیریی کارەساتەکان بشارێتەوە، کۆمەڵگای هەنووکەیی سفرەیەکی رەنگینی لەبەردەمماندا ڕاخستووە" بەڵام لە کەمکردنەوەی مەترسیی فەوتانی مرۆڤایەتی‌و جیهاندا بێ دەسەڵاتەو تیاماوە. کۆمەڵگایەکی لەم جۆرە – بتەوێ و نەتەوێ– دەبێ دان بە بێدەسەڵاتیی خۆیدابنێ.ئەم بێدەسەڵاتیە لە زاڵنەبوون بەسەر لەوتانی ژینگەشدا کە ژیانی خستۆتە مەترسی‌یەوە" دەردەکەوێ. قاتوقڕی و برسێتی بۆ هیندستان و ئەفریقیاو تەواوی وڵاتانی جیهانی سێیەم خۆی لە بۆسە ناوە. بەڵام کاردانەوەی ئێمە بەرامبەر ئەو هەڕەشەیە لە چەند قسەو جووڵەیەکی هیچ و بێمانا ناترازێت. بەڕادەیەك نوقمی زیادەڕۆیی بووین کە دەڵێی ئەقڵ و هۆشمان نییە تا پەی بە ئەنجامە مەترسیدارەکانی بەرین. کەواتە لاوان هەقی خۆیانە لە پشت بەستنیاندا بە ئێمە بە گومان بن. بەم پێیە بەڕای من گەرچی کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵێك دەسکەوت و سەرکەوتنی گەورەی بە چنگ هێناوە" بەڵام بێدەسەڵاتیەکەی بەرامبەر کۆمەڵێك گیروگرفت و مەترسی‌ی پەلە یەکێکە لە هۆیە سەرەکیەکانی نەمانی باوەڕ بە بونیادو کارایی سیستمی باوکسالاری یان دەسەڵاتگەرا. بەرلەوەی سەبارەت بە ئاکامەکانی ئەو قەیرانە بدوێین، ئەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە لە جیهانی خۆرئاوادا کۆمەڵگا تا سنوورێك خۆشگوزەرانە. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لە ٤٠٪ی خەڵك هەژارن. دوو چینی تیایە، چینێکی خۆشگوزەران و چینێکی هەژار. بەڵام هەژاریی ئەم چینە بە ئاسانی قبووڵ ناکرێ و پشتگیری ناکرێ, لەسەردەمی حوکمڕانی لینۆکلن دا کۆمەڵگا لە دوو چین پێکدەهات: ئازاد و کۆیلە. ئەمڕۆش ئەمریکا هەر دوو چینی هەیە: زیاد لە پێویست خۆشگوزەران و هەژار. ئەوەی

دەربارەی مرۆڤی بەرخۆر وتم بەسەر هەژاراندا ناسەپێ. گەرچی چینی هەژار بەوە دڵنەوایی خۆیان دەدەنەوە کە چینی بەرخۆر لە کەمالیاتدا نوقم بووەو ژیانێکی مشەخۆرانە دەژی. هەژاران زۆر و بۆری کۆمەڵێ نمایشن کە ساماندارن سەرگەرم دەکەن.

کەمینەکانیش هەر بەم جۆرە، بە تایبەتیش سوور پێست و رەش پێستەکانی ئەمریکا. ئەوەی سەبارەت بە سیستمی باوکسالاری و هەژاری وتم بەسەر بەشەکانی تری جیهانیشدا دەگونجێ: ٣/٢ی دانیشتوانی سەر ڕووی زەوی کە هەرگیز سیستمی کۆمەڵایەتیی باوکسالاری یان دەسەڵاتگەرایان بە خۆیانەوە نەدیوە. وەکو هندییەکان و چینیەکان و ئەفریقاییەکان و هتد..

بۆ بەرجەستەکردنی وێنەیەکی وردی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگایانی دەسەڵاتگەراو نا دەسەڵاتگەرا ئەبێ ئەو راستیەمان پێ قبوولْ بێت کە ئەگەر چی کۆمەڵگای بە ناو خۆشگوزەران ئەمڕۆ دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا هەیە. بەڵام ئەم کۆمەڵگایە نەك تەنها لەگەڵ نەریتە جیهانیەکاندا، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵێك هێزی نوێشدا لە ململانێدایە کە ئێستاو دواتریش هەستی پێدەکەین.

## - شکستی کڵێسا

گەرچی زۆربەی خەڵکی باوەڕیان بە خواوەندی یەکتا هەیەو، ژمارەی ئەو کەسانەش زۆرە کە بۆ کڵێسا دەچن و ئەوانەش کە نکووڵی لە بوونی خوا دەکەن ژمارەیان کەمە، بەڵام قەیرانی کۆمەڵگای باوکسالاری لە ئایینیشدا کاریگەرییەکی نەگەتیڤانەی جێهێشتووە. ئەوانەی سەر بە کڵێسان دەرکیان بەمەکردووەو نیگەرانیی خۆشیان لەم بارەیەوە ناشارنەوە. ئەو کاریگەرییە چەند سەدەیەك لەمەوبەر دەستی پێکردووەو تا لەم ڕۆژگارەی ئێمە نزیکتر بۆتەوە خێراییەکی زیاتری بەخۆیەوە بینیوە، لەبەرئەوەی ئایین دوو ڕۆڵی هەیە. هەرەسهێنانی پایەکانیشی دەبێتە مایەی دوو کەموکورتی، ئایینی ئێمە (جیهانی خۆرئاوا) کە لەسەر بنچینەی ئایینی جوولەکە – مەسیحی بەندە هەم بایەخی بە دیاردە

سروشتیەکان داوەو هەم خاوەن دەستووروو فەرمانی ئەخلاقیی خۆیەتی. ئەم دوو ڕۆڵە پەیوەندییان بەیەکەوە نییە، بەڵام چۆن دەتوانین بڵێین کە جیهانی سروشتی شتێکەو بنەمای ئاکاریو بەهاکانی ئێمە شتێکی ترە. ئەم دوو ڕۆڵەی ئایین لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسیان دەکەم، لە بنەڕەتدا لەیەك جیا نەبوون. سەرەتا ئەبێ ئەوە بڵێین کە باوەڕهێنان بەوەی کە ئەم دونیایە لەلایەن خواوەندێکەوە خولقێنراوە کە ئەقڵێکی گشتگیرو بە توانایەکی رەهایە بیرو باوەڕێکی مەنتیقانەیە. تۆ ئەگەر کەسێکی داروینیستیش بیت" واتە باوەڕت بەوە هەبێ کە پەرەسەندن و گۆڕانی جیهان و مرۆڤ لە ئەنجامی هەڵبژاردنی سروشتییەوە دێ" دیسان دەبینیت کە بوونی خولقێنەرێك زیاتر و باشتر لەو گریمانە ئاڵۆزە قابیلی تێگەیشتنە. لەبەرئەوەی تیۆریی پەرسەندن دەڵێ کە شێوەی ئێستای ئادەمیزاد بەرئەنجامی هەندێ بنەمایە کە سەدان ملیۆن ساڵ لەمەوبەر هاتوونەتە ئاراوەو ملکەچی یاساکانی هەڵبژاردنی سروشتی بوون. گەرچی تیۆرییەکەی داروین سەبارەت بە جیهانی سروشتی وەك تیۆریەکی ئەقڵانیو مەنتیقی دێتە بەرچاو" بەڵام بەلای زەینمانەوە نامۆیە.

ئادەمیزاد، تەنانەت ئادەمیزادی سەرەتاییش، بەردەوام پێویستی بەوە هەیە وێنەیەکی سەبارەت بە جیهان و خولقاندن لا هەبێ. یەکێك لەو بیرو باوەڕانە دەربارەی خولقان ئەوەیە کە دەڵێت ئادەمیزاد لە خوێنی کەسێکی کوژراو دروست بووە، بەڵام کەسێکی ئازا، ئافرەتان و کەسانی ترسنۆکیش لە گۆشتی هەردوو قاچی ئەو کوژراوە دروست بوون. ئەمە هەمان تیۆریەکەی ((کونراد لۆرانز Konrad Lorenz))ە کە دەڵێ ئادەمیزاد بە غەریزە مەیلی کوشتن و خوێن مژینی تیایە. هەڵبەتە ئاوارتە (استثناء) کردنی ئافرەتان لە سیفەتی خوێن مژی شتێکی باش و جوانە، بەڵام نەدەبوو ئەوانی لە ریزی ترسنۆکەکاندا دابنایە. ئەو ئەفسانەیە تا ئێستاش کاریگەریی خۆی ماوە. بەپێی پێشداوەریی کۆمەڵگای باوکسالاری، ئافرەتان خاوەن ویژدانێکی لاوازن، ترسنۆکن و کەمتر لە پیاوان واقعبینن. بەڵام ئەم بیرو باوەڕە تەواو بێ بنچینەیەو لە زۆر ڕووەوە مەسەلەکە تەواو پێچەوانە

بـووە. زۆربـەی ئافرەتـان ئـەوە دەزانـن کـە جیـاوان کـاتێ نـەخۆش دەکـەون چ سەروسـیمایەکی خـەمباریان هەیـە. پیـاوی نـەخۆش زیـاتر داوای سـۆزو بـەزەیی دەکات و کەمتر لە ئافرەتیش پشت بە خۆی دەبەستێ. بـەڵام لـە ترسـی ئاشـکرا بوونی پووچەڵی ئەو ئەفسانەیەی کە باسم کرد" هیچ کەس پرکێشی ناکات دان بەو راستیانەدا بنێت. ئـەو شـتانەی پیـاوان دەربـارەی ئافرەتـان دەیڵـێن هێنـدەی باوەڕهێنـان بـەوەی کـە سـپی پێسـتان لـە رەش پێسـتان بـەرزوباڵاترن" پڕوپووچـە. تەنانەت فرۆیدیش وتوویەتی کە ویژدانی ئافرەتـان لـە هـی پیـاوان لاوازتـرە. بـەڵام مـن ڕام وانیـیـە. ئـەو جـۆرە بـیرو ڕایانـەش دەشـوبهێتە سـەر پڕوپاگەنـدە کـردن سـەبارەت بـە لاوازی و تێکشـکاویی دوژمـن" ئـەو پڕوپاگەندانـەی کاتـێ بـڵاو دەکرێنـەوە کـە لایـەنی سـەرکەوتوو بیـەوێ بـە دڵسـاردکردنەوەو ورە ڕووخانـدنی لایەنی دۆڕاو لانی کەم وای لێ بکات نەتوانێ چیدی لەوە زیاتر سەرچڵی بکات و یاخی بێت.

ئـەوەی لەسـەرەوە وتم وەکـو پەراوێزێکـە لەسـەر یـەکێك لـە ڕۆڵـەکانی ئـایینی جیهانی سروشتی. تا دەرکـەوتنی داروین بیرو باوەڕە ئایینیـەکان پتـەوو خۆڕاگر بـوون. بـەڵام پاشـان زانسـت و لۆژیـك یاسـاکانی پەرەسـەرەندنیان هێنایـە گـۆڕێ وتمان کە باوەڕ بە خولقێنەری تاك و تەنیا بۆ زەینی مرۆڤ ئاشناترە. بەڵام زانست دوای داروین خولقاندن بە نهێنی نازانێ. ئەو بەسـەرهاتی خولقاندنەی ئادەمیزاد بەو شێوەیەی کە لە ((کتێبی پیرۆز))دا هاتووە تەنها وەکو جۆرە سیمبولێك، یان ڕەمزێـك تەماشـا دەکـرێ کـە نیشـاندەری گـەورەیی خولقێنـەرە. بـەڵام ڕاسـتیەکی زانستی نییە.

بە لە دەستدانی بایەخی وەسفی ئایینی سەبارەت بە جیهانی سروشتی، وا پێدەچێ ئایین قاچێکی خۆی لەدەست دابێ و لەسەر قاچەکەی تری کە بنچینە ئاکاریە بەڵگەنەویستەکانە، وەستا بێت:

کتێبی چاخی کۆن دەڵێ ((هاوسێکەی خۆتت خۆش بوێ)) لە کتێبی چاخی نوێشـدا هـاتووە کـە:(( بێگانـەت خـۆش بـوێ، لەگـەڵ دوژمنـەکانتا میهرەبـان بـە"

هەرچیەکت هەیە بیفرۆشەو بیدە بە هەژاران.)) کەسێك ئەم فەرمانانە بەجێ بهێنێت و پەیڕەویی بکات لە کۆمەڵگایەکی هەنووکەییدا چۆن دەتوانێ سەرکەوتووبێت؟ هەرکەسێ پەیڕەوی لە ئامۆژگاریی لەم جۆرە بکات شێتەو، بەرەو پێشەوە ناچێت و لە کاروان جێ دەمێنێ. ئێمە بنچینە ئاکاریەکانی کتێبی پیرۆزمان لا قبووڵە بەڵام جێبەجێی ناکەین. ئێمە بە دوو ڕێدا دەڕۆین: خۆشەویستیی هاوجۆرەکانی خۆمانمان پێچاکەو بە شتێکی باشی دەزانین و پێویستە لە گەڵ دراوسێکانمانا میهرەبان بین. کەچی لە هەمان کاتدا گوشارو ناچاری بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن وامان لێدەکات نەتوانین ئەو کردەوە بەرزانە بەجێبهێنین.

بەڵام بە بڕوای من لە کۆمەڵگای هەنووکەییدا دەتوانین لەیەك کاتدا هەم مەسیحی یان جوولەکەیەکی باش بین، واتە هەم ڕەگەزی مرۆڤمان خۆش بوێ و، هەم لە برسانا نەمرین. تاقە مەرجی ئەوەش بەستراوە بە ئاستی تواناو جەسارەتی پێویست بۆ خۆبەستنەوە بە حەقیقەت و ڕاستی و پێداگرتن و سووربوون لەسەر خۆشەویستی لەبری خۆبەدەستەوەدان و ملکەچ کردن لە پێناوی پلە و پایەیەکی وەزیفی یا کۆمەلایەتیدا.

ئەوە ڕاستیەکی هەمیشە جێگیرە کە ڕێبازی ئەخلاقیی مەسیحیەت یان یەهوودیەت لە گەڵ ئەوەدا نییە کە مرۆڤ بۆ ئەوەی لە کارێکیدا سەربکەوێت پێویستە پەنا بەرێتە بەر هەر وەسیلەیەك و بە هەر نرخێك بێت وەك ستەمکاری. خۆپەرستی، قوربانی نەدان و هاوخەمی نەکردن. بەڵام بە کورتی (بنچینەی ئاکاری)ی باڵادەست لە سەرمایەداریی نوێدا قاچەکەی تری ئایینیشی بڕیوە. ئایین چیدی ناتوانێ بانگەشەدەری بەهاکان بێت، چونکە خەڵکی چیدی باوەڕیان بەو ڕۆڵە نەماوە. لە کۆمەڵگای سەرمایەداریی هەنووکەییدا خواوەند ئیدی نە خولقێنەری جیهانەو نە بزوێنەری بەها ئاکاریەکانی وەك خۆشەویستیی هاوڕەگەزو زاڵبوون بەسەر ئێرەییدایە. بەڵام مرۆڤایەتی نایەوێت و ناشتوانێت بە تەواوەتی دەسبەرداری ئایین بێت. ئادەمیزاد تەنها بە پاروە نانێك ناژی" ئەبی

دیدو باوەڕێکی هەبێ تا بە ژیانێکی بالآتر لە ژیانی گیانەوەران بگات. ئەگەرچی ئادەمیزادی ئەمڕۆ بڕوای بە گەڕانەوە بۆ بتپەرستی نەماوە، بەلآم ئەم سەدەیەی ئێمە ئایینێکی نوێی لەگەڵ خۆیدا بۆ مرۆڤایەتی هێناوە کە من ناوی دەنێم ((ئایینی تەکنۆلۆژی)).

ئەم ئایینە دوو پایەی هەیە. یەکەمیان بەڵێنی (شاخێکی گەورە( لە شیرینی – The Big Rock Candy mountain)) خەونی خۆشی و لەزەتی بەردەوام و بێ سنوور. هەرساتێك پێداویستی نوێ دروست دەبێ و ئەم پرۆسەیە بێ کۆتاییە، ئادەمیزادیش وەکو منالّی شیرەخۆرەهەمیشە دەمی کردۆتەوە تا خۆراکی زیاتر بخرێتە دەمیەوە. ئەمە بەهەشتی خۆشی و لەزەتی پەتیە، بەهەشتی زیادی کە ئێمە تەمەلّ و کارلێکراو دەکات. ئامانجی تەکنۆلۆژیا بووە بە لەناوبردنی هەولّ و تەقەلای جەستەیی مرۆڤ. پایەکەی تری ئایینی تەکنۆلۆژی ئالّۆزترە. لە قۆناغی ڕێنیسانس بە دواوە مرۆڤ هەولّ و کۆششی خۆی بۆ پەی بردن بە نهێنیەکانی سروشت تەرخان کردووە. بەلآم نهێنیەکانی سروشت تا ڕادەیەك نهێنیەکانی خولقێنەرەکەیانن. چوار سەد سالّە ئادەمیزاد دەیەوێ نهێنیەکانی سروشت بدۆزێتەوەو بیانخاتە ژێر کۆنترۆلّی خۆیەوە. سەرەکیترین ئەنگێزەی ئەوە بووە لەوە تێپەڕێ کە تەنها تەماشاکارێکی ئەم سروشتە بێ و خۆی جیهانێك بخولقێنێ. پوختەی مەبەستی من ئەوەیە کە ئادەمیزاد دەیویست ببێ بە خواو کاری خوا بکات. بەڕای من جۆش و خرۆشی خەڵکی کاتێ ئاسمانگەڕان پێیان نایە سەر مانگ لە شێوەی کەش و وێردی بتپەرستەکان دەچوو. ئەو ساتە ئەم ڕووداوە ئاماژەی یەکەم هەنگاوی تێپەڕین لە سنووری بەشەریو بوون بەخوا بوو. تەنانەت ڕۆژنامە مەسیحیەکانیش نووسییان کە دوای خولقاندنی بوونەوەرەکان گەورەترین ڕووداو چوونە سەر مانگ بوو. بەلآم ئەم قسەیەی مەسیحیەکان لانی کەم نیشانەی بێ ئاگایی بووی چونکە گرنگترین ڕووداو دوای خولقاندنی جیهان ئەوە بوو کە (( ڕۆحی خواوەند چووە ناو جەستەی عیساوە Incarnation )) بەلآم تێپەڕاندنی مرۆڤ لە سنووری یاسا فیزیکیە فەرمانڕەواکانیو

زاڵبوون بەسەر هێزی ڕاکێشانداو پێ نانە ناو ڕێگایەکی بێ کۆتاییەوە ئەو ڕووداوەی لەبیر بردەوە. لەوانەیە وابزانن تا ڕادەیەك زێدە ڕۆیی دەکەم" بەڵام من هەوڵی ئەوەم داوە کە سەرنجی ئێوە بۆ ئەو مەیلانە ڕابکێشم کە شاراوەن. ئایا کاردانەوەی بەجۆش و خرۆشی خەڵك بۆ چوونە سەر مانگ لە ستایشی سەرکەوتنێکی زانستی زیاتر بوو؟ بەڵێ. چەنکە ئێمە دەسکەوتی زانستیی تری سەر سوڕهێنمان زۆرە کە خەڵکی کەمترین جۆش و خرۆشیان بەرامبەر نەبووە. کاردانەوەی خەڵکی بۆ چوونە سەرمانگ شتێکی تازە بوو. لە جۆرە بتپەرستیەکی نوێ دەچوو – ئێستا تەکنۆلۆژیا بووە بە خواوەندێکی نوێ، یان مرۆڤ خۆی خەریکە دەبێ بە خواوەندو ئاسمانگەڕانیش بوون بە پلەدارترین زانایانی ئەم ئایینەو بەمجۆرە بوو نە مایەی ستایش و تەنانەت مەراییش. بەڵام کەسیش پێ لەم ڕاستیە نانێ چونکە ئێمە (جیهانی خۆرئاوا) هەموو مەسیحی یان جوولەکەین. یان لانی کەم بێ باوەڕو خوانەناس نین" هەر لەبەرئەمە ناچارین ئەم ڕاستیە بشارینەوەو بیانوو بۆ هەر کارێکمان بهێنینەوە. دەتوانین بڵێین تەکنۆلۆژیا بووە بەو (دایە گەورە Great Mother)یەی کە هەموو ڕۆڵەکانی خۆی تێر دەکات و خواستەکانیان بەجێ دێنێ. بەڵام مەسەلەکەش بەوسادەییە نیە. چونکە زۆر شتی ئاڵۆز هەن کە ئەنگێزەکانی ژێر پەردەی ئەم ئایینە تازەیە پێکەوە دەبەستێتەوە. بوێرانە دەتوانم بڵێم کە ئەمەش بە تەنهایەك بنچینەی ئاکاریی هەیەو بەس، ئەویش ئەوەیە کە هەرشتێك لە ڕووی تەکنۆلۆژیەوە لە تواناد‌ا بێ دەبێ ئەنجام بدرێ. توانا و ئیمکانیاتی تەکنۆلۆژی بووە بە ئەرکێکی ئاکاری و تاقە سەرچاوەیەك بۆ ئاکاری ئێمە.

دۆستۆیڤسکی وتوویەتی:(( ئەگەر خودا نەبێت ئەوا هەموو شتێك ڕێ پێدراوە.)) ئەو باوەڕی وابوو کە هەموو پرنسیپە ئاکاریەکان لە باوەڕهێنان بە خواوە سەرچاوە دەگرن. بەڵام گریمان کە خەڵکی ئیدی باوەڕیان بە خواوەند نەماوەو ڕاستیەك لە بوونیدا نەماوە تا کردەوەو بیروڕاکانی ئێمە فۆرمەلە بکات" ئایا ئیتر دەبێ ئادەمیزاد بەرگی ئاکار فڕێ بدا یان بە دوای پرەنسیپی ئاکاریی

تازەدا بگەڕێ؟ ئەمە پرسیارێکی جیددیـیە. ئەگەر بەدبین بین دەشێ بڵێین کە ئەوە ئـەم بارەیـە کـە ئێسـتا تیایـداین و پرەنسـیپە ئاکاریـەکانمان ڕوو لـە فەوتانـە. جیـاوازیی لەبەرچـاو لـە نێـوان ئێسـتاو ڕابـوردوودا هەیـە. بـۆ نموونـە لـە سـاڵی ١٩١٤دا میللەتانی دونیا لە کاتی جەنگدا بە دوو یاسای نێونەتەوەییەوە پابەند بـوون کـە بریتیبـوون لـە: نابـێ خـەڵکی مـەدەنی بکـوژێ هـەروەها نابـێ کـەس ئەشکەنجە بدرێ. بەڵام ئێستا کوشتنی خەڵکی مەدەنی لە کاتی جەنگدا بووە بە شـتێکی ئاسـایی، چـونکە هـەردوو لایـەنی شـەڕکەر سـنوورێك بـۆ بـەکارهێنانی هێزەکانی خۆیان دانانێن. ئەمە سەرباری ئەوەی کە تەکنۆلۆژیاش لە کاری خۆیدا جیـاوازی ناکـات. تـەکنۆلۆژیا لـە کوشـتندا کـەس ناناسـێ بـە پەنجـەنان بـە دوگمەیەکـدا دەکـوژین و دەفـەوتێنین. لەبەرئـەوەی تەرەفەکـەی بەرامبەریشـمان نابینین هەست بە سۆزو بەزەییش ناکەین. ئەشکەنجەدانیش ئەمڕۆ بووە بە یاساو ڕێسایەك نەك کردەیەکی ئاوارتە(استپنائی). گەرچی هەموو دەیانـەوێ نکووڵی لەمـەش بکـەن. بـەڵام ئەمـە بـووە بـە ڕاسـتییەکی بەڵگەنەویسـت. بـەکارهێنانی ئەشکەنجە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری، بووە بە شتێکی گشتی و خەریکە لە هەموو شوێنێك دەبێ بە شتێکی باو.

توندوتیـژی ڕوو لـە زۆر بوونـەو، بـە پێچەوانەشـەوە مرۆڤدۆسـتی و بـەهای ئاکاری ڕوو لە نەمانـە. ئـەم دیاردەیـە گـۆڕانێکی گـەورەی لـە جیهانـدا هێناوەتـە ئاراوە. لەسەرێکی ترەوە دەبینین کە هەندێ بنـەمای ئاکاریی نـوێ خەریکە گەشـە دەکـاو بـەهێز دەبـێ و ئەمـەش بـە شـێوەیەکی زیـاترو باشـتر لەلاوانـدا هەسـتی پێدەکرێ، بۆ نموونە وەکو هەوڵ و تەقەللا بۆ ئاشتیو ئارامیی ژیـان و نـاڕەزایی بەرامبەر جەنگ و وێرانکاری، ئەمانە بە تـەنها قسـە زل ناکـەن. بەڵکو ژمارەیـەکی زۆری لاوان ئەمەکـداریو پابەنـدیی خۆیـان بەرامبـەر بـە خـەڵکانی دیـو بـەهاو ئامـانجی بـاڵاتر دەربڕیـوە. ملیۆنـەها مـرۆڤ دژی لـەناوبردنی ژیـان وەسـتاونەتەوە لەوسـەنگەرو جەنگـە نامرۆییانـەدا کـە تەنانـەت هـیچ نیشـانەیەکیان تیاێیـە. کـە شەڕی بەرگری لەخۆکردن بن دەبینین کە خەریکە مەیلێکی نوێ بۆ دژایەتیکردنی

کۆمەڵگای بەرخۆر گەشە دەسێنێ. گەرچی ئەم پرنسیپە ئاکارییە نوێیانەش لەوانەیە لە کەموکورتی خاڵی نەبن، بەڵام لە ئارەزاییاندا بەرامبەر بە بارۆدۆخی باڵادەست و قسەی پووچ و بێمانا خۆڕاگرن. نموونەی ئاکاری نوێ لە شێوەی فیداکاریو لە خۆبوردن لە قەڵەمڕەوی سیاسیشدا خۆی دەنوێنێ: لەخەباتی جیاجیادا بۆ بەدەستهێنانی ئازادیو خودموختاری.

ئەو نموونەو دیاردانە دڵخۆشکەرن و مایەی جۆش و خرۆشن و، هەر لەبەر ئەم هۆیەش من ئەو بیرو ڕایەی دۆستۆیڤسکیم سەبارەت بە پەیوەندیی پرنسیپە ئاکاریەکان بە باوەڕی ئایینیەوە پێ قبووڵ نییە. بوودیزم (ئایینی بوودایی) نموونەیەکی باشە بۆ ئەوەی کە چۆن کەلتوورەکان دەتوانن داڕێژەری کۆمەڵێك پرنسیپی ئاکاری بن بەبێ ئەوەی کە وا بەستەبن بە سەرچاوەی دەسەڵات یان باوکسالارییەوە. ریشەی ئاکار لە خودی مرۆڤ خۆیدایە. بەم مانایە ئادەمیزاد ئەگەر باوەڕی بە پرەنسیپێك ( یا بنچینەیەکی ئاکاری –و–) نەبێ ژیانی ڕابەری بکات سەراسیمەو ناشاد دەبێ. ناکرێ ئەو پرەنسیپەش بەزۆر بەسەر مرۆڤدا بسەپێنرێ" بەڵکو دەبێ لە ناخ و ناوەوەی خۆیەوە سەرهەڵبدا. لێرەدا پێویست ناکا دەربارەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم مەسەلەیە بدوێم. تەنها دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەم کە خەڵکی پێویستیەکی قووڵیان بەوە هەیە کە بە پێی هەندێ بەهای ئاکاری رەفتار بکەن. نەبوونی پرەنسیپی ئاکاری دەبێتە هۆی تێکچوونی هاوسەنگیو هاوئاهەنگیی دەروونیی ئادەمیزاد. کاتێ بە خەڵکی دەوترێ کە دەبێ بە دوا سوودی تاکە کەسیی خۆیاندا بگەڕێن و، هاوسۆزیو هاوکاری ڕێ لە پێشکەوتنیان دەگرێ" هەموو ئەمانە رووی دزێو و ناشرینی ئاکارین لە بەرگی پرەنسیپی ئاکاریدا خۆیان پیشان دەدەن. ئەگەر ئەو جۆرە دەنگانە بەرزتر ببنەوە دەبنە هۆی خامۆش بوونی ویژدانی مرۆڤدۆستانەو ئەوکات خەڵکیش دەگەنە ئەو باوەڕەی کە: ئەگەر خودا مردبێت کەواتە هەموو کارێك ڕێ پێدراوە.

**- بڵاوبوونەوەی هوشیاریی مرۆیی**

نەوەی لاوان لەم قەیرانە ئاکارییەی ئێستادا رۆڵێکی سەرەکییان هەیە. من بە تایبەتی بیرم لای لاوە رادیکالەکانە. مەبەستیشم لە ((رادیکالەکان)) کەسانێك نییە کە خۆیان بەرادیکال دەزانن و هەر جۆرە توندوتیژییەك بە بیانووی ئەوەی ((رادیکالییە)) بە ڕەوا دەزانن. جا هەیدێ ئەو لاوانەی وەك منداڵ رەفتار دەکەن" نەك وەك کەسێکی رادیکال. لینین کارەکانی ئەو جۆرە لاوانەی ناونا (نەخۆشی ی منالآنەی کۆمۆنیزم).

بەڵام لاوانێکی زۆرمان هەیە کە هەم خواستە سیاسیەکانیان رادیکالە و هەم ئاکاری دەسەڵاتگەرایانە رەت دەکەنەوە. یاخیبوونەکە بەتەنها دژی سەرچاوەی دەسەڵات نییە (تەواوی شۆڕشەکان دژ بە دیکتاتۆرانن) بەڵکو دژی بنچینەی باوکسالاری و ئەو ئاکارەشە خۆیان بە تاوانبارو سەر پێچیکەر دەزانن. کە خۆی تیادا حەشار داوە، مەبەستم ئەو ئاکارەیە کە بە جێهێنانی فەرمان بە کردەوەیەکی بەرز دەژمێرێ و بە جێ نەهێنانی بە تاوان. ئەو دیاردە گەورەیەی کە لەو ئاکارەشەوە سەر هەڵئەدا ئەوەیە کە ئەگەر خەڵکی ئەو شتانە بەجێ نەهێنن کە لێیان چاوەڕێ دەکرێ بیکەنخەڵکی لە بری ئەوەی ئەوە بکەن کە خۆیان پێیان خۆشە، ئەوەی خۆیان هەستی پێ دەکەن و ئەوەی ئینسانیەت داوایان لێ دەکات" کەچی خۆیان ئەدەنە دەست سیستم (یان رژێم)ێکی دەسەڵاتگەرا، کە ئەگەر سەرپێچیی بکەن سزایان ئەدات.

خەسڵەتی ژمارەیەکی زۆر لەلاوان و نهێنیی ئەوەی کە خۆشەویستن لای هەموو، لە نێویشیاندا من، ئەوەیە کە ئەمانە خۆیان لەو هەست کردن بە گوناهە ئازاد کردووە کە ئاکاری دەسەڵاتگەرا بەسەریاندا دەسەپێنێ. ئەمانە ئەو گوناهەیان ئەفەرۆزکردووە کە ئایینی یەهودی - مەسیحی بە درێژایی دوو هەزار ساڵی رابوردوو بەسەر مرۆڤی خۆرئاواییاندا سەپاندووەو ترسی لە ((ڕێی ڕاست)) دەرچوونیشیان لە خۆیان دوور خستۆتەوە، ئەو ترسەی کە ڕەفتاری ئێمە

دیاریدەکات و بریاری لەسەر ئەدات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بە ئاکاری ناشرین نییە، بەڵکو بەدوای کۆمەڵێك بنەمای ئاکاریی نوێدا دەگەڕێن.

پێویستە خەسڵەتێکی تری ئەم وەچەی لاوانەش بخەمە ڕوو کە ئەویش: ڕاست و دروستیو ڕاستگۆییە. ئەم لاوانە بە پێچەوانەی وەچە کۆنەکانەوە پاکانە ناکەن و بیانوو ناهێننەوەو نکوڵی لەمەسەلە واقیعیو بەڵگە نەویستەکان ناکەن. زمانی ئەم وەچەیە بەلای کەسانێکەوە کە پابەندی نەریتە کۆنەکانن نامۆیە. خاڵی سەرەکیش ئەوەیە کە ڕاستگۆییان بەجۆرێکە تەواو ناتەبایە لەگەڵ ئەو نادروستیەی لە کۆمەڵگای بۆرژوازی و باوکسالاریدا باوە" کە تیایدا دەبێ ئەو کارانەی بە گوناه دەژمێردرێن بشاردرێنەوەو بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکەین نموونەی ئەو سیفاتانە بین کە لای هەموو خەڵك پەسەندن. ناتوانین ئەوە قبووڵ بکەین کە ((ئەوەی مرۆیی نییە بۆ ئێمە نامۆیە)) چونکە ئەبێتە هۆی ئەوەی لەسەرپێچی کردن نزیك بینەوە. بەڵکو هەرئەوەندەی تێگەیشتین کە حەقیقەتی مرۆیی لەناوخۆیدا چاکەو خراپە لە خۆدەگرێ" ئەو دەمە بەپێی مانا باوەکەی دەبین بە ئادەمیزاد. لەبری ئەوەی کە لە سیفاتە سەلبیەکانی خۆمان تووڕە بین، بە بەشێك لە تایبەتمەندێتیەکانی خۆمانی دادەنێین.

سیگمۆند فرۆید ڕۆڵێکی دیاری لە ناساندنی ئەو ڕاستگۆییە نوێیەدا هەیە. لە ڕاستیدا ئەو لەم بارەیەوە رەهەندێکی تازەی دۆزیەوە. بەر لە فرۆید کاتێ خەڵکی دەیانویست لە ((نیاز پاکی))ی خۆیان دڵنیامان بکەن" بڕوامان پێدەکردن. بەڵام ئێستاو پاش ئەوەی فرۆید نەست (لاشعور)ی دۆزیەوەو بە شێوەیەکی سیستماتیکانە لێی کۆڵیەوە، چیدی بێ سێو دوو لەو نیازپاکیە دڵنیا نابین. بەڵکو دەمانەوێ بزانین ئەنگێزەی نەستیانەی چییە. هەروەها ئێستا ئەوەشمان بۆ ڕوون بووەتەوە کە جیاوازیەکی زۆر لە نێوان هۆشیاریی کەسێك بە نیاز خراپی خۆی و پاکانە کردنیدا بەمەبەستی شاردنەوەی لە خۆیو کەسانی تردا نییە. لەسەردەمی فرۆید بەدواوە ئێمە بە ناچاری ڕووبەڕووی ڕاستیەك بووینەتەوە ئەویش ئەوەیە کە: هەم لە زەینی بە ئاگاو نیازەکانی خۆمان

بەرپرسیارین و هەم لە ویژدانی بیٚ ئاگا ((نەست))مان. کردەوەکانمان نیەتمان دەسەلمێنیٚ نەك قسەکانمان. دەشیٚ ئەوەی دەیڵێین مانای نەبیٚ. بەتەنها ئەم دۆزینەوەیەی فرۆید تاقە هۆی گومانی ئێمە نیەیە لە قسەو گوتەکان. چونکە دیومانە چۆن درێویی ئاکاریو ناڕاستی ئێمەی بۆ جەنگی وەها پەلکێش کردووە کە سەدان ملیۆن کەسی تیا بۆتە قوربانی یان لە پێناوی (شانازی)دا خۆبەخشانە بەرەوپیری مەرگ چوون. هەموو ئەو زیانە مرۆییانە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ درۆو دروشمی بۆش. ئەمڕۆکە هەقمانەو هۆی تەواویشمان بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی بە ئاسانی نەکەوینە ژێر کاریگەریی قسەی کەسانی ترەوە. وشە وەکو بیروڕای بیٚ بەها وایە لە هەر شێوەو وێنەیەکدا دادەڕێژریٚ. هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی کە لاوان کەمتر دەپرسن(( دەربارەی ئەو قسەیە ڕاتان چیە؟)) بەڵکو لە جیاتی ئەوە دەپرسن(( چیتان کردووە؟ ئەنگێزەشتان بۆ کردنی ئەو شتانە چی بووە؟))

بەباوەڕی من کاریگەریی فرۆید لە هێنانی ڕەهەندی نویٚی ڕاستگۆیی بۆ ناوژیانی ئێمە، هیچی لەو ((شۆڕشە سێکسیەیە)) کەمتر نیەیە کە هەر خۆی داهێنەری بوو. لە کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمەڵگای ئێمەدا کە ئاراستەیەکی مەسرەفی (بەرخۆرانە)ی هەیە شۆڕشی سێکسی بەبیٚ فرۆیدیش هەر ڕووی دەدا. لە کاتێکا پڕوپاگەندە بۆ بەرخۆری دەکەین بە مەبەستی تێرکردنی هەر هەوەس و ئارەزوویەك" ناتوانین داوا لە خەڵکی بکەین کە بەسەر مەیلی سێکسیی خۆیاندا زاڵ بن. لە کۆمەڵگای مەسرەفیدا مەیلی سێکسیش وەکو کالأیەکی لیٚ دیٚ بۆ سەرفکردن و کۆمەڵێك پیشەسازیش هەن کە بەوەوە وابەستەن و، پارەیەکی زۆریش بۆ چاودێریی ورووژان و ڕاکێشانی سێکسی خەرج دەکریٚ. هەڵبەت ئەم بارە گۆڕانە لە چاو ڕابوردوودا بەلأم ئەمە شۆڕش نیەو ئەستەمە بشخرێتە پاڵ فرۆید. بەلأم ئەوەی کە نویٚو ئیجابیەیە ئەوەیە کە مەسەلە سێکسیەکان چیدی باری گوناە نین بەسەر شانی لاوانەوە. جیٚی خۆیەتی بەکورتی لە پەیوەندیی نێوان مەیلی سێکسی و هەست کردن بە گوناە بدویێم. ئەگەر بنەما ئاکاریەکانی دەسەلأتگەرا ئەنگێزەی سێکسی بە ((فاکتەری گوناە)) بزانیٚ مانای وایە هەر

یەکێك لە ئێمە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی گوناهین و، دەتوانین بڵێین بەوپێ یە هەر یەکێکمان لە سێ ساڵی بەدواوە بەردەوام پڕبووین لە گوناه، چونکە مرۆڤ ناتوانێ لە مەیلی سێکسی خاڵی بێت و، ئەگەر ئەو مەیلەش بە نەنگ سەیر بکرێ هەست کردن بە گوناه شتێکی حەتمی یە. ئەو تخووب دانانە بۆ مەسەلە سێکسیەکان دەبێ بە هۆی هەست کردن بە گوناه کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەستاوێژێکە بۆ دانانی بنەما ئاکاریەکانی دەسەڵاتگەرا.

وا دەهاتە بەرچاو کە وەچەی لاوان (( تاڕادەیەك وەچەی پیرانیش)) خۆیان لە هەستکردن بە گوناهی سێکسی ئازاد کردبێت، کە ئەمەش پێشکەوتنێکی کەم نیە. بەڵام ئەگەر گومانی من لەم مەسەلە بە ڕواڵەت بەڵگە نەویستە ببەخشن ئەوا دەڵێم هەرچیەك کە درەوشایەوە ئاڵتوون نیە. لە کۆمەڵگای ئێمەدا لەبەر ئەوەی کە ئاراستەیەکی بەرخۆرانەی هەیە" مەیلی سێکسیش بۆ شاردنەوەی لە دەستدانی راستگۆیی بەکار دەبرێ. نزیکبوونەوەی جەستەیی بووە بە وەسیلەیەك بۆ شاردنەوەی بێگانە (نامۆ)یی مرۆڤەکان. راستگۆیی عاتیفی و پێکەوە گونجانی رەسەنی نێوان دوو کەس ئەکرێ بە راستگۆیی جەستەییەوە ببەسترێتەوە. بەڵام ئەو دوو راستگۆییە یەکسان نین و لەیەکیش جیاوازن. لەو ساتانەدا کە راستگۆیی عاتیفی شك نابەین زۆر ڕێی تێ دەچێت راستگۆیی جەستەیی بخەینە جێ. کە لە شێوەی ئامادەگیی تەواوی رۆحی و جەستەییدا کارێکی ئاسانە.

هەروەکو وتم وەچەی لاوان سیستمی باوکسالاری و کۆمەڵگای بەرخۆر رەت دەکەنەوە. بەڵام زۆریان روویان لە جۆرێکی تری بەرخۆری کردووە کە ئەویش بەکارهێنانی مەودای سڕکەرە (المخدرات). باوك و دایك ئۆتۆمۆبیل و جلوبەرگ و زێڕو زیو دەکڕن و منداڵەکانیشیان مەودای سڕکەر. گەلێ هۆکار هەن بۆ رووکردنە مەودای سڕکەرو ئالوودە بوون (الادمان) لەسەری، کە بایەخ پێدانی شتێکی زۆر پێویستە. بەڵام بیانووی کەسی ئالوودە هەرچیەك بێت هەر بە کەسێکی بەرخۆری تەمەڵ و کارلێکراو لەقەڵەم دەدرێ. واتە ئەو شێوازەی دایکان و باوکان

گرتوویانەتە بەرو ڕۆڵەکانیان لۆمەیان دەکەن" خۆیان لە ژێر پەردەیەکی تردا بەهەمان دەردەوە دەتلێنەوە. لاوان چاوەڕێن شتێك لە دەرەوەی خۆیان وەکو: نەشئەی مەوادی سڕکەر یا لەزەتی رابواردن و کاری سێکسی و سوورو سەما خەویان لێ بخات و بێ ئاگایان بکات. ئەم جۆرە سەرگەرمییانە چالاکی نین بەڵکو رابواردن و هەرزەیین و دەبنە مایەی کارلێکراوی. مرۆڤی کارا خۆی لە بیرنا چێتەوە، هەمیشە خۆیەتیو بەردەوامیش هەر خۆی دەبێ. تا گەورەتریش بێت ئازموودەترو هوشیارتر دەبێ. بەڵام کەسی کارلێکراو هەروەکو وتم وەك منداڵێکی شیرە خۆرە وایە، هەمیشە دەمی کردۆتەوەو دەیەوێ چی لە شووشەکەدایە هەڵیقوڕێنێت، ئیتر هەرچیەکی تیا بێت. ئەوەشی کە دەیخوات نایکات بە هیچ، تێر دەبێ بەبێ ئەوەی خۆی شتێك بەرهەم بهێنێ. هیچ یەکێك لە هێزەکانی رۆڵی ذییەو دواجاریش شەکەت و خەواڵوو دەبێ. خەوەکەشی لە چەشنی سڕبوونە واتە ناخەوێ بەڵکو ئەوەندە بێزار دەبێ ئیدی تاقەتی هیچی نامێنێ. لەوانەیە هەمدیسان وابزانن کە زێدەڕۆیی دەکەم. بەڵام لێکۆڵینەوەکان گەواهیی راستیی قسەکانی من ئەدەن. بە داخەوە هۆیەکانی راگەیاندن کە پێداویستیی درۆ لە ئێمەدا دروست دەکەن هەمیشە دڵنیامان دەکەن کە سەرفکردن (بەرخۆری) نیشانەی ئاستی بەرزی کەلتوورو رۆشنبیریمانە.

ئایا ئەم کۆمەڵگا خراپە کە تووشی دەردی زیادی بووەو ناتوانین بەرهەمەکانی هەرس بکەین و هیچ نیشانەیەکی ژیانیشی تیا ذییە، لە توانامانذا هەیە بیکەین بە کۆمەڵگایەك کە فرەیی باش تیایدا باڵا دەست بێ؟ ئایا دەتوانین ئەو بەرهەمە زۆرانەی تەکنۆلۆژیا دەیخاتە بەردەستمان بە دروستی بە کاریان بهێنین؟ بەکارهێنانێك کە لە ڕاژەی ئادەمیزادا بێ و ببێتە مایەی گەشەو نەشونمای. دەتوانین بە ئەرێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە بەو مەرجەی بە خۆماندا بچینەوەو، لەوە تێبگەین کە دەبێ تەنها ئەو پێداویستیانە لای خەڵك بوروژێنین کە چالاکترو زیندووتر و ئازادتریان دەکات، بەجۆرێك ئیدی نەبنە کۆیلەی هەوەسەکانی خۆیان و یان بە تەنها سەرچاوەیەکی کاردانەوە نەبن بەرامبەر بە

ئەنگێزەکان، بەڵکو پەی بە توانا شاراوەکانی ناوناخی خۆیان بەرن و خەسڵەتە مەعنەویەکانی خۆیان و خەڵکانی تریش پاکژو دەوڵەمەند بکەن. سەرەتای هەنگاونانیش لەم ڕێیەدا بە چاوخشاندنەوە بە هەلومەرجی کارو سەعاتەکانی بێکاریدا دەست پێ دەکات. کاتەکانی بێئیشیی ئێمە لە زۆربەی جارەکاندا بریتییە لەکاتی ناکارایی و تەمەڵی: توانایەکی درۆمان بە دەست هێناوە، پەنجە بە دوگمەی تەلەفزیۆنێکدا دەنێین و جیهان دەهێنینە ژووری دانیشتنی خۆمانەوە، لە پشت سوکانی ئۆتۆمۆبێلێکەوە دادەنیشین و وا دەزانین هێزی ١٠٠ سەد ئەسپ ئاسای ماتۆڕەکەی هی خودی خۆمانە. کاتێ دەتوانین لافی ئەوە لێبدەین ((کاتی ئازاد))مان هەیە کە ئەو کاتە تەرخان بکەین بۆ ئەو پێداویستیانەی ڕیشەیان لە خودی خۆماندایەو بەرەو کارایی و چالاکی هانمان ئەدەن. لەم حاڵەتەدا کاریش جارسکەرو وەڕسی هێن نابێ. ئەبێ کاری پەسەند و سەرنجکێش و زیندوو ببێتە ئامانجی چاوپیاخشاندنەوەی هەلومەرجەکانی کار.

لێرەدا پرسیارێکی سەرەکیتر دێتە پێشەوە: ئامانجی کارکردن چییە؟ ئایا ئێمە بۆیە کار دەکەین تا بەرهەم و بەرخۆری پتر بکەین، یان مەبەست لە کارکردن بەرەو پێشەوە بردن و پەرەدان بە هۆشیاری و نەشونمای مرۆڤە؟ عادەتەن دەڵێن ناتوانین ئەم دوو ئامانجە لەیەك جیا بکەینەوە. ئەوەی بۆ پیشەسازی باش بێت بۆ خەڵکیش سوودمەندەو بە پێچەوانەشەوە ئەم قسەیە گەرچی وەك پارچە مۆسیقایەك ناسك و دڵگیرە، بەڵام لە ڕاستیدا جگە لە درۆیەك هیچی دی نییە. بە ئاسانی دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە زۆر شت هەیە کە سوود بە پیشەسازی دەگەیەنێ بەڵام بۆ خەڵك زیانمەندە. لێرەدایە کە دەکەوینە سەر دوو ڕیانێك. ئەگەر لەسەر ئەو ڕێیە بەردەوام بین کە گرتوومانەتەبەر ئەوا ئەبێ ئینسانیەت بکەینە قوربانی پێشکەوتن. بۆیە ناچارین بیر لە چارەسەرێك بکەینەوە. بە زمانی کتێبی پیرۆز ئەبێ لە نێوان خواوەندو قەیسەردا یەکێك هەڵبژێرین. گەرچی ئەمە تێڕوانینێکی زۆر دراماتیکانەیە بەڵام ئەگەر بمانەوێ ژیان بەجیددی بگرین بارەکە هەر دراماتیکانە دەکەوێتەوە. مەبەستی من وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەیە: لە نێوان مەرگ و ژیاندا

کامیان هەڵدەبژێرین؟ بێگومان ژیان، بەڵام ژیانێکی پڕ جووڵەو زیندوو. ژیان ئەبێ رۆحدارو پڕکارایی بێت. بەڵام زۆربەی خەڵکی خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن. بە جۆرێك دەژین هەر دەڵێی ژیانیان وەستاوە یان هەر دەستیان بە ژیان نەکردووە. ئەقڵ و مەنتیق دەڵێ هەرکەسێك لە چل ساڵیەوە بەرەو ژوور بەرپرسیاری باری ژیانی خۆیەتی. بەو مانایەی کە ئەو ژیانەی بەسەرمان بردووە پێمان دەڵێ کە ئایا ژیانێکی باشمان هەبووە یان ژیانێکی پڕ لە هەڵە. ناتوانین چاو لەم پرسیارە بنووقێنین یا وەڵامی نەدەینەوە کە: ئایا هەر بە ڕاستی زیندوو بووین و زیندووین؟ ئایا بۆ خۆمان دەژین، یان بە گوێرەی مەیل و خواستی کەسانی دی، منیش لەگەڵ ئەو قسەیەی مارکس و دیزرائیلی دام کە دەڵێن: خولیابوونی کەمالیات هێندەی هەژاری موسیبەتی بە دواوەیە. مەبەستیان لە کەمالیات هەمان ئەو زیادیەیە کە لێی دواین. ئەگەر بمانەوێ فرەیی و خۆشگوزەرانیی رەسەن و راستەقینەمان هەبێ دەبێ شێوازی ژیان و بیرکردنەوەی خۆمان لە رەگو ڕیشەوە بگۆڕین. بێگومان دەشزانم کە ئەمە کارێکی هێند ئاسان نییە.

من وای بۆ دەچم گۆڕان کاتێ کاریگەر دەبێ کە خەڵکی هەست بە پێداویستیەکی قووڵ بۆ ژیان بکەن و کەمتر پێویستیان بەوە بێت کە ژیانی رۆژانەیان بەسەر بەرن. کاتێ توانییان وەڵامی بێزاری بدەنەوە، وەڵامی ئەو پێداویستیانەیان بدەنەوە کە چالاکترو بە جۆشترو ئازادترو شادمانتریان دەکات. کۆمەڵێك وڵاتی زۆر بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی خەریکن نەشونما دەکەن وا دەزانن ئەگەر وەکو ئەمریکایان لێ بێت شادمان و بەختەوەر دەبن. بەڵام خەڵکی ئەمریکا خۆیان باش دەزانن کە ئەو هەموو ئامرازە مۆدێرنانە ئەوانی کردووە بە خەڵکێکی کارلێکراوو، بێ ناسنامەو ، ئامێری دەستی کەسانی دی، نەك خەڵکێکی بەختەوەر و شادمان. شتێکی رێکەوت نییە کە لاوانی یاخیی ئەو وڵاتە سەر بە چینە ناوەندو بەرزەکانن کە تیایاندا رەفاهی زیادی پتر ئاشکرایە. ئەو جۆرە رەفاهەش خەیاڵی و زەمینیەو شادمانیی دەروونیو رۆحیی لە گەڵ خۆیدا نەهێناوە. بەڕای من پابەند بوون بە بنەمایەکەوە کە بۆ فۆرمەلەی ستراتیژیی هونەری ژیان (ی

ئەمریکاییەکان) پێویستە گرنگیەکی تایبەتی هەیە. ئەگەر دوای هەندێ ئامانجی سەرشێوێنەر بکەوین و بێئاگابین لەوەی کە ئامانجە دژەکان یەکتر نەفی دەکەن" ئەوا ژیانێکی خراپمان دەبێ. لەوانەیە هەمووتان ئەو تاقیکردنەوەیەتان بیستبێت کە پاڤلۆڤ لە گەڵ سەگێکدا کردی. سەگەکە فێرکرابوو هەرکاتێ شێوەی بازنەیەکی بینی چاوەڕێی خۆراك بێت، بەڵام بە بینینی شێوەی هێلکەیی چاوەڕێ نەبێت. پاڤلۆڤ وردە وردە شێوە هێلکەییەکەی لە بازنە نزیك کردەوە، سەرئەنجام ئەو دوو شێوەیە بە ڕادەیەك دەشوبهانە سەریەك کە سەگەکە تیا دەماو لەیەکتری جیانەدەکردنەوە. لە ئەنجامی ئەو بارە گێژکەرو جیاوازەدا ئەو گیانەوەرە نەخۆش کەوت و نیشانە کلاسیکیەکانی نیورۆسیس (عصاب) ی تیا دەرکەوت. سەگەکە نیگەران و سەر لێشێواو و نائارام بووبوو.

ئادەمیزادیش ئەگەر پەیڕەویی ئامانجە سەرشێوێنەکان بکات لە ڕووی ڕۆحیەوە نەخۆش دەکەوێ، هاوسەنگی و متمانە بەخۆ بوون و توانای جیاکردنەوەی لانامێنێت. چیدی ناتوانێ چاکەی خۆی دیاری بکات. کەواتە یەکەمین کاری ئێمە دەبێ ئەوە بێت کە بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە لە خۆمان بپرسین ئەو ئامانجە ڕێونکەرانە کامانەن کە نابێ ئێمە ڕوویان تێبکەین و بۆچی ڕێونکەریشن؟ ناکۆکی نێوان ئەو ئامانجانە چ زیانێك بە ئێمە دەگەیەنێ؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە بە قسەو پروپاگەندە نادرێتەوە، چونکە قسەو پروپاگەندە جگە لەوەی دەبنە مایەی دەمارگیری لای ئادەمیزاد هیچ کاریگەرییەکی تریان نییە. بۆیە دەبێ هەر کەسەو خودی خۆی بخاتە بەر لێپرسینەوەوەو بە خۆی بڵێ:( لە چەند ڕۆژێك زیاتر میوانی ئەم جیهانە نیت! کێیت؟ و لە ڕاستیدا چیت دەوێ؟) ئەگەر خۆمان بدەینە دەست ئەو جۆرە فرەییەی کە سەرئەنجامەکەی کلۆڵیو موسیبەتە ئەوا ئەو دەوڵەمەندیە ڕۆحیە لە ناو دەبەین کە لە ناخماندا ئامادەی سەرهەڵدانە. بڕیاردانی ئێمە بۆ لایەنگیری لە فرەیی و ڕەفاهێکی باش یا خراپ کاریگەرییەکی دیاریکەری لەسەر ئایندەی ئادەمیزاد دەبێ.

# بنەماکانی شەڕەنگێزی

شتێکی زۆر سەیر نىیە کە ئەمڕۆ بایەخێکی فرە بە مەسەلەی شەڕەنگێزی یا توندو تیژی ئەدەین، لە ڕابردوودا چەندان جەنگمان بینیوەو ئێستایش لە مەترسىی جەنگ دوور نین، لە هەمان کاتدا خەڵك هەست ئەکەن لە گۆڕینی ئەم بارو دۆخەدا هیچ دەسەڵاتێکیان نىیە.

ئەبینین حکومەتەکانیان" کە تەواوی ئەقڵ و وریایی خۆیان خستۆتە گەڕ، ناتوانن ڕێتمی پێشبڕکێی خۆچەکدار کردن خاو بکەنەوە– هەر بۆیە خەڵکی لە سەرێکەوە ئەیانەوێ سەرچاوەو هۆی ئەو توندوتیژىیە بزانن، لە سەرێکی تریشەوە ئەو تێزەیان لا قبوولە کە ئەڵێت، گوایە شەڕەنگێزی بەشێکە لە سروشتی مرۆڤ خۆی" نەك شتێك بێ لە خودی مرۆڤ یان لە کۆمەڵگاوە سەرچاوە هەڵگرێت.. ئەم تیۆریەش ئەگەرێتەوە بۆ ((کۆنراد لۆرانس)).کۆنراد لە کتێبی(( شەڕەنگێزی))دا ئەڵێت کە توند وتیژی بەردەوام لە مێشکی مرۆڤ دا دروست ئەبێ

ئەم خاسیەتەش لە باوو باپیرە گیانەوەرەکانمانەوە بۆمان ماوەتەوەو، گەر دەروویەکی نەبێ کەڵەکە ئەبێت.. شەڕەنگێزی لەکاتی پێویست و گونجاودا خۆی ئەخاتە ڕوو، بەڵام ئەگەر ئەو ئەنگێزانەی ئەبنە هۆی توڕە بوون لاوازبن یان هەر لە میاندا نەبن، ئەو توندوتیژىیە کەڵەکە بووە ئەتەقێتەوە.. خەڵکی لە تواناياندا نىیە بۆ ماوەیەکی درێژ خۆیان لە مەیلی شەڕەنگێزی بپارێزن،چونکە بە ئەندازەیەك هێزی توندوتیژی کەڵەکە ئەبێت، کەپێویستی بە– خاڵی بوون – ئەبێ..

ئەکرێ لە میانی تیۆریی((هایدرۆلیك)) دوە بڕوانینە ئەم مەسەلەیە. چەند پەستان پتر بێ تەقینەوەی ئەو دەفرەی ئاوەکە یا هەڵمەکەی تێدایە نزیکتر ئەبێ.

لۆرانس ئەم تیۆرییەی لەبەسەرهاتێکی خۆشی پوورێکی خۆیەوە وەرگرتووە، ئەو ئافرەتە هەر شەش مانگ جارێك کارەکەرێکی تازەی ڕائەگرت.سەرەتای هاتنی کارەکەرەکە ئەو خانمە خۆشحاڵ ئەبوو و هیوای زۆری پێ ئەبوو، بەلاّم هەمووی دوو هەفتەی نەدەبرد ئەو جۆش و خرۆشە کپ ئەبۆوە و ڕەخنەگرتن و ناڕەزایی دەستی پێ ئەکرد، سەرەنجام دوای نزیکەی شەش مانگ" تووڕەیی خانم ئەگەیشتە ڕادەیەك کە کارەکەرەکەی ئیزن ئەدا. هەر شەش مانگ جارێك ئەم بەسەرهاتە دووبارە ئەبۆوە، لۆرانس لەم بەسەرهاتەوە ئەگاتە ئەو ئەنجامەی کە توندوتیژی وردە وردە کەڵەکە ئەبێ‌و سەرەنجام ئەتەقێتەوە...

ئەم تیۆریەی لۆرانس ڕاستی ناپێکێت.، چونکە بواری پسپۆڕیی ئەو سایکۆلۆژیای گیانەوەران بوو. هەر زانایەکی شیکاری دەروونی" بەڵکو هەر مرۆڤێکی بە سەلیقەو شارەزا لە سروشتی ئادەمیزاددا پەی بەوە ئەبات کە پوورەکەی لۆرانس ئافرەتێکی خود شەیدا(( نێرگسی))و چەوسێنەر بووەو خوازیار بووە نەك تەنها هەشت سەعات خزمەتی ئەو بکرێت" بەڵکو خۆشەویستی‌و، ئەمەگداری‌و.گوێ ڕایەڵی‌و میهرەبانی‌وشانزە سەعات لە کۆی بیست و چوار سەعاتی ئەو بۆ خۆی زەوت بکات. ئەو هەموو جارێك بەو هەستەوە پێشوازیی لە کارەکەرە تازەکەی خۆی کردووە. واتە بە میهرو خۆشەویستیەکی زۆرەوە، چونکە وایدەزانی کە دواجار ئەو کەسەی خۆی ئەیەوێ دەستی کەوتووە.بەلاّم وردە وردە بۆی دەردەکەوت کە ئەو کارەکەرەش خواستەکانی ئەو ناهێنێتە دی.ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لێی نائومێد و تووڕە تر ئەبوو، تا بەدەرکرنی کۆتایی ئەهات" بەو هیوایەی کارەکەرێکی دی کەلە ئاست خواستەکانی ئەودا بێت پەیدابکات.

ئەم خانمە لەبەرئەوەی خۆی هیچ کارێکیشی نەدەکرد" مەسەلەی گەڕان بە دوای کارەکەری گونجاودا ببووە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی، لەگەڵ دۆست و هاوسێکانی‌دا.ئەم هەڵسوکەوتانەی پووری لۆرانس هیچ پەیوەندیەکیان بە کەڵەکە بوونی شەڕەنگێزیەوە نەبووە.. بەڵکو بەر ئەنجامی‌خوو و سروشتی خۆی

بووه" دڵنیام کەسانێك کە چوونەتەساڵەوە، خەڵکانێك ئەناسن کە ڕەفتاریان لەو خانمە ئەچێت.

تیۆر شەڕەنگێزیی خودی(( ژاتی)) کە لێرەدا ناتوانین زۆر لەسەری بڕۆین، پەیوەندیی بە تیۆریی کۆنی(( غەریزەی–مەرگ))ەوە هەیە..

لەبیستەکانی ئەم سەدەیە بە دواوە(( فرۆید)) بەپێی گریمانەیەك ڕای وابوو کە لە هەموو مرۆڤێکداو لە هەموو خانەیەك و لە هەموو بوونەوەرێکی زیندوودا دوو غەریزەی سەرەکی هەیە" غەریزەی ژیان ((خۆشەویستی ژیان)) و غەریزەی مەرگ.. بەگوێرەی ئەو تیۆرییە غەریزەی مەرگ خودییە.. واتە بارو دۆخ و هێزەکانی دەرەوە کاریگەرییان لەسەر نییە. مرۆڤیش تەنها لەبەردەم هەڵبژاردنی یەکێك لەم دوو ڕێگەیە دایە:–

یا ئەوەتا هێزی مەرگ و وێرانکاری ئاراستەی خودی خۆی بکات. یان ئاراستەی خەڵکانی دی.

بەڵام ئەو زانایانەی کە ساڵانێکی زۆرە سەرگەرمی توێژینەوەن دەربارەی ئەو تیۆرییە" بەڵگەی سەلمێنەریان نەدۆزیوەتەوە. تێڕوانینی باوی پەسەند لە نێوان زانایانی سایکۆلۆژیادا ئەوەیە کە شەڕەنگێزی لەژێر کاریگەریی دەوروبەرو ژینگەی کۆمەڵایەتیدایە. یان لە میانی هۆکارو فەرهەنگەوە کە نالیزە ئەبێ. بەکورتی ئەو هۆکارانە زۆرن. بەڵام لەبەرئەو هۆیانەی پێشتر وتم تیۆریی توندو تیژیی لۆرانس لە ناو خەڵکی عەوام دا هەوادارانی زۆری هەیەو ئێمەی دوچاری ئەو وەهمە کردووە کە بەرامبەری هیچ دەستەڵاتێکمان نییە.

تیۆریی لۆرانس پەڵپ و بیانوویەکی چاکە" ئەگەر شەڕەنگێزیو مەترسییەکانی، خودی بن.کەواتە بەرامبەر سروشتی خود هیچمان پێ ناکرێ.

بەردەوام دوو بۆچوون دەربارەی سروشتی ئادەمیزاد لە ئارادا بووە کە لە بنەڕەتدا جیاواز بوون.. یەکێکیان ئەوەیە کە ئەڵێت:– مرۆڤ هەر بە تەبیعەت شەڕەنگێزو وێرانکارە" کەواتە ناتوانین ڕێ لە هەڵگیرسانی جەنگەکان بگرین،

ئەبێ دەستێکی بەهێز لە ژوور سەرمانەوە بێت.. ئەبێ وەچەی ئادەمیزاد کۆنترۆڵ بکرێ و مەیلی شەڕەنگێزی و دەست درێژی بخرێتە ژێر چاودێرییەوە.

بۆچوونی دووەمیش ئەڵێت(( مرۆڤ لە بنەڕەتدا خێرخوازەو هۆکارەکانی دەوروبەرو کۆمەڵگا وای لێ دەکەن شەڕەنگێز بێت.)) ئەگەر بێت و ئەو هۆکارو هەل و مەرجانەی بگۆڕێن" ئەتوانین مەیلی شەڕەنگێزی لای ئادەمیزاد کەم بکەینەوە یا هەر لە ناوی بەرین. بەڵام بەڕای ئێمە ئەو دوو تیۆرییە هەردووکیان زێدە ڕۆن و تەواو ڕاستیی مەسەلەکە ناپێکن. ئەوانەی کە توندوتیژی ئەگەڕێننەوە بۆ خودو تەبیعەتی ئادەمیزاد، چاو لەو قۆناغە مێژووییانە و ئەو فەرهەنگانەو کۆمەڵێك کەسێتیی زۆر ئەپۆشن کە بە ڕادەیەکی زۆر کەم شەڕەنگێزییان لێ وەشاوەتەوە، گەر شەڕەنگێزی خودی بوایە، ئەو نموونانەی پێشوومان لەمێژوودا نەدەبینی.. لە سەرێکی ترەوە ئەو گەشبینانەی کە دژ بە جەنگن و هەواداری ئاشتیو دادی کۆمەڵایەتین چاو لە هێزی شەڕەنگێزیی ئادەمیزاد خۆی ئەپۆشن و بەڵکو هەندێ جار نکوولیشی لێ ئەکەن، فەیلەسووفانی قۆناغی ڕۆشنگەری لە فەرەنسادا، لەم بەرەیە بوون و گەشبینیی ئەوانە لە ئاسەوارەکانی مارکس و بیرو باوەڕەکانی سۆسیالیستە سەرەتاییەکان دا ئەبینرێ.

من خۆم لایەنگری تیۆرییەکی سێیەمم کە لە بۆچوونی گەشبینەکانەوە نزیکترە. بە بۆچوونی من ئینسان لە گیانەوەر وێرانکارترو بەزەبرو زەنگترە..گیانەوەران سادیستیك نین، گیانەوەران دوژمنایەتیی ژیان ناکەن، لە کاتێکدا مێژووی ئادەمیزاد پڕە لە وێرانکاریو دڕندایەتیی سەر سووڕ هێنەر. بەڵام بڕواشم وایە کە شەڕەنگێزی لای ئێمەی مرۆڤ پەیوەندیی بە سروشتی گیانەوەری و غەریزەو ڕابردووی باوو باپیرانمانەوە نیە، بەڵکو دڕندایەتیی ئێمە کە زۆر لە هی گیانەوەر زیاترە" بەندە بە هەلومەرجی تایبەتیی ژیانمانەوە.. شەڕەنگێزی و وێرانکاری خراپەیە، بەڵام نەك بەو جۆرەی کە لۆرانس لێی ئەدوێت" بەڵکو خەسڵەتێکی مرۆڤانەیە. هێزێکە لە ئینساندا هەیەو گەر ڕێی

ڕاست نەدۆزێتەوەو بە شێوازێکی ڕاست پەروەردە نەکرێ، ئەم هێنزە بوونی خۆی ئاشکرا ئەکات..

شەڕەنگێزیی(( زیاد لە پێویستی ئادەمیزاد)) واتە ئەو بڕە توندو تیژیەی کە لە هی گیانەوەر پترە. ڕەگ و ڕیشەی لە خوو و سروشتی ئادەمیزاد خۆیدایە، مەبەستی من لە سروشت(( تەبیعەتی مرۆڤ)) مانا سایکۆلۆژیەکەیەتی: سروشت بە مانای ئەو کۆمەڵە پەیوەندیەی کە مرۆڤ بە جیهانەوە ئەبەستێتەوە.

مرۆڤ خۆی سروشتی هێناوەتە ئاراوە، تا جێی غەریزەی گیانەوەری بگرێتەوە. ئەو غەریزەیەی کە بە ئەندازەیەکی کەم لە مرۆڤدا ماوەتەوە. ئەشێ پێناسەی من بۆ سروشت تا ڕادەیەك خۆی تیۆریك بنوێنێ. بەڵام گەر لە ئەزموونە تایبەتیەکانی خۆت ڕابمێنیت، لە چەمکی من بۆ سروشت تێ ئەگەیت. بێگومان لەگەڵ کەسانێکدا هەڵسوکەوتت کردووە، کە سروشتێکی سادیستیکانەیان هەیە. هەروەها بە کەسانێکی(( میهرەبان)) یش ئاشنایت.

حوکمی تۆ لەسەر ئەوان لەسەر بنچینەی یەك جار ڕەفتارێکی سادیستیکانە یا دۆستانە نەبووە، بەڵکو لەسەر بنچینەی خسوسیاتی ئەخلاقی هەمیشەییو سروشتی خودیی ئەوان بووە. هەیدێ ئەو کەسە سادیستیکانەی کە ڕەفتاری سادیستییان نەنواندووە، چونکە هەڵوێستی گونجاویان بۆ ڕەخساوە. تەنها چاودێرێکی وردبین لە توانایدایە نیشانەی سادیستی لە هەڵسوکەوتی بچووکی ئەواندا ببینێتەوە. بەپێچەوانەشەوە ئەشێ کەسێك کە سروشتێکی وێرانکارانەی نیە لە حاڵەتێکی تووڕەییو نائومێدییەکی زیاددا کەسێکی تر بکوژێت، لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێ هۆی ئەو کارەی بگەڕێنرێتەوە بۆ خوو و سروشتی وێرانکارانەی ئەو کەسە.

گەر وا دابنێین کە ڕیشەی شەڕەنگێزیو توندوتیژی وا لە هەلومەرجی ژیانی ئینساندا نەك لە سروشتی گیانەوەرانەیدا کەواتە هیچ ئەرزشێك بۆ تیۆریی غەریزە دانانێین.. لایەنگرانی تیۆریی غەریزە ڕایان وایە کە ئەتوانرێ شەڕەنگێزیی فرەی ئادەمیزاد بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەو شەڕەنگێزییە بڕە کەمەی کە

لە گیانەوەراندا هەیە. بەڵام چۆن؟!.. ڕێی تێ ناچێت بڵێین:-(( ئەو شەڕەنگێزیە بە میرات لە گیانەوەرەوە بۆ ئادەمیزاد ماوەتەوە" کەچی ئێستا ئادەمیزاد شەڕەنگێز ترو دڕندەترە لە گیانەوەر. ئەنجامگیریی دروست ئەوەیە کە ڕەفتاری ئینسان لە ڕەفتاری گیانەوەر جیاوازە (لەڕووی دڕندایەتییەوە).. هیچ شتێك لە گیانەوەرانەوە بە میراتی بۆ مرۆڤ نەماوەتەوە.

بەڵکو شەڕەنگێزی لە هەلومەرجی ژیانی مرۆڤەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ..

چەند ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی شەڕەنگێزیی گیانەوەر بخەمە ڕوو، شەڕەنگێزیی لە گیانەوەردا لەگەڵ پێویستییە بایۆلۆژیکەکانیدا هاوسازەو بۆمانەوەی نەژادو ڕەچەڵەکی پێویستی پێیەتی..

کاتێك بەرژەوەندییەکانی ژیانی گیانەوەر ئەکەوێتە بەر هەڕەشەی هێزێکی دەرەوە، بۆ نموونە ژیانی بێت، یا خۆراکی. یا پەیوەندیی سێکسیو لانەو قەڵەمڕەوی، ئەو دەمە لە کاتی دیاریکراودا یان بە توند و تیژیەوە ڕووبەڕووی مەترسییەکە ئەبێتەوە،و یان هەڵدێ.

شتێکی بەڵگە نەویستیشە گەر هەڕەشە لە ئارادا نەبێ، توندوتیژی و دڕندایەتیش لە ئارادا نابێت. دڕندایەتی وەك میکانیزمێك لە مێشکدایەو هەر ساتێك ئەگەری کەوتنەکاری هەیەو، بە پێچەوانەی تیۆریەکەی لۆرانس کەڵەکە نابێ تا پاشان پێویست بە خاڵی بوون بکات. یان با بڵێین پەیڕەوی لە قانونی هایدرۆلیك ناکات.

هیس((HESS)) یەکەمین پسپۆری سایکۆ - فسیۆلۆژی بوو کە ناوەندە بزوێنەکانی شەڕەنگێزیی لە مێشکدا لەکاتی بوونی هەڕەشەدا دۆزییەوە..

توندو تیژیی دڕندەکان جۆرێکی دیکەیە، ئەوانە نەك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی مەترسی" بەڵکو بەمەبەستی بەدەستهێنانی نێچیر شاڵاو ئەبەن. ناوەندی وراوژانی شەڕەنگێزی لە مێشکی ئەو گیانەوەرانەدا لەگەڵ ناوەندی توندوتیژی بۆ بەرگری لە خۆکردن دا جیاوازە.. لێرەوە دەکرێ بوترێ کە گیانەوەران شەڕەنگێز نین، مەگەر بکەونە بەر مەترسیی هەڕەشە ایْکردن... ڕشتنی خوێنی یەکتر لە نێو

گیانەوەرانــدا زۆر دەگمەنــە، تەنانــەت گــەر لەگــەڵ یەكتریشــدا شــەڕ بكــەن. لێكۆڵینەوەكان وا پیشان ئەدەن كە ژیانی كۆمەڵایەتیی مەیموونەكان نموونەی بە ئاشـتی پێكـەوە ژیـان و ئاسایشـە. بەدڵنیاییـەوە ئـەكرێ بـوترێ ئەگـەر مـرۆڤ لـە شەمپانزی شەڕەنگێز تر نەبووایە" هـەرگیز ترسـی شـەڕو دڕندایـەتیمان نـەدەبوو.. گورگ لەگەڵ هاوڕەگەزی خۆیدا توندوتیژ نیە. گەرچی گـورگ لـە پـۆلی دڕندەكانـەو پـەلاماری ڕانـە مـەڕ ئـەدات. بـەڵام ئـەو تونـدو تیژیـەی بـە مەبەسـتی دەسـتكەوتنی نێچیرە..

لەكاتێكدا گورگ لـە كۆمـەڵیٚ گورگاندا شـەڕەنگێز نىیـە" بـەڵكو لەگـەڵ یـەكتردا زۆر میهرەبــانن.. كەواتــە هــەق نیــە لــە ڕووی دڕندایەتیــەوە، مــرۆڤ بــە گــورگ بشوبهێنین و بڵێین:-

((مرۆڤ گورگی مرۆڤە))

گورگ پەلاماری مەڕ ئەدات، بەڵام پەلاماری گـورگ نـادات. كەواتـە شـەڕەنگێزی لای گیانەوەر پەیڕەویی قانونی(( هایـدرۆلیك)) ناكـات، گیانـەوەر تـا نەكەوێتـە بـەر هەڕەشە ئەو دڕندایەتیە فرەیەی لەكن نىیە، تا كەڵەكە بیٚ و دواجار بتەقێتەوە.

بەواتایـەكی دیكـە شـەڕەنگێزی لای مـرۆڤ بنەمایـەكی بـایۆلۆژیكی لـە مێشـك دا هەیەو كەوتنـەكاری پێویسـت نىیـە. تـا ئـەو دەمـەی خـود ئەكەوێتـە بـەر هەڕەشـە، دڕندایــەتی بــەدەر ناكــەوێت، ئــەم بۆچــوونە جیــاوازە لــەو بۆچــوونەی كــە ئــەڵیٚ شـەڕەنگێزی خەسـڵەتێكە مـرۆڤ لـە ژینگـەو دەوروبـەرو بارودۆخـەوە وەریـدەگرێت. بەڵام مەسەلەكە بەو سادەییەش نىیە، چونكە ئەگەر بە تەنها بارودۆخ وا لـە مـرۆڤ بكات توندو تیژ بێت. ئەو دەمـە نەیـدەتوانی كاردانەوەكـەی بەهـەمان خێرایىو بـە هەمان زەبروزەنگ بێت تەواوی میكانیزمە سایكۆفسیۆلۆژییەكان كـە بـۆ بزوانـدنی مەیلی شەڕەنگێزی پێویستن ئامادەی چالاكین. بەڵام سەرەتا پێویستیان بە جـۆرە ڕێكخسـتنێك هەیـە" ئـەگینا توانـای كاركردنیـان نابێـت، نموونەیـەكی زینـدوو بهێنمـەوە، كەسـێك كـە بـە مەبەسـتی بـەرگریكردن لـە خـۆی دەمانچـەیەك ئەخاتـە چەكمەجەی مێزەكەی یا ژێر سەرینەكەی خۆیەوە" ئەوە ناگەیەنێت كە هـەر كاتێك

ئارەزووی لێ بوو دەری بهێنێت و بیتەقێنێت. بەڵکو تەنها بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی یا هەڕەشە بە کاری دەهێنێت.مێشکی ئێمەش بە هەمان شێوە کار ئەکات. ئەڵێی دەمانچەیەك لە مێشکماندایەو لەکاتی هەست کردن بە مەترسیو هەڕەشەدا ئامادەی تەقە کردنی خێرایە.

بەڵام بە پێچەوانەی تیۆریی غەریزەوە، ئەو ئامادەییە ئەنجامی کەڵەکە بوون و تەقینەوەی مەیلی شەڕەنگێزی نییە.

هێس و پسپۆڕانی تری سایکۆفسیۆلۆژی گەیشتوونەتە ئەوەی کە جگە لە شەڕەنگێزی" هەڵاتنیش کاردانەوەیەکە بەرامبەر بە مەترسی. تەنانەت گیانەوەر کایٔ شاڵاو ئەبات کە دەرفەتی هەڵاتنی نەبیٔو تەنها ئەو دەمە پەنا ئەباتە بەر شەڕو توندوتیژی. ئەگەر دان بە غەریزەی شەڕەنگێزیدا بنێیت ئەوا دان بە غەریزەی جەنگیشدا بنێین.

هەروەها لایەنگرانی تیۆریی شەڕەنگێزی وغەریزە لەو باوەڕەدان کە مرۆڤ بەردەوام هەستی شەڕەنگێزی ئەیورووژێنێت و ناتوانیٔ ئەو هەستەی خۆی کۆنترۆڵ بکات.

لێرەوە ئەبیٔ ئەوەش بووتریٔ کە مرۆڤ بەردەوام لە ژێر گوشاری توندی مۆتیڤی هەڵاتندایەو کۆنترۆڵیشی دژوارە. هەر کەسێك شەڕی بینیبێت زۆر باش ئەزانێت کە هاندەری هەڵاتن لە مرۆڤدا چەند بەهێزە، گەر وانەبووایە سزای هەڵاتووانی جەنگ کوشتن نەدەبوو. بەواتایەکی دیکە ئەتوانین بڵێین مێشکی ئێمە بەرامبەر هەڕەشە دوو ئیمکانی کاردانەوە ئەهێنێتە ئارا، ئەتوانین شەڕ بکەین و ئەتوانین هەڵبێین. بەڵام چ هاندەری شەڕو چ هاندەری هەڵاتن" گەر هەڕەشە لە ئارادا نەبیٔ چالاك نین و، خۆیان لە خۆیاندا مەیلێکی توندی بەردەوام بۆ شەڕو شاڵاو بردن ناخولقێنن..

بینیمان کە تیۆریی هایدرۆلیکی شەڕەنگێزی لای لۆرانس و تا ڕادەیەك تیۆریی غەریزەی مەرگ لای فرۆید مەنتیقی نین و شیاوی بەرگری لێ کردن نین. ئەو ئاکامانەی پزیشکانی سایکۆ فسیۆلۆژی پێی گەیشتوون ئەوە ئەخەنە ڕوو کە

شەڕەنگێزی لای مرۆڤ و لای گیانەوەر هاندەرێك نییە خۆی لە خۆیدا پەرە بسێنێ‌و بورووژێت.. بەڵكو بە هەڕەشە كردن لە ژیان و بەرژەوەندیەكانی ژیان دەكەونە چالاكی نواندن. جگە لە تاقیكردنەوە فسیۆلۆژیكەكان، بەڵگەی تریش بۆ پووچەڵ كردنەوەی تیئۆریی هایدرۆلیك هەیە. بوارەكانی مرۆڤناسی، دێرین ناسی، چارەسەری دەروونی و دەروونناسیی كۆمەڵگاش بێ بنەڕەتیی ئەم تیۆرییە ئەسەلمێنن.. گەر تیۆریی لۆرانس ڕاستیی بپێكایە ئەبووایە مەیلی شەڕەنگێزی لە هەموو كەسێك و هەموو فەرهەنگێك و هەموو كۆمەڵگایەكدا لەیەك شێوەدا دەربكەوتایە..

لەو زانیاریانەوە دەست پێ دەكەین كە پەیوەندییان بە مرۆڤناسیەوە هەیە. گەلێ هۆزی سەرەتایی هەن كەمەیلی شەڕەنگێزی لە تاكەكانیاندا نابینرێ، بە پێچەوانەوە لەو كۆمەڵگایانەدا گیانی خۆشەویستی‌و دۆستی فەرمانڕەوایە، گیانی شەڕەنگێزیش لەوپەری لاوازیدایە. بەم پێیە نەتاوان لە نێوانیاندا ڕوودەداو نە دەستدرێژی‌و نە خاوەنداریێتیی تایبەتی لە نێوانیاندایەو نەزەوتكردنی مافی یەكترو چەوساندنەوەو نەزنجیرەی پلەوپایە، ئەتوانین بۆ نموونەی ئەوەش ناوی هۆزی ((پۆیبلۆ)) بهێنین كە لە ئەمەریكاییە ئەسڵیەكانن. كۆلین تێرن بۆلْ باسێكی سەرنجكێشی دەربارەی ئادەمیزادەكانی هۆزێك هەیە كە وەكو هۆزی پۆیبلۆو وەكو مرۆڤی سەرەتایی (٣٠) سی هەزار ساڵ لەمەوبەر لەڕێی كۆكردنەوەی خۆراكەوە گوزەرانی خۆیان دابین كردووە.

لە نێو ئادەمیزادەكانی ئەم هۆزەدا كە بستە باڵان و لەجەنگەڵەكانی ئەفەریقای ناوەنددا ئەژین، توندو تیژی بەدی ناكرێ. بێگومان جاری وا هەیە توڕە ئەبن و لایەنگرانی تیۆریی توندوتیژی ئەو حاڵەتە بە سەلمێنەری دروستیی تیۆرییەكەیان لە قەڵەم ئەدەن. بەڵام لەو بۆچوونەیاندا بە هەڵەدا چوون..چونكە جیاوازیەكی زۆر هەیە لە نێوان تووڕەبوونی ناو بەناوو كەڵەكە بوونی مەیلی شەڕەنگێزیدا كە دوا جار بە جەنگ و كوشتنی هاوڕەگەز كۆتایی دێ.

لەنێوان دوو کەسدا کە یەکێکیان لە هەڵوێستێکی دیار کراودا تووڕە ئەبێت و ئەوی تریان کە وێرانکارەو گیانی پڕ ڕق و کینەیە، جیاواز یەکی زۆر هەیە.. هەر کەسێ دان بەو جیاوازیەدا نەنێت" بەڕای من کەسێکی سادەیەو وردبین نی‌یە.

هۆزی ڕاوچی‌یە بالأبستەکان جەنگەڵ بە دایکی خۆیان ئەزانن و، وەکو گیانەوەرە ڕاوچییەکان تەنها بۆ دابین کردنی خۆراکیان ڕاو ئەکەن.. بۆ ڕۆژی ئایندەیان زەخیرە ناخەن چونکە ئامرازەکانی پاراستنیان نی‌یە. هەر وەختێ برسییان بوو، بۆ ڕاو ئەچن و نەخۆراکیان لێ ئەمێنێتەوەو نە کەم و کورتی دێنێ.هەر لەبەر ئەمەش مۆڵکایەتی‌ی تایبەتی لە ناویاندا نی‌یە، هەروەها سەرۆکیان نی‌یە. پێویستیان بە بوونی سەرۆکیش نی‌یە. هەل و مەرجی ڕۆژ فەرمانڕەوای‌ی ژیانیانەو هەر کەس ئەرك و کاری خۆی ئەزانێت. بەزمانی ئەمرۆ لەناو ئەو هۆزەدا دیموکراسیەکی قووڵ و ڕیشەدار حوکمرانە. کەس فەرمان بەسەر کەسدا ناکات. چونکە نەپێویستیان بەوە هەیەو نە هەیە ناچاریان بکات ئەو کارە بکەن. لە فەرمانڕەوایی هیچ دەسگیر نابێ، لەبەر ئەوە چەوساندنەوە هەواداری نی‌یە. چی وا لە کەسێك ئەکات کەسێکی تر بۆ ئامانجەکانی خۆی بچەوسێنێتەوە؟! گەر وا دابنێین ئەو کەسە بۆیە ئەم کارە ئەکات تا ئەو نێچیرەی ئەوانی تر ڕاویان کردووە بۆ خۆی زەوت بکات" ئەوا ئیتر ئەو کەسە بێکار ئەبێ‌و ئەم بێکاریەش ئەبێتە هۆی وەڕس بوون و بێزاری. لەو هۆزەدا کەس پێویستی بەکاری کەسی تر نی‌یەو ژیانی خێزانی تیایاندا ئارام و ئاسوودەیە.. تاقە هاوسەرێك هەڵئەبژێرن و مەرجەکانی جیابوونەوەو لێك دابڕانیش ئاسانە. پەیوەندیی سێکسی بەر لە ژیانی ژن و مێردایەتی قەدەغە نی‌یە. وەختێ ئەو ژیانە (واتە ژیانی ژن و مێردایەتی) دەست پێ ئەکات کە ژنەکە سکی پڕ ئەبێت. ئیتر ئەو ژن و مێردە تا کۆتایی تەمەنیان شەریکی ژیانی یەکتر ئەبن.. مەگەر میهرو خۆشەویستییان ڕوو لە ساردی بکات یان هەر ئەمێنێ، کە ئەمەش بە دەگمەن ڕوو ئەدات. لەنێو ئەو بستە بالأیانەدا سپێرو پاشەکەوت نی‌یە، گەرچی ڕاو بەردەوام ئاسان نی‌یەو هەندێ ساڵ دوچاری قاتی بوون و کەم و کورتیش

دێن. بەڵام بۆ گوزەرانی ژیانیان پشت بە جەنگەڵ ئەبەستنەوە. بیر لەوە ناکەنەوە کە مەسرەفی زیاتر بکەن، ئازووقەی زیاتر بخەن و خاوەنی شتی زیاتر بن بۆیە بەردەوام بەختەوەرن و بەو ژیانەیان قایلن، ئەم جۆرە هۆزانە" نموونەی کۆمەڵگای بەختەوەری ڕاستەقینەن نەك لەبەر ئەوەی کە خاوەنی شتی زیاترن، بەڵکو لەبەر ئەوەی بەوە قایلن کە هەیانەو داوای زیاتر ناکەن و ئەوەی هەشیانە مایەی ژیانێکی ئاسوودەیە بۆیان. من ئەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەم کە ئەبێ هەموو سیستمەکەو بونیادی هەڵسوکەوتەکان بخەینە بەر تۆژێنەوە، نەك بەشێك لە گشت جیا بکەینەوەو لەو بەشەوە ئەنجامگیری بکەین. نابێ لە خۆمان بپرسین (ئایا ئەم ڕەفتارە شەڕەنگێزانەیە یان نە؟!) وەڵامی ئەم پرسیارە دژوارە، گەر هەمان ڕەفتار بخەینە زەمینەی بونیادی کۆمەڵایەتیەوە، ئەبینین ئەوەی لەبەر چاومانە. خەڵکانێکیخۆشەویست و میهرەبانن کە لەگەڵ یەکدا دوژمن نین و ئێرەیی بەیەکتر نابەن و بە ڕەچاو کردنی هۆکارە کۆمەڵایەتیەو دەروونیەکان سەرنج ئەدەین کە شەڕەنگێزیش نین. ئەمە ئەوەشمان بۆ ئەسەلمێنێ کە سیستمی دەروونی و کۆمەڵایەتی تا چەند بە یەکەوە گرێ دراون.

یەکێك لە قۆناغە سەرنج ڕاکێشەکانی مێژووی مرۆڤایەتی شۆڕێکە کە پێی دەوترێ شۆڕشی بەردینی نوێ، ئەم شۆڕشە کە نزیکەی (١٠) دە هەزار ساڵ لەمەوبەر ڕووی دابووە هۆی بڵاوبوونەوەو پەرەسەندنیکشتوکاڵ لە ئاسیای بچووکدا. وا پێدەچێت یەکەمجار ژنان کشتوکاڵیان دۆزیبێتەوە. ئەگەر چی بەڵگەیەك نییە ئەمە بسەلمێنێت.. ئەوەی ئافرەتان دۆزییانەوە، هەندێ گیای کێوی بوو کە ئەکرا بڕوێنرێن و گەنم و تۆوی تریان لێ بە دەست بهێنرێ.. پیاوان لەم جۆرە دۆزینەوانە دوور بوون و لەو قۆناغەدا تەنها سەرگەرمی ڕاوو ئاژەڵداری بوون.

مرۆڤ پاش دۆزینەوەی کشتوکاڵ تێگەیشت کە جگە لەو خۆراکانەی لە سروشت دا هەن" دەتوانێ بە پشتیوانی هۆش و سەلیقەی"بۆ بەرهەمهێنانی

خۆراکی دی سروشت بەکار بهێنێت. هەروەکو وتمان زەمانێکی زۆر بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێنەپەڕیوە.

لەسالانی یەکەمی شۆڕشی بەردینی نوێدا– چوار هەزار سالی یەکەم – کۆمەڵگاکان بە ئاشتیو ئاسوودەیی ژیانیان ئەگوزەراند. لەوە ئەچێت لە دێی بچووك دا نیشتەجێ بووبن و سیستمی دایکسالاری تیایاندا بالادەست بوو بێت.. بەرهەمیان کەمێك لە پێویستیەکانی خۆیان زیاتر بوو و..ئەم زیادەیە مایەی خاتر جەمی و فراژی بوونی کۆمەڵ بوو. بەلام ئەم زیادەیە لەبەرهەم هێنانیدا بە ڕادەیەك نەبوو بێتە هۆی ئێرەییو تەماع. لەکۆمەڵگاکانی چاخی بەردینی نوێدا وا پێ ئەچێت شێوازی ژیانێکی دیموکراتی ڕەسەن هەبوو بێت و ژنان و دایکان ڕۆڵیان سەرەکی تر بوو بێت.. سیستمی باوکسالاری نزیکەی سێ یا چوار هەزار سال بەر لە زایین هاتە گۆڕێ.. لەو قۆناغەدا بوو کە هەموو شتەکان گۆڕان..بەرهەم زۆر زیاتر بوو. لە ڕادەی پێویست و مەسرەف– کۆیلایەتی هاتە ئاراوە. کار دابەش بوو.. هێزی شەڕەنگێز پێك هێنرا، دەولەت دامەزراو ئاگری جەنگ هەڵگیرسێنرا...مرۆۋ فێری ئەوە بوو کە ئەتوانێت خەڵکی تر بچەوسێنێتەوە و بۆ مەبەستی خۆی بەکاری بهێنێت. زنجیرەی پلەو پایە پەیدا بوو و پاشا لەسەرەوەی ئەو زنجیرەیە بوو. پاشایان نوێنەرانی خوا بوون لەسەر زەویو لە زۆربەی کاتدا بەبەرزترین پلەی ڕۆحانی ئەژمێردران. ئەم بونیادە کۆمەلایەتێیە بووە هۆی هاندانی شەڕەنگێزان. مرۆۋ دەستی دایە ڕێگری و دزی و چەوساندنەوە. دیمۆکراسی جێی خۆی بە زنجیرەی پلەو پایەی دەولەتی سپارد، کە دەبووایە هەمووان گوێ ڕایەلی فەرمانەکانی بوونایە..

جێی خۆیەتی کە تۆزێك دەربارەی هۆیەکانی جەنگیش بدوێین. ئەوانەی باوەڕیان بە غەریزە هەیە ئەڵێن گوایە هۆی جەنگ ئەگەڕێتەوە بۆ بوونی غەریزەی شەڕەنگێزی لە مرۆڤدا. بەلام ئەم تێڕوانینە سادەو هەڵەیە– ئێمەش دەزانین کە زۆربەی جەنگەکان کاتێ دەست پێ ئەکەن کە دەولەتان میللەتەکانیان قەناعەت پێ کردبێت کە دەسدرێژی کراوەتە سەریان و ئەبێ بەرگری لە بەها زۆر

پیرۆزەکانی خۆیان، لە ژیانیان لە ئازادییان و لە دیموکراسی بکەن.. بەڵام ئەمە چەند هەفتەیەك دەوام ئەکات و پاشان دا ئەمرکێتەوە. ئەوسا ئەبێ بە هەڕەشەو تەمێکردن خەڵکی بۆ جەنگ هان بدرێن.. بێگومان ئەگەر میللەت بەڕادەی پێویست شەڕەنگێز و پەلاماردەر بێت پێویست بە پەنا بردنە بەر هەڕەشەو تەمێ کردنی ناکات. بە پێچەوانەوە ئەو دەمە دەبوایە سەرکردەو فەرمانڕەواکان بە خەڵکیان ڕابگەیاندایە کە ئاشتی زامنی ئاسوودەییە بۆ ژیان و پێویستە خۆیان لە مەیلی شەڕ بپارێزن، چونکە ئەبێتە هۆی نانەوەی شەڕ، بەڵام ئێمە دەزانین کە ئەمە بە پێچەوانەوەیە. با سەرنج بدەینە ئەو قۆناغەی کە جەنگ تیایدا هاتە گۆڕێ– ئەو قۆناغە دوای شۆڕشی بەردینی نوێ بوو، ئەو چاخەی شار – دەوڵەتەکان پەیدا بوون و، پاشاکان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشتن و سوپا پێك هێنراو،مرۆڤ دەستی بە جەنگ و،کۆیلە گرتن و دزی و شتی تری لەمانە کرد. لە نێو ڕاوچییەکان و جوتیارەکاندا شەڕی دیسپلین کراو نەبوو، چونکە هۆکارێکی پێویست بۆ ئەوە لە ئارادا نەبوو. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە لە سیستمی کۆمەڵایەتی هەندێ لە هۆزە سەرەتاییەکان دا، خۆشەویستیو هاریکاری حوکمڕان بووەو بە ئەندازەیەکی زۆر کەم شەڕەنگێزییان لا دروست بووە– گەر سیستمێکی لەم جۆرە هەبێت. کەواتە تیۆریی هایدرۆلیك کە شەڕەنگێزی لای مرۆڤ بۆ غەریزە دەگەڕێنێتەوە"ڕاستی ناپێکێت. بەڵگەیەکی تر بۆ ڕەت کردنەوەی تیئۆریی غەریزە. گۆڕانی ئاستی شەڕەنگێزییە لە کۆمەڵگادا. بۆ نموونە نازییەکان لە سەرەتای سییەکانی ئەم سەدەیەدا" زیاتر لە لایەن وردە بۆرژواکان و ئەفسەران و ئەو خوێندکارانەی کە دوای جەنگ لە ژیان بێزار بوو بوون" پشتیوانیان لێ دەکرا و چینەکانی ناوەڕاست و سەرەوە بەرەو پیریانەوە نەدەچوون، نالێم کە ئەم دوو چینە تەسلیمی ڕژێمی نازی نەبوون" مەبەستم ئەوەیە کە لە ناو ئەماندا و تەنانەت کرێکارانیش، نازییەکی دەمار گرژ پەیدا نەبوو. نازییەکی باوەڕ پتەو لە نێو کرێکاران دا بە دەگمەن دەبینرا. هەمان شت لە ولایەتەکانی باشووری ئەمەریکا دا دەبینرێ..سپی پێستە هەژارەکانی باشوور

خـاوەن تونـدو تیژییـەکی زۆرن، زۆر زیـاتر لـە چـینی ناوەنـدو کرێکـارانی ویلایەتەکانی باشوور و کەنارەکانی خۆرهەلأت. توند و تیژی زیاتر لە چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا، واتە بنکەی هەرەمی کۆمەڵگا ئەوەشێتەوە..

ئەمانـە تـامی شـادمانییان نەچێشـتووە، خوێنـەوارییان نییـە. لەپـەراوێزی کۆمـەڵگادان و خێر لە کۆمـەڵگا نابینن، لـە نـاو ئـەم جـۆرە خەڵکـەدا زەبـرو زەنگـی سادیسـتیکانە بـە جۆرێك ڕەگ دادەکـوتیٚ کـە لـە ناوچـینەکانی تـری تـەواوەی نـاو کۆمــەڵ دا نــابینریٚ.. چــونکە ئەمانەکۆمــەڵێك پەیوەنــدی بــە کۆمەڵــەوە ئەیانبەسـتێتەوەو هەسـت دەکـەن لەگـەڵ چـینەکانی تـری کۆمـەڵگادا هاوتـا و هاوژیـانن.ئاسـتی شـەڕەنگێزی لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێکیتریش جیـاوازە، بـۆ نموونـە کەسـێك بهێنـەرەوە پـێش چـاوت کـە دەچـێتە لای پزیشـکی دەروونیـو دەڵێت:- (دکتـۆر ڕقم لـە هـەموو کەسـێك دەبێتـەوە، لـە ژنەکـەم. لـە منداڵەکانم.. لـە هاوکارەکانم ...کەسێك نیـە ڕقم لێی نەبێتـەوە) لـە دیـدی پزیشـکەکەوە ئـەو کەسـە نەخۆشـە. وەلأمـی دکتۆرەکـە بـەم جـۆرە نابێـت:-(بێگومـان هـەموو شـتێك ڕوونـە، غەریزەی شەڕەنگێزی ئەم هەستەی لای تۆ دروست کردووە.) بـەڵکو لـە وەلأمیدا دەڵێت:- سروشتی ئەو بە جۆرێکە کە بەردەوام توند تەند و تیژی دەخولقێنێت هەر بۆیە لە خۆی دەپرسێت:-(چۆن دووچاری ئەو هەستە بووە؟! لە هەلو مەرجی کۆمەلأیەتیی ژیانی، مێژووی بنەماڵەو خێزانەکەی و ئەزموونـەکانی ڕابووردووی دەکۆڵێتەوە) هەوڵ دەدات تێبگات کە ئەو شەڕەنگێزییە بۆچی بووە بەبەشێك لە بوون و بونیادی سروشتی ئەوە. وەکو لایـەنگرانی تیـۆریی غـەریزە ناڵێـت:- هـیچ نـاکریٚ. ئـەم حاڵەتـە بـە هێـزی و تونـدو تیـژیی شـەڕەنگێزیی خـودی ئێمـە دەسەلمێنێت.)

ئێمــە هــەمووومان مرۆڤــی شــەڕەنگێز دەناســین. مەبەســتم لــە شــەڕەنگێز ئادەمیزادی دەمارگیر نییـە - بـەڵکو کەسـانی وێرانکـەر. کەسـانی شـەڕ فرۆش - مرۆڤــی میهرەبــان و بەســۆزیش دەناســین- کــە چ بــە ڕواڵــەت و چ بــە گەوهــەر میهرەبانن. ئەو سۆز. خۆشەویستیەشیان مانـای لاوازییـان نییـە. ئەگـەر نـەتوانین

جیاوازی لە نێوان خۆشەویستی و مەرایی‌دا بکەین" مانای وایە گومڕاین – بەم پێیەش زۆربەی خەڵك گومڕان" چونکە توانای ئەو جیاوازی کردنەیان نی‌یە. بەڵام گەر بەوردی‌یەوە سەرنج بدەین" دەتوانین کەسانێك کە بەڕاستی میهرەبانن لە کەسانێك کە لاوازو مەرایی کەرن جیا بکەینەوە. ئێستا پێویستە بزانین مانای شەڕەنگێزیی مرۆڤ چی‌یە؟! تا ئێرە دەمانویست ئەوە ڕوون بکەینەوە" کە شەڕەنگێزیی مرۆڤ پەیڕەویی قانوونی هایدرۆلیك ناکات.

دوو جۆر شەڕەنگێزی لە ئادەمیزاددا هەیە! یەکەمیان ناو دەنێین(( شەڕەنگێزیی بەرنامەداری بایولۆژیك)) کە هەمان میکانیزمی بەرگری‌یە کە لە گیانەوەرەکانی دیکەشدا هەیە.. دووەمیان تایبەتە بە ئادەمیزاد. ئەمەیان لە سەرێکەوە لە شێوەی زەبروزەنگ دا و لە سەرێکی ترەوە لە شێوەی دوژمنایەتی کردنی ژیان دا خۆی دەنوێنێ، هەمان ئەو قێزکردنەوەیە لە ژیان کە ئێمە ناومان ناوە( مەرگپەرستی) (نیکرۆفیلیا) و لێرەدا بواری ئەوە نی‌یە قسەی لەسەر بکەین. ئێستاش با بگەڕێینەوە بۆ جۆری یەکەم، واتە شەڕەنگێزیی بەرنامەداری بایۆلۆژیك– هەروەکو وتمان بونیادی سایکۆفسیۆلۆژیی مرۆڤ و گیانەوەر وەختێ کەوتەبەر هەڕەشە، یا بەرژەوەندیەکانی ژیانی کەوتە مەترسی‌یەوە. کاردانەوەکەی شەڕو توندو تیژی دەبێت..بەڵام لە ئادەمیزاددا ئەم شەڕەنگێزیی بەرگرییانەیە کاردانەوەیەکی فراوانترە. لەبەر سێ هۆ" یەکەم" گیانەوەر تەنها هەست بە هەڕەشەی ئەو ساتە دەکات کە تیایدا دەژی – ئەو ئەوەندە دەزانێت کە (ئێستا لەبەردەم مەترسیدام) .بەڵام ئادەمیزاد بیر لە ئایندەش دەکاتەوە. هەست بەو مەترسی‌یەش دەکات کە لە حاڵی حازردا ڕووی نەداوە. وەلێ ئەشێ ڕوو بدات. هەر بۆیە بەرامبەر بەو مەترسی‌یەش هەر کاردانەوەیەکی توندو تیژی دەڵێت ئەم خسوسیەتەی ئادەمیزاد مەیدانی کاری (شەڕەنگێزیی کاردانەوە) فراوانتر دەکات،چونکە هەم ژمارەی ئادەمیزادەکان و هەم هەڵوێستە پڕ مەترسی‌یەکانی پەیوەست بە ئایندەوە زۆرن..

هۆیەکی تری بەهێزی و فراوانی مەیدانی کاری شەڕەنگێزیی کاردانەوە لە مرۆڤ دا (پێوتنەوە) یە گیانەوەر لەم سیفەتە بێبەشە. تۆ ئەتوانیت خەڵکی قەناعەت پێ بکەیت.. کە ژیانیان یا ئازادییان کەوتۆتە مەترسییەوە. لەم ڕووەوە سوود لەوشەو سیمبوڵ (ڕەمز) دەبینرێ. بەڵام ناتوانیت ئەو (مێشك شۆڕی) یە لەگەڵ گیانەوەردا ئەنجام بدەیت. گەر قەناعەت بە کەسێك بکەیت کە لەبەر مەترسیی هەڕەشەدایە، کاردانەوەی بەوجۆرە دەبێ کە لە کاتیمەترسییەکە خۆیشیدا دەری بڕێت. ئێمە ئاشناین بەوەی کە چۆن وا لە مرۆڤ ئەکرێ قەناعەت بکات کە لەبەردەم مەترسیدایە و چۆن ئامادە بێت بۆ جەنگ. (پێ وتنەوە) لە توانایدایە شەڕەنگێزیی پێویست لە مرۆڤدا بزوێنێت تا بۆ جەنگ هانی بدات.. هۆی سێیەم ئەوەیە کە مرۆڤ هەندێ بەرژەوەندیی تایبەتیی هەیە، کە ئەو بەرژەوەندییانە پەیوەندییەکی توندو تۆڵیان بەبەهاو ئامانج و ئەو بیرو باوەڕانەوە هەیە کە ناسنامەی ئەو کەسە پێك دەهێنن. لەبەر ئەوە هێرش کردنە سەر ئەو ئامانجانە، یا ئەو کەسانەی ڕۆڵێکی گەورەیان لە ژیانی ئەو مرۆڤەدا هەیە، یا بیرو باوەڕی، بە هێرش کردنە سەر ژیانی ئەو مرۆڤە یا سەرچاوەکانی گوزەرانی ئەژمێردرێ. شتی (پیرۆز) لە ژیانی ئادەمیزاددا زۆرە: ئازادی، کەرامەت،دایك و باوك، منداڵ، وڵات، ئاڵا، دەوڵەت، ئایین و هەروەها خوا.. هەر یەکێك لەمانە ئەشێ بە قەدەر بوونی ئەو مرۆڤە خۆی لای گرنگ بێت ، هەر بۆیە کاتی هەڕەشە کردنە سەر یەکێك لەوانە: کاردانەوەکەی توند و تیژ ئەبێ. بەڕەچاو کردنی ئەو سێ هۆیەی سەرەوە لامان ڕوون ئەبێتەوە کە بۆچی شەڕەنگێزیی بەرگرییانە لای ئینسان لە شەڕەنگێزیی گیانەوەر بە هێزترە. ئەگەر چی میکانیزمی توندو تیژی لە ئینسان و گیانەوەردا وەکو یەك وایە" بەڵام مرۆڤ لە گیانەوەر زیاتر هەست بە مەترسیی هەڕەشە دەکات- یان ڕووداوی جیا جیا بە هەڕەشە لە قەڵەم ئەدات..

یەك جۆر شەڕەنگێزیی بەرگرییانە لای مرۆڤ و گیانەوەر هەردووکیان هەیە لە کاتی بەرگری کردن لە بەرژەوەندییەکانی ژیانیان.. بەڵام لە مرۆڤدا جۆری تریش

هەیە کە سەرچاوەیەکی بایۆلۆژیکی نییە و بۆ بەرگری لە خۆکردن نییەو بەڵکو پەیوەستە بە سروشتی ئادەمیزاد خۆیەوە..

هۆیەکانی پەیدا بوونی ئەو جۆرە شەڕەنگێزییە ئاڵۆزەو بواری قسە لەسەر کردنیان نییە. لێرەدا تەنها سەبارەت بە خاڵی سەرەکی لەو دیاردەیەدا ئەدوێنین کە ئەویش خووی سادیستیکانەیە.

بەگشتی کاتێ باسی سادیزم دەکەین یەکسەر جۆرێك لە ناوێزەیی سێکسی بە خەیاڵماندا دێ. پیاوێك دێتە پێش چاومان کە تا بە کوتەك لە ژنێك نەدات یا بەجۆرێك لە جۆرەکان ئازاری نەدات، مەیلی سێکسیی ناجوولێت. سادیسم بە ئازاردان و ئەزیەت دانی خەڵکیش دەوترێ. گەوهەری مانای سادیسم واتە دەسەڵات و کۆنترۆڵی تەواو و ڕەها بەسەر بوونەوەرێکی زیندووی تردا.. ئەشێ ئەو بوونەوەرە گیانەوەر، یا منداڵ یا کەسێکی گەورە بێت" کە کەسێکی سادیستیك ئەیەوێت بیکاتە موڵکی خۆیو بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە..

گەر کەسێك بتوانێت وا لە یەکێکی تر بکات هێزی بەرهەڵستیی لا بکوژێت و ناچار بە ئازار چەشتنی بکات" ئەوا توانای کۆنترۆڵ کردنی تەواوی ئەو کەسەی هەیە. بەڵام ئەمە تاقە شێوەی سادیسم نییە. شێوەی جۆراوجۆری تری لە مامۆستایان و بەندیەوان و کەسانی تردا دەبینینەوە.. ئەم جۆرە سادیسمە گەرچی بە مانای تایبەتی وشەکە سادیسمی سێکسی نییە" پێی دەوترێ سادیسمی گەرم و شەهوانی. بەڵام باوترین شێوەی سادیسم(سادیسمی سارده) کە ئەگەر چی جۆرێکی شەهوانی نیەو پەیوەندی بە مەسەلە سێکسییەکانەوە نییە، هەمان ئامانجی هەیە واتە دەست بە سەرا گرتن و کۆنترۆڵ و دەسەڵاتی تەواو بەسەرکەسێکی تردا" وەك ئەو قوڕەی چۆنی بوێت و چیی بوێت ئەوەی لێ دروست دەکات. تەنانەت سادیسم هەیە ئاوێتەی میهرەبانییە" کە هەموو پێی ئاشناین و ئەشێ لە هەر کەسێکدا هەبێ. بەڵام لە نێو دایکان و سەرۆکەکاندا زیاتر باوە. ئەمجۆرە ئادەمیزادە بەمەبەستی چاکەخوازی نەك ئازاردان، کەسێکی تر دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو ئامۆژگارییەکانی خۆی بەسەردا دەسەپێنێت.

دەشێ ئەو ئامۆژگاریانە لە ڕاستیدا بۆ چاکەی ئەو کەسەش بن. بەڵام ئازادیی ئەو کەسە زەوت دەکات.پەیوەندیی باوك یا دایك بە منداڵەکانیانەوە بە زۆری لەم جۆرەیانە. هەڵبەتە ئادەمیزادە سادیستیکەکە خۆی لەو ڕەفتارەی خۆی بە ئاگا نییە. چونکە (نیازی باشە) تەنانەت تەرەفەکەی تری ئەمجۆرە پەیوەندیەش هەر لەوە بێ ئاگایە" چونکە لەو ئامۆژگارییانە سوود وەردەگرێت، بەڵام نازانێت کە ڕۆحی ئەزیەتی پێ دەگات و دەبێتە کەسێکی گوێ ڕایەڵی فەرمان جێبەجێکەرو ئازادیی خۆی لە دەست دەدات..

(کالیگۆلا) ئیمپراتۆرەکەی ڕۆما نموونەی کەسێکی لە ئەندازە بەدەر سادیستە، کە ویستوویەتی ببێتە خوا. کالیگۆلا فەرماندەیەکی بەهێز بوو کە دەسەلاتەکەی بێ سنوور بوو. ڕەنگە سەرەتا جیاوازیی لەگەڵ ئەوانی تردا نەبووبێت" بەڵام دەسەلاتە بێ سنوورەکەی وای لێ کرد خۆی بە کەسێکی جیا بزانێت.. یەکەمین کاری دەسدرێژی کردنە سەر ئابڕووی هاوسەرانی هاوێکانی بوو. ئەوان بەو پەیوەندیە ناشەرعیەی نێوان ئیمپراتۆرو ژنەکانیان نەدەزانی. کەچی ئیمپراتۆر خۆی لەوە ئاگاداری کردنەوە.. ئەو کەسانەی بەو جۆرە دەسدرێژی دەکرایە سەر نامووسیان: جگە لە مەرایی و پیا هەڵدانی کالیگۆلاو دەم دروونەوەو بەسەر خۆدا زاڵبوون" هیچ چارێکی تریان نەبوو.. مەگەر دەستیان لە گیانی خۆیان بشتایە – وەختێ نارەزامەندیشیان پیشان بدایە" فەرمانی کوشتنیان بەسەردا ئەدرا – ئیمپراتۆر بێ پەروایانە فەرمانی کوشتنی ئەدا" چونکە کوشتن بەڵگەی دەسەلاتی موتلەق بوو بەڵام ئەو دەسەلات و ئارەزووی موتلەقی فەرمانڕەواییەش هێشتا حەزو خولیای ئەوی دانەدەمرکاندەوە. چونکە توانای کوشتنیش سنووری هەیە. ئەلبێر کامۆ لە نمایشنامەکەی خۆیدا ئەم ئارەزووە بۆ دەسەلاتی موتلەق وەك ئارەزوویەکی سیمبۆلیك بەرجەستە دەکات و لە شێوەیەکی جواندا پیشانی دەدات.

کالیگۆلا دەیەوێت مانگی چنگ بکەوێت( بە پێچەوانەی ئەمڕۆ کە مرۆڤ دەمێکە پێی خستۆتە سەر مانگ، ئەوسا ئەمە شتێکی مەحاڵ بوو)

ئارەزوومەندی دەسەڵاتێك بوو كە هیچ ئادەمیزادێك نەیبێت. دەیووت من خوام. دەسەڵاتم بەسەر هەموو كەسێك و هەموو شتێكدا هەیە و هەرچی‌یەكم بوێت دەیكەم.

كەسێك ئارەزوومەندی دەسەڵاتی وەها بێت، پەنا بۆ فرت و فێڵ دەبات و دەیەوێت سنووری توانای بە شەری ببەزێنێت. چونكە دەرچوون لەو سنوورەش دەرچوونە لە هەلومەرجەكانی بوونی مرۆڤ، بۆیە ئارەزومەندی دەسەڵاتێك كە بەدەربێت لە سنووری توانای مرۆڤ" رووبەرووی مەرگ دەبێتەوەو مەرگ بۆی دەسەلمێنێت كە تا چ رادەیەك بەرامبەر سروشت لاوازو بێ دەسەڵاتە. كامۆ ئەوەمان پیشان ئەدات كالیگۆلا بەر لەوەی شێت بێت جیاوازیی لەگەڵ كەسانی تردا نی‌یە، بەڵام چونكە دەیەوێت لە سنوورەكانی بوونی ئادەمیزاد تێبپەرێت دوچاری شێتی دەبێت.هەر كەسێكی تریش مەبەستێكی لەو جۆرەی هەبێت" هەمان چارەنووس چاوەرێی دەكات و رێی گەرانەوەی بۆ دونیای مرۆڤ لە دەست دەدات. لەم نموونەیەوە تێ دەگەین كە شێتی بە مانا باوەكەی نەخۆشی نی‌یە" بەڵكو رێگایەكە بۆ چارەسەری مەسەلەی ژیانی ئادەمیزاد. شێت كەسێكە كە نكوولی لە لاوازیی‌ئادەمیزاد دەكات.. ئەو لاوازیەی دەبێتە مایەی ئازارو ئەشكەنجەی مرۆڤ، چونكە لە دونیای خەیاڵدا سنوورێك بۆ دەسەڵات و توانای ئادەمیزاد بەدی دەكات... بەڵام چونكە ئەو لاوازی‌یە راستی‌یەكەو هەیە..نكوڵی كردن لێی و سوور بوون لەسەر بەزاندنی ئەو سنوورانە ئینسان بەرەو شێتی ئەبات.. شێتی هەوڵێكە بۆ نەفی كردن و نكووڵی كردنی لاوازیی ئادەمیزاد لەرێی (بەخۆ وتنەوەوە) تا مرۆڤ خۆی قەناعەت پێ بكات كە ئادەمیزاد بوونەوەرێكی لاوازە.. تا پەنجا ساڵ لەمەوبەر وا دەزانرا كە كالیگۆلاكان تەنها لە مێژووی رۆمادا هەبوون.بەڵام سەدەی بیستەم كۆمەڵێك كالیگۆلای نوێی بە ئێمە ناساند. لە ئەوروپا، لە ئەمەریكا، لە ئەفەریقیا و لە هەموو شوێنێكی دی. ئەوانە هەموو یەك نموونەن و قاڵبێكیان هەیە. ئەمانە هەموو تامی دەسەڵاتی بێ سنوور دەكەن و، پاشان بە نكووڵی كردنی سنووری سروشتی‌ی دەسەڵات روو لە رێگای

چارەسەری مەسەلەی ژیانیان دەکەن. ئەمەش بە روونی لای هیتلەرو ستالین دەبینینەوە.. ئەمانە هەردووکیان گاڵتەیان بە سنوورەکانی بوونی ئادەمیزاد دەهات و دوچاری شێتی بوون. خۆشبەختانە زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئارەزووی سادیستیکی کۆنترۆڵی تەواوی خەڵکیان لا زاڵە، تەنها بواری ئەوەیان لەبەردەمدایە بە شێوازە نەرمترەکانی سادیسمی سارد بسرەوێن. هەندێ لە دایکان و باوکان رەفتاریان لە گەڵ منداڵەکانیاندا سادیستیکەو هەوڵ ئەدەن تەواو کۆنترۆڵیان بکەن. زۆرن ئەو منالانەی بۆ چارەسەری ئاسەواری لێدانی دایك و باوکیان رەوانەی نەخۆشخانەکان ئەکرێن.بە پێی یاساو داب و نەریت، باوك و دایك بۆیان هەیە پەنا بۆ هەموو شێوازەکانی پەروەردەکردن بەرن تەنها لێدانی قورسی لێ دەرچێت.ئەکرێ چەندان کتێب دەربارەی رەفتاری سادیستیکی دایکان و باوکان لەگەڵ منالەکانیان دا بنووسرێ. ئەو جۆرە رەفتارە لە پۆلیس و ، پەرستارو، بەندیە وانەکانیش دا دەبینرێ. کە خۆشبەختانە ئەو دەسەلاتەی کالیگۆلایان نىيە،چونکە ئەمانە دەبێ گوێ رایەڵی فەرمانی گەورەکانیان بن و، وەکو بورغوویەکی ناو مەکینەیەکی گەورە وان و کەمتر لە تواناياندایە تەعبیر لەو مەیلەیان بکەن. بەلام ئەو مەیلەیان لە رەفتاریاندا لەگەڵ منالان و، نەخۆشەکان و، بەندیە وانەکان بە ئاشکرا دیارە. هەڵبەتە من ناڵێم کە زۆربەی مامۆستاو پەرستارەکان سادیستن، بە پێچەوانەوە زۆر لە خەڵکی هۆگری هەستی قووڵی رۆحی هاریکاریی مامۆستایەك یا پەرستارێك دەبن.. من مەبەستم ئەم گرووپە مرۆڤ دۆستە نىيە. بەڵکو ئەو کەسانەی ئەنگێزەی سادیستیکی شاراوە یان لا هەیەو لەو بوارەدا کار دەکەن.. بەلام خۆشیان نازانن کە لە پشت ویژدانی بە ئاگایانەوە ئارەزوو. مەیلی کۆنترۆڵ کردنی خەڵکی تر خۆی حەشار داوە..
ئارەزووی سادیستیك لای لێپرسراوانیش هەیە. نموونەیەك دەهێنمەوە کە بێگومان بەسەرتاندا تێپەریوەو دیوتانە. کارمەندێکی بچووك بهێنەرە بەرچاوی خۆت کە لە پشت پەنجەرەی فرۆشتنی پوولی پۆستەوە دانیشتووە.. پانزدە کەس ریزیان بەستووە و بە نۆرە کاری پۆستیی خۆیان ئەنجام دەدەن، دوو کەس

ماون پـوول بکـرِن و زەنگـی کۆتـایی دەوام لێ دەدرێ. لـەم کاتـەدا زەردەخەنەیـەك لەسـەر لێـوی کارمەندەکـە نـەخش دەبـێ کـە زەردەخەنەیـەکی سادیسـتانەیە.. خۆشحاڵە بەوەی کە ئەو دوو کەسە بە دەستی بەتاڵەوە فەرمانگەی پۆستە جێ دەهـێڵن. شـانازی بەخۆیـەوە دەکـات کـە ئەوەنـدە توانـای هـەبوو ئـەو دوو کەسـە نائومێد بکات و کارەکەیان دوا بخات و ناچاریان بکات سـبەینێ دووبارە بێنـەوە. ئەو کارمەندە ئەگەر لە دوو سـێ دەقیقەی تـری کـاتی خـۆی ببووردایـە، ئـەیتوانی کـاری ئـەو دوو هاووڵاتیـیەش رایـی بکـات، بـەڵام نـەیکرد. داخسـتنی پەنجـەرەی فرۆشـتنی پوولەکـە لـەو سـاتەدا کـە زەنـگ لێ دەدات لەبـەر ئـەوە نییـە کـە ئـەو کارمەنـدە زۆر وا بەسـتەیە بـە رەچـاوکردنی کـاتی دەوامـەوە، بـەڵکو لەبـەر ئـەو لەزەتەیە کە لە ئەنجامی ئەو کارەیەوە تامی دەکات. گەرچی ئەو کارمەندە بەم کارەی مووچەی زیادی نادرێتێ، بەڵام ئەو جۆرە کارە سادیستسانەیەی بەقەدەر بە پارە لەزەتی پێ دەبەخشێت و ناتوانێت بەبێ ئەو کارانە هەڵ بکات.

ئێسـتاش نموونەیـەکی تـری کەسـی سادیسـت دەخەمـە روو کـە کـاری لـەوە خـراپتر ئـەنجام دەدا، هـاینریش هیملـەر) سـەرۆکی رێکخـراوی ئـێس..ئـێس ی ئەڵـەمانیای نـازی** نامەیـەکی بـۆ ئەفسـەرێکی پایـە بـەرزی .S.S.. کـە نـاوی ئەدالیبێرت کۆتۆلینسکی یە نووسیوەو تیایدا دەڵێت:-

( کۆتۆلینسکیی ئازیز. تۆ بەهۆی ناساغیی دڵتەوە تەواو نەخۆشیت. لەبەر ئەوە و بەمەبەستی سەلامەتیی تۆ فەرمانت بەسەردا ئەدەم کە تا دوو ساڵ جگەرە نەکێشیت. پاشان دەبێ راپۆرتی پزیشکەکەت دەربارەی باری دەروونیی خۆت پیشانی من بدەیت. ئەوسا و من بە گوێرەی ئەو راپۆرتە پێت دەڵێم کە دەست بە جگەرە کێشان بکەیتەوە یا نەکەیتەوە.بژی هیتلەر.).. ئەم فەرمان پێدانە جگە لە گیـانی خۆسـەپاندن نیشـانەی سـووك تەماشا کردنیشـە.. رەفتـاری هیملـەر لەگـەڵ ئەو پیاوەدا وەکو رەفتاری بەرێوەبەری خوێندنگە وایە لەگەڵ قوتابی خوێندنگەی سەرەتاییدا.

سووکایەتی پێکردن لەو نامەیەدا ئەنقەستە ئەوەتانێ هیملەر دەیەوێت تەواو ئارەزووەکانی خۆی بەسەر کۆتۆلینسکیدا زاڵ بکات. ڕێی پێ نادات بە ڕاوێژی پزیشکەکەشی کار بکات و ئەوە بەخۆی ڕەوا دەبینێ کە ئەبێ بە پێی ئامۆژگاریەکانی ئەم هەڵسوکەوت بکات.. هیملەر تەنانەت دەسەڵاتی پزیشکەکەشی بۆ خۆی زەوت دەکات. خاسیەتێکی تر لە خاسیەتەکانی دەسەڵاتداری سادیست ئەوەیە کە خەڵك وەکو ( شت) تەماشا دەکات و هەر لەو ڕوانگەیەشەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکات و ، پەیوەندیی لە گەڵ خەڵکدا پەیوەندیەکی ئینسانی نییە، ئەمەو تەنها کەسانی بەسەزمان و کلۆڵیش هەستی سادیستی لای لێپرسراو دەبزوێنن، نەك کەسانێك کە توانای بەرگری لە خۆکردنیان هەیە ،ئادەمیزادی سادیست لە ئاست هێزێکی لە خۆی بالا دەست تردا لاواز و زەبوونە- بەڵام ئەو کەسانەی بێدەسەڵاتن یان ئەکرێ زەلیل بکرێن- منالّ، نەخۆش، یان لە هەندێ حالەتدا یاخیبووی سیاسی .. ئەو دەکەن بە شێر ( کەسی سادیست بە پێچەوانەی خەڵکانی میانڕەوەوە) هەستی سۆزو بەزەیی لا نییە. ئامانجی ئەو خەڵکانێکە کە توانای بەرگرییان لا نامێنێت. چونکە بە شێوازێکی توند و تیژانە،کۆنترۆڵی ڕەهای خۆی بەسەر ئەواندا ئەنجام ئەدات.لە خاسیەتەکانی تری کەسی لێپرسراوی سادیست ئەوەیە لە ئەندازە بەدەر بایەخ بەشیك پۆشیی خۆی دەدات. لای ئەو ڕێکوپێکی هەموو شتێکە، ڕێکوپێکی تاقە شتێکە کە دەتوانین لە ژیانمان دا بە دڵنیاییەوە بەسەریدا زاڵ بین. ئەو کەسانەی کە زیاد لە پێویست پێویستیان بە ڕێکوپێکییە لە ژیان دەترسن. چونکە ژیان خۆی ڕێك و پێك نییەو پڕە لە پێشهاتی لە پڕو ناکاو،مردن مەسەلەیەکی حەتمیە، بەڵام لە ژیان دا کۆمەڵێك ڕووداوی تری نوێ هەیە.. سادیست ناتوانێ لەگەڵ کەسانی تردا پەیوەندی بەقەرار بکات. بەچاوی (شت) ەوە تەماشای خەڵك و شتەکان دەکات.. ڕقی لە هەموو زیندەوەرو بوونەوەرێکە، چونکە هەست دەکات، ئەوانە بۆ ئەو سەرچاوەی هەڕەشەن...

یەکێك لە سیفەتەکانی هیملەر ئەوە بوو کە دەفتەرێکی بیرەوەریی هەبوو لە چواردەساڵیەوە تا دەساڵ وردو درشتی بیرەوەریەکانی خۆی دەنووسیەوە: فلانە رۆژ سەعات ئەوەندە نانی خوارا، یا شەمەندەفەرەکەی لەکاتی خۆیدا هات، یان دواکەوت.. هەموو شتێکی لەو دەفتەرەدا دەنووسیەوە. هەروەها فایلێکی بۆ نووسینە تایبەتیەکانی خۆی هەبوو. رێکوپێکی بەم مانایە، واتا رێکوپێکەی کەسێکی کۆنە پەرست کە ژیان بەلایەوە بێ مانایەو هەموو شتێك لە رێکوپێکی و بڕیارەکان دا خۆی دەبینێتەوە. لەم رووەوە قسەکانی ئایشمان ( تاوانباری نازیو سەرۆکی کوورەکانی سووتاندنی مرۆڤ لە جەنگی جیهانیی دووەم دا) لە لێپرسینەوەکەیدا جێی سەرنج و قووڵبونەوەن. دەروون پزیشکێکی مرۆڤ دۆست لێی دەپرسێت کە ئایا لە ژیانیدا هەستی بە گوناه کردووە.. لە وەڵامدا دەڵێت:- (بەڵێ دوو جار لە خوێندنگە رام کردووە) ئایشمان کوشتنی ئەو هەموو مرۆڤە بێ گوناهە بە تاوان نازانێت و لەم هەستەی خۆیشیدا راستگۆیە، چونکە ئەو تەنها سەرپێچی کردن لە بڕیارەکان بە گوناه دەزانێت و بەس.

دوا خاسیەتی کەسی سادیست سووکیە.. سادیست دەیەوێت فەرمان بەسەر کەسانی لە خۆی لاوازتردا بدات. بەڵام دەیەوێت خۆیشی تەسلیم بە لە خۆی بەهێزتر بکات و بەبێ ئەوە ژیانی مەحاڵە. بۆ نموونە هیملەر وەکو بت هیتلەری دەپەرست. گەر سادیست نەتوانێ خۆی تەسلیم بە کەسێکی لە خۆی بەهێزتر بکات، ئەوا خۆی تەسلیم بە مێژوو، بە رابردوو، بەهێزەکانی سروشت، یا هەر هێزێکی تر کە لە خۆی بەهێزتر بێت دەکات. بەڵام قانوونی هەمیشەیی کەسی سادیست ئەوەیە کە:- ئەبێ ملکەچ بم، ئەبێ خۆم تەسلیم بە هێزێکی لەخۆم گەورەتر بکەم، هەر هێزێك بێت. بەڵام ئەبێ فەرمان بەسەر ئەو کەسانەدا بکەم کە لە خۆم بێهێزترن و بەسەریاندا زاڵ بم. ئەمە سیستمی سادیسمی دەسەڵاتداری و سادیستی ساردەکە بەو سیستمە دەژی. کارل بوکهارت نوێنەری کۆمەڵگای دەوڵەتی لە(دانزیگ) دەربارەی هیملەر نووسیویەتی و دەڵێت:-( ئەو کەسە بە ملکەچێتی و بە ویژدانی دەمار گرژانەیو، بە دیسپلینی نامرۆڤانەیو بە شێوازو

ڕەفتاری ئامێر ئاسای کاریگەریەکی سامناکی لەسەر ئادەمیزا د هەبوو.) ئەمە وەسفێکی وردی سادیستی ساردە. ئەکرێ بپرسن ئایا ئەگەر هیملەر لەو پلەو پایەیەدا نەبووایەو ئەندامی حیزبی ناسیونال سۆسیالست نەبووایە، خاوەنی ڕەفتارو کەسێتی‌یەکی دی نەدەبوو؟!—ئەشێ لەم حاڵەتەدا وەڵامەکە وەهابێت کە ئەوسا دەبووە کارمەندێکی نموونەیی دەوڵەت و، ئەو دەمە لەڕێو ڕەسمی ناشتنی تەرمەکەیدا سەرۆکەکەی دەیوت: (ئەم خوالێخۆشبووە باوکێکی باش بووە مناڵەکانی خۆی خۆش دەویست و هەموو تواناو وزەی خۆی بۆ کارەکەی و دائیرەکەی تەرخان دەکرد..) لە ڕاستیدا هیملەر بەم جۆرە بوو.. ئەبێ ئەوەش بڵێین کە کەسی سادیستیش پێویستی بەوە هەیە قەناعەت بە خۆی بکات کە ئەمیش مرۆڤەو لە توانایدایە وەك مرۆڤ ڕەفتار لەگەڵ خەڵك دا بکات. ئەگەر کەسێك نەتوانێ قەناعەت بە خۆی بکات کە ئەویش مەودایەکی ئینسانی‌ی تێدایە ڕوو لە شێت بوون ئەبێ، چونکە دووچاری گۆشەگیری ئەبێو، لە کۆمەڵگا تەریك ئەبێو، ئەمەیش موسیبەتێکی گەورەیەو بەرگەگرتنی سەخت و دژوارە..بەڵگە نامەکان ئەیسەلمێنن کە ژمارەیەکی زۆر لە مەئمورانی لە سێدارەدانی زیندانی‌یە سیاسی‌یەکان کە زۆربەیان جوولەکە یا ڕووس بوون، دوچاری شێتی دەبوون و یان خۆیان دەکوشت و یان تووشی نەخۆشی دەروونی ئەبوون. فەرماندەی یەکێك لە یەکەکانی لە سێدارەدان و کوشتن نووسیویەتی کە دەبووایە مەئمورەکانی یەکەی کوشتنمان قەناعەت پێ بکردنایە کە شێوازەکانی لە ناوبردنی جوولەکەکان، واتە ریزکردنیان لەبەر دەم تیمی گوللە بارانکەردا، یان ڕەوانەکردنیان بۆ کوورەکانی سووتاندنی ئادەمیزاد کارێکی ئینسانی‌یەو جێبەجێکردنی یاساو ڕێسای سەربازیە، ئەگینا هاوسەنگی‌ی دەروونییان تێك دەچوو. بە باوەڕی من ئەتوانین بڵێین کە ژمارەی هیملەرەکان زۆرن و کەسانی سادیستی زۆر هەن کە بە ڕواڵەت سادیست نین چونکە هەلیان بۆ نەڕەخساوە. بەڵام لە هەمان کاتدا ناتوانین بڵێین کە لە دەروونی هەر یەکێك لە ئێمەدا هیملەرێك

ئامادەیەو یان مەیلی سادیستیمان هەیەو دەرفەتمان بۆ بڕەخسێ دەس بەکار دەبین.

ئەوەی ئەمەوێ دووپاتی بکەمەوە ئەمەیە:- دوو جۆر بونیادی سروشت(تەبیعەت) ی مرۆڤمان هەیە، یەکێکیان سادیستیك و ئەوی تریان نا سادیستیك.

کەسانی سادیستیك بۆیان بڕەخسێ ئەو ڕەفتارەیان ئاشکرا دەبێت، بەڵام دەستەی دووەم تەنانەت گەر دەرفەتیشیان بۆ بڕەخسێ خاوەنی ئەو سروشت و ڕەفتارە نین، کەواتە ئەبێ بە ڕەچاوکردنی ئەم مەسەلەیە کەسانی سادیست جیا بکەینەوە، هەروەها میهرەبانی لەگەڵ منداڵان و پاراستنی گیانەوەرانیش مەرج نین بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە بێ بەرییە لە سروشتی سادیستیکانە. ئەبێ تەماشای ئەو دیوی هۆش و ویژدانی بە ئاگای مرۆڤ و ئەنگێزەکانی ڕەفتاری بکەین. ئەبێ توخمەکانی بونیادی سروشتی بدۆزینەوە. پەی بردن بە خوو و سروشتی خودیی کەسان و فریو نەخواردن بە شتە ڕواڵەتیەکان ڕێ هەموار دەکات بۆ بە دەست هێنانی ئەنجامی باش و سەرکەوتن لەم بوارەدا چ لە ژیانی تاکە کەس و چ لە ژیانی سیاسیدا.

گەر خەڵکی پێشتر سروشتی ڕابەرو سەرکردە سیاسییەکانی خۆیان بناسن و لەوە ئاگادار بن کە ئایا کەسانێکی سادیستن یان نەء ئەو دەمە دەتوانن ڕێ لە زۆر کۆستی گەورە بگرن.

# خـــــەون:
# زمانی گشتیو هاوبەشی مرۆڤ

هەموو لەو باوەڕەداین کە تەنها بەیەك زمان تەواو هۆگرین، کە ئەویش زمانی دایکە، بێگومان مرۆڤ دەتوانێ فێری چەند زمانێکی بێگانەش بێت، بەڵام سەرنجی ئەوەمان نەداوە کە هەمووومان بەزمانێکی دیکەش لەگەڵ یەکدا دەدوێین کە ئەویش زمانی خەونە، ئەو زمانەی شایانی سەرنجدانە. زمانی خەون زمانێکی گشتییە، کە لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی ئادەمیزادو هەموو کەلتورەکاندا هەبووە، زمانی خەونی مرۆڤی سەرەتایی، زمانی خەونەکەی فیرعەون کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووەو زمانی خەونی کەسێ کە لە شتوتکارت یانیویۆرکە یەك زمانن، ئێمە هەموو شەوێ بەو زمانە دەدوێین، گەرچی عادەتەن خەون لەبیر دەچێتەوەو لەئەنجامدا وادەزانین کە خەونمان نەدیوە، بەڵام هیچ خەوێك بێ خەون نییە.

تایبەتمەندێتییەکانی زمانی خەون چین؟ بێگومان دیارترینیان ئەوەیە کە زمانی خەوە، لەوانەیە ئێمە تەنها لەجیهانی خەودا بتوانین بەفەرەنسایی قسە بکەین بەڵام لەبێداریدا نەتوانین لەیەك وشەی تێ بگەین تایبەتمەندێتیەکی دی ئەوەیە کە زمانی خەو زمانێکی رەمزییەو لەشتە بینراو هەستپێکراوەکان سود وەردەگرێ تاگوزارشت لەئەزموونەکانی ناوەوە بکات، هەروەکو ئەوەی لەئەدەبدا باوە، ئەگەر لەدەقێکی ئەدەبیدا چاومان بەم دێرە بکەوێ: (گوڵە سوورەکە دڵی گەرم کردم...) هەرگیز ناڵێین کە مەبەستی نووسەر ئەوە بووە کە هەوا گەرم بوە،

بەڵکو ئەو ئاماژە بۆ هەستو ئەزموونێك دەکات کە لەرێی ئامرازی هەستپێکراوی ماددیەوە دەگەیەنرێ.

رەنگە گێرانەوەی خەونێکی سەیر مەبەستەکەم روون بکاتەوە، سیگمۆند فرۆید ئەم خەونەی دیوە کە زۆر کورتەو دەربارەی کۆمەڵێ گژوگیای وشکەوە بووە. فرۆید لەخەونیدا کۆمەڵێ گژوگیای وشکی بینی کە گوڵێکی وشکەوە بوو لەناویاندا بوو، ئەمە هەموو خەونەکەی بوو، ئەو خۆی لەلێکدانەوەی خەونەکەیدا دەڵێ، ئەو گوڵە وشکەوە بووە هەمان ئەو گوڵەیە کە هاوسەرەکەی داوای لێ کردووە، ئەو هەمیشە گلەیی لەفرۆید کردووە کە هەرگیز گوڵێکی بەدیاری نەداتێ، لەسەرێکی تریشەوە گوڵ پەیوەندیەکی لەگەڵ کۆکایینیشدا هەبوو، فرۆید تازەو هاوکات لەگەڵ دۆزینەوەی بەکارهێنانی ئەو مادەیەدا لەکاری پزیشکیدا بەکۆکاین ئاشنابوو بوو، گوڵەکە لەناو گژوگیاکاندا سیمبولێکی سادە بوو بەلاّم مانایەکی گرنگی هەبوو کە گوزارشتی لەلایەنێکی سەرەکیی کەسێتیی فرۆید دەکرد، گوڵ سیمبولی خۆشەویستیو مەیلی سێکسیو ژیانە، بەلاّم ئەو گوڵە وشکەوەبووە تەنها لەلێکۆڵینەوەی زانستیدا بەهای ماوەتەوە، نەك ئەوەی شکۆفەی کردبێتو مژدەی ژیان بدات، ئەگەرچی فرۆید مەسەلە سێکسیەکانی بەبابەتی لێکۆڵینەوەی زانستی دادەنا، بەلاّم لەژیانی تایبەتیدا تابلێی خۆی کابرایەکی شەرمن بوو، لەنامەیەکیدا کە لەچلو شتێك ساڵی تەمەنیدا بۆ هاورێیەکی نووسیوە، سەرسورمانو شەیدایی خۆی بۆ جوانیو دلڕفێنیی ئافرەتێك دەربریوە، ئەم نامەیە بۆمان ئاشکرا دەکات کە فرۆید لەو تەمەنەدا چۆن بیری کردۆتەوە، لەکاتێکدا هیچ پیاوێك لەو تەمەنەدا بەرامبەر جوانیی ئافرەتێك تووشی ئەو حاڵەتە نابێ، بەم پێیە هەمان گوڵی وشکەوەبوو رەمزێکە بۆ سروشتی فرۆیدو ئەگەر بمانەوێ لەسەر ئاماژەکانی گوڵە وشکەوەبووەکە بنوسین ئەوە بەچەندەها لاپەرە تەواو نابێ.

یەکێك لەئەدگارەکانی دیکەی زمانی خەون ئەوەیە کە لەکاتی خەون بینیندا زیاتر شارەزای خۆمانو خەڵکی تر دەبین وەك لەبێداریدا، دەشێ لەدونیای

خەوندا نامەنتیقی تر بین، بەڵام لەڕوویەکی ترەوە ئاڵۆزترو وردترین لـەدەرك كردنـی شتەكاندا. خەونەكەی فرۆیدیش ئەم قسەیە دەسەلمێنێ. ئەو دانی بەوەدا ناوە کـە ئەو لایەنەی سروشتی خۆی کە خەونەکـە ئاشـکرای کردووە لـێی بـێ ئاگا بـووە، بەڵام لەخەودا پەیی بەچەمکی دوو لایەنەی خۆی بۆ سیمبوڵی ئەو خەونە برد.

ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بەلایـەنی رەمزیـی زمـانی خەوەنـەوە هـەبێ ئـەدگارێکی تریش هەیە کە کەمتر جێی سەرنج و پێلێنانی ئێمە بووە، زۆربـەی خـەڵکی (دەڵـێم –زۆربـەی خـەڵکی– بـەڵام ئامارێکمـان لەبـەر دەسـتدا نییـە، لەوانەیـە چاکتر وابـێ بڵێم زۆربەی ئـەو کەسـانەی هامشـۆی عیادەکـەی مـن دەکـەن) بەڕادەیـەك لـەدونیای خەونیانـدا داهێنـەرن کـە هـەرگیز لەبێداریـدا ئـەوەیان بـەبیردا نایـەت، هەیـدێ کەسانێك کە لەخەونیاندا چیرۆك و شیعرو ئەفسانەی وەها دەخولقێنن کە ئەگـەر وشـە بەوشـە بنوسـرێتەوەو بڵاوبکرێتـەوە هیچیان لەنووسـینەکانی کافکـا کـەمتر نییـە، لەگەڵ ئەمەشدا ئەگـەر بەیـەکێك لەوانـە بڵێیـت کـە لـە خەونیانـدا داهێنـەرن (کورتە چیرۆکێکم بۆ بنووسە لەچیرۆکەکانی کافکا بچێت) بەنیگایـەکی پـڕ ماناوە تەماشایەکت دەکات، لەراستیشدا ئەو لەکاتی ئاگاییدا ئەو توانایەی نییە، بەڵام لەخـەودا شـاعیرو هونەرمەنـدە، هەڵبـەت ئەمـەش ئـەوە ناگەیـەنێ کـە هونەرمەنـدی داهێنەر ئەبێ بخەوێ تا داهێنانی هەبێ، بەڵکو دەبێ لەبێداریدا داهێنەر بێ.

بـەڕۆژ لـەنێو کـەلتوورێکی دیاریکراوو بـاودا دەژیـن، زمانمـان زمـانی شـوێنی لەدایکبوونمانە، بێگومان کەسێك کە لـەناو هـۆزێکی راوچیـی ئەفریقاییدا لـەدایك بـووە خـاوەنی زمـان و شـێوە بیرکردنەوەیـەکی جیایـە، قسـەکانی ئێمـە تارادەیـەك لەلایـەن کۆمـەڵگاوە دارێـژراوە، بـەڵام لـە خەونـدا بەیـەك زمـانی گشـتیو هاوبـەش ئەدوێین، زمـانی کاتەکـانی ئاگـایی، زمـانی دایـك بـێ یـان بێگانـە، زمانێکـە کۆمـەڵگا دایناوە، بەڵام زمانی خەون زمانی گشتییە، زمانی هەموو ئادەمیزادێکە، نهێنیـی ئەو توانستەش لەچیدایە؟ لەخاڵێکەوە دەست پێ دەکەم کە بەڕواڵەت ئـاڵۆزە بـەڵام لەراسـتیدا زۆر سـادەیە: جیـاوازیی نێـوان خـەوو بێـداری، شـەوان و رۆژانـی ئێمـە بـەدوو حاڵـەت بەسـەر دەچـن، کـە هێنـد ئاسـاییو بەڵگەنەویسـتن، کـە بایـەخیان

نادەینێ، ماوەیەك بێدارین و چەند سەعاتێكیش دەخەوین، بێداری مانای چی‌یە؟ بێداری حاڵەتێكە كە پێویستە تیایدا بایەخ بەژیان بدەین، تیایدا كار بكەین، پێویستیەكانمان دابین بكەین، تیایدا بەرگری لەخۆمان بكەین، بەكورتی ئەبێ لەپێناوی مانەوەو پاراستنی خۆماندا تێبكۆشین، ئەم تێكۆشانە كار لەكردەوەو بیركردنەوەمان دەكات، چونكە دەبێ لەگەڵ خەڵكیدا تەباو گونجاوبین، دەبێ بەگوێرەی خواستەكانی كۆمەڵگا رەفتار بكەین تابتوانین بەكارێكەوە مەشغوڵ بین و سەرچاوەیەكی گوزەرانمان هەبێ، بەڵام لەهەموویان گرنگتر ئەو هەوڵەیە كە بۆ بەردەوامی‌ی ژیان دەیدەین و كاریگەریی لەسەر هەست و سۆزو چەمكە فیكریەكانی ئێمە هەیە.

لەبێداری‌دا ئەوەندە سەیری دەوروبەری خۆمان دەكەین كەژیان داوامان لێ دەكات: بەمەبەستی سوودوەرگرتن و بەكارهێنان دەبێ رەفتارمان مەنتیقی بێ (رەفتاری مەنتیقیش، واتە رەفتارێك كە لەنێوان خەڵكدا برەوی هەیەو باوە، هەركەسێكیش بەپێچەوانەی ئەوەوە هەڵسوكەوت بكات بەكەسێكی نائاسایی یان نەخۆشێكی رۆحی لەقەڵەم دەدرێ) تەنانەت فیكرو هەستیشمان دەبێ بەگوێرەی هی خەڵك بێ، هەموومان دایك و باوكانمان خۆش دەوێ و، باوەڕمان وایە كە ئەوان و پیاوچاكەكانی تری كۆمەڵگا چاكەی ئێمەیان دەوێ، بەمجۆرە خۆشمان باشترین كار ئەنجام ئەدەین و هتد....

ئێمە بەپێ‌ی هەڵوێستەكان شادو كامەران یا غەمگین و مەلوول دەبین. لەوانەیە لەراستیدا ئەو هەستانەمان لانەبێ، بەڵام لەبەر ئەوەی كاتێك بۆ خەم و كاتێك بۆ خۆشی دیاری كراوە ئەو هەستانە دێنە ئاراوە، لووتمان بەلووتی هەرشتێكدا بتەقێ بەشتێكی پووچ و بێ مانای نازانین چونكە لەو باوەڕەداین هەرچیەك كەپێویست بەبوونی نەبێ نی‌یە، چیرۆكەكەی هانز كریستیان ئەندرسن دەربارەی (جلو بەرگە نوێیەكەی ئیمپراتۆر) بەباشی ئەمە دەسەلمێنێ، ئیمپراتۆر رووت و قووتە، كەچی هەموو وادەزانن جلوبەرگی رازاوەی لەبەردایە، چونكە ئەمە ئەو شتەیە كە ئەوان باوەڕیان پێ‌یەتی، تەنها كوڕێكی بچكۆلە نەبێ كە هێشتا

بیروباوەڕی ئەو وەك هی گەورەكان لەقاڵب نەدراوە، دەتوانێ شا بەڕووتی ببینێ، هەر بۆیە ئێمە لە بێداری‌دا بەو جۆرە بیردەكەینەوە كە خەڵكی لێمان چاوەڕێ دەكەن.

باسی خەونێكی تر دەكەم كە هەمان خاڵ روون دەكاتەوە، ئەم خەونە هی كارمەندێكی پایەبەرز بوو كە تەنها بەقسەی سەرۆكی كۆمپانیاكەی خۆی دەكرد، ئەم كارمەندە لەدونیای بێداری‌دا دڵنیابوو لەوەی كە پەیوەندیی لەگەڵ سەرۆكەكەیدا زۆر باشەو، خۆشی دەوێت‌و هیچ گیروگرفتێك لەنێوانیاندا نییە، شەوێكیان لەخەونیدا سەیری كرد دەستەكانی بەكێبڵی تەلەفۆنەكەوە بەستراوەتەوەو تەلەفۆنەكەش بەسەرێكیەوە هەڵواسراوەو، سەرۆكەكەشی لەپەنایەكدا راكشاوەو خەوی لێ كەوتووە، ئیتر ئەمیش لەو بارەی خۆی تووڕە دەبێ‌و بەهەردوو دەستی چەكوشێك دەگرێ‌و توند دەیكێشێ بەسەری سەرۆكەكیدا، بەڵام ئازار بەو ناگات، بەڵكو سەرۆك چاوەكانی دەكاتەوەو بەتەوسەوە زەردەخەنەیەكی بۆ دەكات.

گەرچی ئەو كارمەندە بەخەیاڵی خۆی پەیوەندیی لەگەڵ سەرۆكەكەیدا باش بووە، بەڵام خەونەكە پیشانی‌دا كە لەڕاستیدا رقی لێ بۆتەوەو هەستی كردووە كە ئەم دەچەوسێنێتەوەو دەست‌و پێی بەستۆتەوە، لەئاستی سەرۆكەكەیدا خۆی بەبێ دەسەڵات‌و زەبوون دەزانێ، ئەم راستییە كە لەدونیای بێداری‌دا لەو شاراوەبوو لەخەوندا بۆی روون بۆوە.

جیهانی خەو چ شتێكمان پیشان ئەدا كە جیهانی بێداری ناتوانێ ئەنجامی بدا؟ ئێمە ئازادین، لەوانەیە ئەم قسەیە بەشتێكی زۆر روون‌و بەڵگەنەویست وەربیگرێ، بەڵام لەراستیدا ئێمە بەتەنها لەجیهانی خەوندا ئازادین، بەو مانایەی كە ئێمە تەنها لەكاتی خەوندا بۆ ژیان تێ ناكۆشین‌و پێویستمان بەهێرش‌و بەرگری یاتەبایی‌و گونجان نییە، هەزرو هەستمان لەناخمانەوە هەڵدەقوڵێ‌و دەروونییە، لەدونیای خەودا ناچار بەئەنجامدانی كارێك نین‌و تەنها دەتوانین هەبین، لەكاتی خەودا ئامانج‌و مەبەستێكمان نییە، بەو جۆرە هەست بەدونیا

دەکەین کە دێتە پێشچاومان، بەراستی دەیبینین، نەك بەجۆرێك کە ئێمە چاوەڕێی دەکەین تابەئامانجێك بگەین، بەواتایەکی دی دەتوانین بڵێین کە لەجیهانی خەودا ویژدانی بێ ئاگا بالادەستە، بێ ئاگایی زاراوەیەکی ناڕوون و ئالۆز نییە.. لەو حاڵەتەدا شتێکمان چنگ دەکەوێ کە لە دونیای بێداریدا چنگمان ناکەوێ، دەشێ بڵێین ویژدانی بێ ئاگا لەحاڵەتی بێداریدا هەمان ویژدانی بەئاگایە لەکاتی خەوداو بەپێچەوانەوە، کەواتە دوو جۆر ئاگایی یاویژدانی بەئاگامان هەیە، یەکێکیان لەکاتی بێداریو ئەوی دیکەیان لەکاتی خەودا.

ئایا ئەمە بەو مانایەیە کە لەخەودا لەدەست ئەقڵمان رادەکەین و زیاتر دوای غەریزەکانی خۆمان دەکەوین؟ هەندێ جار بەڵێ، بەلام نەك هەمیشەو زۆربەی جار، گەرچی فرۆید باوەڕی وابوو کە خەون هەمیشە هەلاتن لەئەقڵ دەکا بەگژ ئەقڵگەراییدا، بەلام هەروەکو پێشتر باسم کرد ئێمە لەخەونەکانماندا وردبینترو ئاقڵترین. لەبەر ئەوەی ئازادترین و چاوبەست نەکراوین و باشتر دەبینین و هەست دەکەین، تەنانەت لەخەویشدا خەونەکانی خۆمان سانسۆر دەکەین، ئەوەندە جورئەتمان نییە ئەو ئازادیە قبووڵ بکەین کە خەون دەماندائێ، هەر بۆیەشە پەیامە راستەقینەکەی دەشێوێنین و دەشارینەوە، رێك وەك ئەوەی بمانەوێ خۆمان لەیەکێك بشارینەوە. بۆیە زۆربەی خەونەکانی خۆمان فەرامۆش دەکەین، لەبەر ئەوەی زۆربەیان لەگەڵ دونیای بێداریماندا ناگونجێن و ئەگەر لەبیر خۆمانیان نەبەینەوە دەبنەهۆی ئازاردانمان.

لەدونیای خەوندا توانای داهێنانمان زیاتر دەبێ، توانای وامان لاپەیدا دەبێ کە لەکاتی بێداریدا هیچ ئاسەوارێکیان نییە، لەم بارەیەوە خەونی کابرایەکی بازرگانتان بۆ دەگێڕمەوە، ئەم کابرایە لەبەر ئەوەی لەئیش و مامەڵەیدا سەرکەوتوو بوو بەردەوام بەختەوەرو دەم بەپێکەنین بوو، شەوێکیان ئەم خەونەی بینی: لەدیمەنی یەکەمی خەونەکەیدا دەریاچەیەکی بچووك دەبینێ، دەریاچەکە پیسەو جەووەکەش تاریك و دڵگوشەر. پاش بینینی ئەو خەونە دێتەوە یادی کە

ئـەو دەریاچـەیە لـەو دەریاچـەیە دەچـێت کـە دایـك و بـاوکی لەنزیکیـەوە دەژیـان، هەروەها ئەو بیرەوەریـە ناخۆشـە خـانووە پەرپـووتەکەی ماڵی بـاوکی بیرخسـتەوە. لەدیمــەنی دووەمــی خەونەکــەدا ســەیر دەکــا لــەناو ئۆتــۆمبیلێکی ســپۆرتدا دانیشـتووەو، بەرێگایـەکی پـان و جـوانی بنـاری کێوێکـدا لـێ ی دەخـوڕێ، خێـرا دەڕواو هەســت بــەهێزو توانــاو ســەرکەوتوویی دەکــات و شــادمانە، لەدیمــەنی سێیەمدا دەگاتـە لووتکـەی کێوەکـە، لـەپڕدا خـۆی دەکات بەفرۆشـگایەکی وێنـەی ناشرین و ناپەسـەنددا، پێشـتر هاوسەرەکەشـی لەهـەمان ئۆتۆمبێلـدا لەتەنیشـتیەوە دانیشتبوو، بەڵام ئێستا تەنیایەو کەسێکیش لەوێ نی‌یە، هەموو شـوێنێك پـیس و خۆڵاوی‌یە، خۆی تەنیاو دەرکراو دێتە پێش چاو.

ئـەم خەونـە گوزارشـت لەهەسـتی راسـتەقینەی ئـەو بازرگانـە دەکـات سـەبارەت بەژیان و چارەنووسی خۆی، ئەو خەونە دەکرێ بەمجۆرە لێکبدەینەوە:

لەتافی مناڵیما دەورو بەرم پڕ لەبەدبەختی‌و نائومێدی بـوو، ئێسـتا کابرایـەکی سـەرکەوتووم. کـە بەخێراییـەکی سـەیر گەیشـتمە لووتکـەی سـەرکەوتن، بـەڵام لەکۆتاییدا، پاش ئەوەی ئەم یاریی سەرکەوتنە کۆتـایی دێ، دووبـارە دەگەڕێمـەوە بۆ هەمان دەوروبەری پیس و پڕ هەژاری، هـەمان گۆشـەگیریی تـافی منـاڵی‌و هـەمان خـاڵی سـەرەتا، خەونەکـە گوزارشـت لەئارەزوویـەك ناکـات، بـەڵکو بـەزمانێکی هونەری‌و داهێنەرانە گوزارشت لەژیانی هیچ و پووچی ئەو پیاوە دەکات.

کەسـانێکی زۆر خـاوەنی ئـەم جـۆرە توانـا داهێنەرانەیـەن، بـەڵام لـەدونیای بێداری‌دا بەرادەیـەك کەوتوونەتـە ژێـر گوشـاری کۆمەڵگاوە کـە جورئـەتی ئـەوەیان نی‌یە خودی خۆیان بن و خۆیان شتێك دابهێنن، یـەکێك لەخەوشـەکانی کۆمـەڵگای ئێمە ئەوەیە کە ناهێڵێت خەڵکی پەی بەتوانا داهێنەرانەکانی خۆیان بەرن.

ئێمـە لـەدونیای خەونـدا لەگـەڵ خۆمانـدا دەدوێـین، لـە (تـەلمود)دا هـاتووە: (خـەونێك کـە لێـك نەدرێتـەوە وەکـو نامەیـەك وایـە کـە نەخوێنرێتـەوە) وشـەی interpret (لێکدانــەوە) لــەم بــارەدا ماناکــە ناگەیــەنێ‌و لەراســتیدا پێویســتمان بەلێکدانــەوە یــان تەرجەمــە نی‌یــە (چــونکە وشــە ئینگلیزیەکــە هــەم بــەمانای

لێکدانەوەو هەم بەمانای تەرجەمەی راستەوخۆش دێ-و-) بۆ نموونە ئێمە کاتێ فێری زمانی چینی یائیتالی بووین ئیدی پێویستمان بەوە نییە بۆمان تەرجەمە بکەن، دەتوانین فێری زمانی خەونیش بین، ئەم زمانەش دەستوورو شێوەی تایبەتیی خۆی هەیە، زمانێکە کە (راستیەکان) راڤە ناکات بەڵکو گوزارشت لەئەزموونێك دەکات، فێربوونی زمانی خەون ئاسانەو مەرج نییە زانایەکی شیکاری دەروونی بیت تافێری بیت.

دەکرێ وەکو زمانێکی بێگانە ئەم زمانەش لەقوتابخانە فێرببیت، بەڕای من فێربوونی زمانی خەون سوودێکی زۆرمان پێ دەگەیەنێ چونکە ئەگەر لەخەونەکانی خۆمان و هی خەڵك تێ بگەین باشتر خۆمان و ئەوانیش دەناسین، لەڕوویەکی تریشەوە فێربوونی ئەو زمانە زیانی خۆیشی هەیە، لەراستیدا ئێمە نامانەوێ زیاد لەڕادەی پێویست زانیاریمان دەربارەی خۆمان و کەسانی تریش هەبێ، چونکە زانیاریی زۆر دەبێتە مایەی چەرمەسەری بۆمان، بەڵام چەند زیاتر خۆمان بناسین و کەمتر خەڵك بتوانن فریومان بدەن، ژیانمان دەوڵەمەندترو بەپیت ترو سەرشارتر دەبێ لەهێزو وزەی ژیان. هەروەها ئەگەر لەزمانی خەون بگەین دوچاری تێڕوانینێکی یەکڕەهەندیی فیکری-و رۆشنبیری نابین -ئەو سنوور بەندیەی کە ئەمڕۆ زیاتر لەهەر رۆژگارێکی دی بەسەر هزرو بیری خەڵکیدا زاڵە- دوچاری بیرکردنەوە لەچوارچێوەی چەمکەکاندا نابین و بەڵکو بایەخ بەلایەنە عاتیفیەکانیش ئەدەین. ئێمە هزرو سۆزەکان تێکەڵ دەکەین و بەدیلی ناواقعی دەخەینە جێیان، من لێرەدا مەبەستم دژایەتیکردنی خەتەرناکی رۆشنبیری نییە، بەڵکو دەمەوێ بڵێم کە زمانی خەون دەتوانێ شتی وەهامان فێربکات کە ئێستا زیاتر لەهەر کاتێکی دی بۆ ژیانمان پێویستە، ئێمە دەتوانین لەدونیای خەوندا ببینە شاعیر.

## سایکۆلۆژیای پێشینو نوێ

### - دەروونناسی بۆ ئەوانەی کە دەروونناس نین -

چ کەسێ دەروونناسەو چ کەسێ دەروونناس نییە؟ دەروونناسی چییە؟ وەڵامی پرسیاری یەکەم زۆر سادەیە. هەرکەسێ دەروونناسیی نەخوێندبێتو لەو بوارەدا بڕوانامەیەکی زنکۆیی نەبێ دەروونناس نییە. یان بە واتایەکی دی هەموو دەروون نەناسن. بەڵام ڕاستیەکەی وەها نییە" چونکە هەریەکێك لەئێمە بە جۆرێك لەجۆران بایەخ بە دەروونناسی دەداتو پێویستیشە بیدات، ئەبێ بزانین لەناخی مرۆڤدا چی ڕوو دەداتو ئەبێ بیانناسین. تەنانەت پێویستە پێشبینی ڕەفتاری خەڵك بکەینو بۆ ئەم مەبەستەش پێویست ناکات بۆ تاقیگە بچین. تاقیگەی ژیانی ڕۆژانە (کە ڕۆیشتن بۆ ئەویش مەرج نییە) ئیمکاناتێکی زۆر دەخاتە بەر دەستمان تا لە کردەوەو ڕەفتاری خەڵك بکۆڵینەوەو هەڵیسەنگێنین. بەم پێیە پرسیاری یەکەم پرسیارێکی نابەجێیە. نابێ بپرسین ئایا دەروونناسین یان نا. ڕاستتر وایە بپرسین: ئایا دەروونناسێکی باشین یان خراپین؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش هەرچیەك بێت" خوێندنی دەروونناسی ڕۆڵێکی کاریگەری لە شارەزا بوون لە دەروونناسیدا هەیە. ئەم تێڕوانینەش پرسیاری دووەم دێنێتە پێشەوە. دەروونناسی چییە؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دژوارەو پێویستی بە قسەو باسی زیاتر هەیە. مانای زمانەوانی دەروونناسی ((زانستی ڕۆح))ە بەڵام زانستی ڕۆح چییە؟ شێوازەکانی چین؟ ئامانجەکانی چین؟

زۆربەی خەڵکی لەو باوەڕەدان کە دەروونناسی زانستێکی نوێیە. ئەو باوەڕەش لەو ڕاستیەوە هاتوە کە ووشەی ((دەروونناسی)) هەمووی سەد تا سەدو پەنجا ساڵێك دەبێت بەکار دەهێنرێ. لە کاتێکدا دەروونناسی لە پێنج سەد ساڵ بەر لە زاینەوە دەستی پێکردو تا سەدەی حەڤدەهەم درێژەی کێشا. بەڵام پێیان نەدەوت ((دەروونناسی))بەڵکو ناویان نابوو(( زانستی ئاکارـEthics )) یاخود زۆر جار ((فەلسەفە))شیان پێدەوت. ئامانجی دەروونناسی پێشین چی بوو؟ وەڵامەکەی بە کورتی: دەروونناسیی پێشین هەوڵی دەدا ڕۆحی ئادەمیزاد بناسێ‌و لە خزمەتی ژیانێکی باشتردا بێ‌و بەم پێیە ئاکارو تەنانەت ئاین‌و مەعنەویەتیش بە ئەنگێزەی دەروونناسی دەژمێردران.

بە کورتی چەند نمونەیەك لە دەروونناسیی پێشین دەهێنمەوە. بودلیزم (ئاینی بودایی) دەرونناسیەکی گشتگیری هێنایە ئاراوەکە زۆر ئاڵۆزو لە هەمان کاتدا دڵرفێنە. ئەرستۆش کتێبێکی‌دەربارەی دەروونناسی نووسیوە بەڵام ناوی ناوە((بنەماکانی ئاکار)). رواقیەکان دەروونناسیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشیان هەبوو" لە وانەیە ئێوە کتێبی ((تێڕامانەکان)) ی فەیلەسووفی رواقی ((مارکۆس ئۆرلیۆس)) تان دیبێت. هەروەها لە کارەکانی‌فەیلەسوفی ئیتالی ((توماس ئەکویناس ١٢٢٥ـ ١٢٧٥)) دا سیستمێکی دەروونناسی دەبینینەوە کە لەهەر کتێبێکی ئەمڕۆ فێرگوزاری ترە. ئەم فەیلەسوفە لەهەر نوسەرێکی دی باشترو بەشێوەیەکی قووڵتر لە خود شەیدایی (نێرگسێتی) و لە خۆبایی بوون‌و خاکی بوون (تواچع) و شەرم‌و گرێی خۆ بەکەم زانین‌و کۆمەڵێ نیشانەی تری دەروونیی کۆڵیوەتەوە. سپینۆزاش وەکو ئەرستۆ کتێبێکی بەناوی ((بنەماکانی ئاکار))ەوە هەیە. لەوانەیە یەکەم دەروونناسی گەورە بێ کە توانای ویژدانی بێ ئاگای ناساندبێت‌و تبێتی کە ئێمە هەموو لە خواست‌و ئارەزوەکانی خۆمان بە ئاگاین بەڵام لە ئەنگلێزەکانیان بێ ئاگاین.

دواتر دەبینین چۆن ئەم تیۆریە دەبێ بە بنەماو بناغەیەك بۆ دەروونناسی قووڵ لای فرۆید.

لە قۆناغی نوێدا کەلە سەد ساڵ تێناپەڕێ دەروونناسیەکی تەواو جیاواز هاتە ئاراوە. ئەم دەروونناسیە مەبەستێکی دیکەی هەیە. ئامانجی ناسینی ڕوح نیە لە خزمەتی باشکردنی ژیاندا، بەڵکو ئەوەی لێمان دەوێ ئێمە روح بناسین تا بتوانین ببینە مرۆڤێکی سەرکەوتووتر. خۆمانو کەسانی دی بناسین تا بتوانین شوێنێکی باڵامان لە ژیاندا هەبێو بە جۆرێك بین کە پێشکەوتن داوامان لێ دەکات.

بە تەنها کاتێك دەتوانین پەی بە جیاوازیەکانی نێوان دەروونناسیی پێشینو هی نوێ بەرین کە ئاگاداری گۆڕانکاریەکانیبواری ڕۆشنبیریو ئامانجەکانی کۆمەڵگا بینو رەچاویان بکەین. من دڵنیام لە یۆنانیە کلاسیکەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لە ئێمە باشتر نەبوون. تەنانەت رەفتاری ڕۆژانەشیان لە ئێمەخراپتر بووە. بەڵام بیور باوەڕێك بەسەر ژیانیاندا زاڵ بووکە ئەویش ئەمە بوو: بەهای ژیان تەنها لەوەدا نیە کە خەریکی کارێك بین بەمەبەستی دابینکردنی گوزەرانی ڕۆژانەو بەس، بەڵکو ژیان دەبێ مانایەکی هەبێو، ئەو مانایەش لە نەشو نمای مرۆڤو گەشەکردنی هێزە مرۆییەکاندایە. دەروونناسی بەم بیرو باوەڕەوە پابەند بوو.مرۆڤی ئەمرۆ دیدێکی تری هەیە. مرۆڤی ئەمرۆ ئەوەندەی خولیای هەبوون (دارایی) ە ئەوەندە خولیای (بوون) نیە. هەڵوەدای ئیشی باشترو پارەی زیاترو دەسەڵاتی فراوانترو ڕێزی پترە. بەڵام کەسانێکی زۆریش گومانیان لەوە هەیەگەیشتن بەم ئامانجانە ببێتە بنەمایەی دڵنیایيو ئارامی. ئەم گومانەش بەزەقی لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا زیاتر لە هەر شوێنێکی تر دەبینرێ، ئەو ئەمریکایەی کە دەوڵەمەندترینو لە ڕووی ئابووریشەوە پێشکەوتوو ترین وڵاتی دونیایە. نامەوێ بچمە ناو وردەکاریەوە. ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە کە دوو بیرو باوەڕی جیاواز سەبارەت بەئەنجامەکانی ژیان، دوو ئاراستەی جیاوازی بۆ دەروونناسی هێناوەتە ئاراوە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەش کورتەیەکی مێژووی دەروونناسی نوێ دەخەمە ڕوو تا بەڕێبازە سەرەکیەکانی ئاشنابن.

دەروونناسیی نوێ سەرەتایەکی زۆر میانە ڕەوانەی هەبوو و بە لێکۆڵینەوەی یادەوەریو دیاردەی بیستراوو بینراوو پێکەوە گرێدانو بە دوا یەکدا هاتنی وێنە

زەینیەکانو دەروونناسیی گیانەوەران دەستی پێکرد. ڕەنگە بتوانین بڵێین کە ویلهلم وندت WILHELM MAX WUNDT (١٨٣٢ــ ١٩٢٠) ی کۆمەڵناسو دەروونناسی ئەڵمانی دیارترینو کاریگەرترین کەسێتی بوو لەسەرەتای دەروونناسیی نوێدا. دەروونناسان ناسراو نەبوونو نوسراوەکانیان لە ئاستی تێگەیشتنی خەڵکی ئاساییدا نەبوو، بەڵکو بۆ هاوکارەکانی خۆیانیان دەنوسیو بەتەنها ژمارەیەکی کەم لەخەڵکانی ئاسایی بایەخیان بەکارەکانیان دەدا. بەڵام هەر زوو ئەم بارە لە بنچو بناوانەوە گۆڕا، ئەمە کاتێ ڕووی دا کە دەروونناسیی نوێ بایەخی بە لێکۆڵینەوەی ئەنگێزەکانی ڕەفتاری مرۆڤداو بووە مایەی سەرنجی خەڵکی ئاسایی. ئەمە ئامانجی سەرەکیی دەروونناسی بووە لەم پەنجا ساڵەی دواییدا.

هەڵبەتە ئەمە شتێکە جێی گرنگی پێدانی ئێمەشە، چونکە هەموومان دەمانەوێ بزانین چ شتێك وامان لێ دەکا بوروژێینو بۆچی ئەنگێزەیەك ئەمانجولێنێ تا فلانە کار بکەین. ئەگەر دەروونناسی بتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە بەهایەکی گەورەی لای ئێمە دەبێ. هەر لەبەر ئەم هۆیە لەوەدەچێ ((دەروونناسیی ئەنگێزە)) هەوادارترین زانست بێ لە زەمینەی خۆیداو لەم دەیان ساڵەی پێشووشدا لایەنگرانی زیاتر بووە.

لەم دەروونناسییەدا کە لای خەڵکی پەسەندە دوو ڕێبازی سەرەکیهەن: تیۆریی غەریزەو ڕەفتارگەرایی، سەرەتا بەباسی تیۆریی غەریزە دەست پێدەکەم. بنەڕەتی ئم تیۆریە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە گەورەترین بیرمەندانی سەدەی نۆزدەیەم کە ئەویش (چارڵز داروین) ە. داروین لەو زانایانەیە کە بۆ یەکەمین جار لە غەریزەو هێزی بزوێنەری ئادەمیزادیان کۆڵیەوە، پوختەی تیۆری غەریزە بریتییە لە: لەپشت هەر کارێکەوە ئەنگێزەیەك هەیە، کە لەهەر بوارێکا وەکو غەریزەیەکی سەربەخۆو خۆڕسك کار دەکات. ئێمە وەکو هەر گیانلەبەرێکی دی کە لەدایك دەبین کۆمەڵێك غەریزەمان تێدایە. گەر شەڕەنگێزبین هۆیەکەی بۆ غەریزەی شەڕەنگێزی دەگەڕێتەوە، ئەگەر نەگریس بین هۆیەکەی غەریزەی

نەگریسـیيە. گـەر ئێرەیـی (حەسـودی) بەیـەکێك بـەرین بـە حـوکمی غـەریزەی ئێرەییەو گەر هەستی هاوکاریمان لاهەبێ غەریزەی هاوکاری بۆ ئەوە هانمان ئەدا. کـە لـەکاتی هەڵاتنـدا لـەشمان سـوك ئـەبێ کـاتێ ڕووبـەڕووی تـرس ئەبینـەوە" غەریزەی هەڵاتن هۆکارمانەوبەمجۆرە.. لەکۆی ئەم غەریزانـەمان تیـۆری‌ی غـەریزە پێك دێ، کە بەهەموویانـەوە دوو سـەد غەریزەیـەك دەبن‌و هەریـەکێکیان بزوێنـەری ڕەفتارێـك لـەڕەفتارەکانمانن، هەروەکودوگمـەکانی‌پیانۆ کـە پەنجـەیان پـا دەنێـی هەریەکەیان دەنگی نۆتێکی تایبەتی‌ی لێ بەرز دەبێتەوە.

پێشـڕەوانی تیـۆری‌ی غـەریزە دوو ئـەمریکایی بـوون بـەناوی ویلیـام جـەیمزو ویلیـام ماکـدۆگال. لەوانەیـە ئـەم پوختەیـە ئینتیباعی‌ئـەوەتان لا دروسـت بکـا کەتیۆری‌ی غەریزە تیۆرێکی زۆر سادەیە. بەڵام بەهیچ جۆرێك وانیـە. لەسەر ئەو بناغەیەی کە داروین بنچینەکەی دانا ئەو دوو زانایەو هەوادارانیان، کە هـەموویان بیرمەنـدی پایـەدار بـوون، سـاختومانێکی وەهایـان دامـەزران کـە شـایانی لێـورد بوونەوە بوو. بەڵام ئەو ساختومانە بەشێوەیەکی دروست بینا نـەکرا" چونکە لـە ڕاسـتیدا سـاختومانێکی خـەیاڵی بـوو کەلەسـەر بنچـینەیەکی واقعیانـە بنیـاد نـەنرابوو. گـرنگترین تیـۆریی غـەریزەش تیۆریەکـەی کـۆنراد لـۆرانزە کـە مـەیلی شەڕەنگێزی لە مرۆڤدا بۆ غەریزەی توندو تیژیی خۆڕسك دەگەڕێنێتەوە.

یـەکێك لەخاڵـە لاوازەکـانی تیـۆریی غـەریزە سـادەیی زیـاد لەپێویسـتیەتی. لێکدانـەوەی هـەر ڕەفتـارێکی ئادەمیزاد بەغەریزەیـەك وەڵامێکـی زۆر ئاسانە بـەڵام هیچمان بـۆ ڕوون ناکاتـەوە. ئـەوەی هەڵیـدەهێنجین بەتـەنها ئەوەیـە کـە کردەوەو ڕەفتارەکانی مرۆڤ ئەنگێزەیان هەیەو ئەو ئەنگێزانەش خۆڕسکن، بەڵام هیچ یەکێك لـەو بزوێنەرانـە غـەریزە نـین. کۆمـەڵێك ڕەفتارمـان هەیـە . وەکـو تونـدو تیـژیی بەرگریانـە، هـەڵاتن‌و تاڕادەیـەك ڕەفتـاری سێکسـیش . کـە تیایانـدا تـوخمی لـە غەریزەچوو هەیە. بەڵام تەنانەت لەمانەشدا نابێ ئەو ڕاستیانە فەرامۆش بکەین کە پەیوەندیان بە فێربوون‌و ڕۆڵـی کـەلتورو ڕۆشـنبیریەوە هەیـەو مـۆتیڤ (ئـەنگێزە) ە خۆڕسکەکان تیایانـدا دەسـت تێ‌وەردەدەن. کاریگـەریی ئـەو دەسـت تێوەردانـە چ

لەسەر مرۆڤو چ لەسەر گیانەوەر بە ڕادەیەکە یان دەبێتە مایەی فەوتانیو یانیش دەبێتە مایەی پتەوکردنی پایەی ئەو گیاندارە.

خاڵێکی لاوازی تری تیۆریی غەریزە ئەوەیە کە هەندێ لەو غەریزانە لە کەسانێکدا زۆر بەهێزن، کەچی لە هەندێ کەلتوردا هەر بەدی ناکرێن. بۆ نمونە هەندێ هۆزی سەرەتایی هەن کە زۆر شەڕەنگێزن، بەڵام هەندێکی دی هەن تەواو بە پێچەوانەوەن. ئەم جیاوازیە لە مرۆڤەکانیشدا دەبینینەوە. ئەگەر یەکێك بچێتەلای پزیشکێکی دەروونیو بڵێ: ((دکتۆر، من کابرایەکی ئەوەندە تووڕەم دەمەوێ هەرکەسێکم بینی بیکوژم، ژنەکەم، مناڵەکانم، خۆم...)) پزیشکەکە لەوەڵامدا نالێ:((ئاها.. غەریزەی تووڕەیی لە تۆدا زۆر بەهێزە)) بەڵکو فەحسی دەکاتو دەڵێ: ((ئەم کابرایە نەخۆشە، ئەو توڕەییەیکە باسی دەکاتو، ئەو ڕقەی لە دەروونیدا پەیدا بووە نیشانەی نەخۆشین.)) ئەگەر غەریزەی شەڕەنگێزی وای لەو کابرایە کردبێت" کەواتە دەبێ ئەو ڕەفتارەی ئاساییو سروشتی بێت نەك نیشانەی نەخۆشی.

هەروەها دەبینم کە زۆربەی مرۆڤە سەرەتاییەکان، ئەوانەی کە بە ڕاوو کۆکردنەوەی خۆراك گوزەران دەکەن، یانەلە قۆناغە سەرەتاییەکانی شارستانیدان، کەمتر لەمرۆڤەکانی دی شەڕەنگێزن ئەمەش ڕاستیەکی زۆر گرنگە، ئەگەر شەڕەنگێزی خۆڕسك بوایەدەبوو لە مرۆڤە سەرەتاییەکاندا بەشێوەیەکی دیارترو زەقتر دەربکەوتایە. لە کاتێکدا ئەمە تەواو پێچەوانەیە. گەشەو پێشکەوتنی شارستانیەتی لە چوار هەزار ساڵ بەر لە زاینەوە دەستی پێکرد. دامەزراندنی شارە گەورەکان، حکومەتە شا نشینەکان، زنجیرەی پلەو پایەکان، سوپاکان، داهێنانی جەنگو کۆیلایەتی- بەئەنقەستیش وشەی ((داهێنان)) بەکار دەهێنم چونکە هیچیان لە سروشتدا لە خۆیانەوە نایەنە ئاراوە . هەموو ئەمانە زەمینەیان بۆ سادیزمو توندوتیژیو مەیل بۆ وێرانکاری و چەوساندنەوە سازکرد. ئەمانە کۆمەڵێك نەخۆشین کە هەرگیز بەو ڕادەیەی ئێستا لای مرۆڤە سەرەتاییەکانو قۆناغەکانی بەر لە مێژوو نەبوون.

خاڵەکانی لاوازیی تیۆریی غەریزە ڕەفتارگەرایانی BEHAVIORISTS ی هاندا تا تیۆرێکی تەواو جیاواز بخەنە ڕوو. ئەمانە باوەڕیان وایە کە شتێك نییە تەواو خۆڕسك بێت لە مرۆڤداو کردەوەی مرۆڤ لە ژێر کاریگەریی هەڵو مەرجە کۆمەڵایەتیەکاندایەو بەرەنجامێکی دەست تێوەردانی کۆمەڵگا یان خێزانە.

ناودارترینو بەناوبانگترین تەرەفدارو بەرگریکاری قوتابخانەی ڕەفتارگەرایی ((سکینەر B.F.SKINNER ))ە .ئەو لە کتێبێکی خۆیدا بەناونیشانی ((ئەو دیو ئازادیو پلەو پایە Beyond Freedom and Dignity)) دەڵێ:: ((چەمکی وەکو ئازادیو پلەو پایە جگە لەوەهمو خەیاڵ هیچی دی نینو بوونی دەرەکیان نیە، بەڵکو ئەنجامی کۆمەڵێ کاریگەرین لەسەر ئادەمیزاد، بە جۆرێك وابزانێ کە دەیەوێ ئازاد بێت.))

نمونەیەکی سادە دەربارەی ئەم تیۆریە بهێنمەوە: جۆنی کە کوڕێکی بچوکەو نایەوێ سپێناخ بخوات. تەمێکردنی دایکیشی (ئەو ڕێگایەی دایکانو باوکان پەنای بۆ دەبەن) سوودێکی وای نابێ. سکینەر باوەڕی وایە کە تەمێکردن بەرامبەر بەو سەرپێچیە شێوازێکی ڕاست نییەو نابێ دەربارەی سپێناخ بدوێی، بەڵکو دەبێ سپێناخەکە بکرێتە ناو قاپی مناڵەکەوە. ئەگەر جۆنی دەستی بۆ برد دەبێ دایکەکە بەدەم زەردەخەنەیەکی پڕ لە میهرەبانیەوەگفتی تۆزێ کێکیشی پێبدا. بۆ جارێکی تر کە سپێناخ لەسەر سفرە دابنرێتەوە جۆنی باشتر مەیلی خواردنی دەکا. ئەم جارەش زەردەخەنەی میهرەبانی دایكو گفتی چوکلێتێك زیاتر هانی دەداسپێناخەکە بخوات. ئەم شێوازە بەردەوام ئەبێ تا جۆنی مەرجدار ئەبێ، واتە تا وای لێدێ تێدەگا کەئەگەر سپێناخەکە بخوات خەڵاتی دەدرێتێ. کێبێ حەز بەخەڵات نەکات؟ پاش ماوەیەك جۆنی بەحەزەوە سپێناخ دەخواتو لە سەوزەکانی تری پێخۆشتر دەبێ. ئەم شێوازە کاریگەرەو سکینەر بۆ دۆزینەوەی ئەو شێوازە زیرەکانە هەوڵی زۆری داوە، بۆ نمونە ئەگەر خەڵاتەکەبەردەوام نەبێ، یان هەندێجار هەر نەبێو دواتر بهێنرێتە وە کایە. گەلێ لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوەی ورد ئەنجام دراوە بۆ دۆزینەوەی باشترین ڕێگای فریودانی خەڵكو هاندانی بۆ ئەنجامدانی کارێك بەرامبەر خەڵات. سکینەر

گوێنەداتـە ئـەوەی کـە بۆچـی ئـەوەی خەڵاتەکـە دەبەخشـێ چـاوەڕێی ئەنجامـدانی کارێکە لە بەرامبەرەکەی، چونکە ئەو بایەخ بەبەهاکان نادات.

ئەگـەر ئـەو بـارەی دەروونناس لـە تاقیگـەدا بهێنینـە بەرچـاومان بەئاسـانی لـەو بۆچوونەی سکینەر دەگەین. خواردن یان نەخواردنی مشکەکە یان کەروێشکەکە لـە تاقیگەدا شتێکی ئەوەندە گرنگ نییە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئایا دەتوانین وایان لێ بکـەین مـەیلی خـواردن یـا نـەخواردنیان لا دروسـت بکـەین. جـا لەبـەر ئـەوەی ڕەفتارگەرایان، مرۆڤ بە خۆشیانەوە، بەبەرازێکی تاقیگە دەزانن، هـەر بۆیـە سنورو هۆی مەرجداری بەگرنگ ناژمێرنو تـەنها بایـەخ بـەدوو خاڵ ئەدەن: مەرجدارکردنی خەڵکیو باشترین ڕێگا بۆ ئەوە. ڕەفتارگەرا ڕەفتاری ئادەمیزاد لە بوونی ئادەمیزاد خۆی جیا دەکاتەوە. مرۆڤ لەچوارچێوەی ڕەفتاریا ناخوێنێتـەوە، بـەڵکو بـەرەنجامی پرۆسـەکە کـە هـەر ڕەفتارەکەیـە ڕەچـاو دەکـات، مـرۆڤ کـە خـۆی خولقێنـەری ڕەفتارەکەیە ئافەرۆز کراوە. لەم نێوەدا ئادەمیزادەکان خۆیان چ بایەخێکیان نییـەو بە تەنها بابەتێکن بۆ فەلسەفەو خەیاڵ. بەتەنها کردەوەی مرۆڤ سەرنجی ڕەفتارگـەرا بەلای خۆیدا ڕادەکێشێو ئەو ڕاستیەش فەرامۆش دەکا کە ئەگەر تیۆریەکەی ڕاستە کەواتـە بۆچـی خـەڵکی بـەگوێرەی ئـەو تیۆریـەی ئـەوان کاردانـەوەیان نییـە. حـەز نەکردن بەلێك چوونو ملکەچ نەکردنی کەسانێکی زۆر بۆ بەرتیل یان ئەو خەڵاتـەی کە گەوهەری تیۆریەکەیە" بەلای ئەوانەوە گرنگ نییە. تیۆریی ڕەفتارگـەرایی لافی ئـەوە لێ ئـەدا کـە خـەڵك بـەرتیل خۆرییـان لـە ((خـودی بـوون) و پـەیبردن بـەهێزە شاراوەکانی ناخیانو تواناکانیان پێباشترو پەسەندترە.

گەرچی جیاوازیی زەق لەنێوان ڕەفتارگەراییو تیۆریی غەریزەدا هەیە بەڵام لـە شتێکدا یـەك دەگرنـەوە. هیچیان ڕێ بـە مرۆڤ نادەنو پێـی ڕەوا نابینن کـەمترین کـۆنترۆڵی ژیـانی خـۆی لەدەسـتدا بـێ، تیـۆریی غـەریزە کردەوەکـانی مـرۆڤ دەگەڕێنێتـەوە بـۆ ئـەو هاندەرانـەی کـە ڕیشـەیان لـەڕابوردووە گیانـەوەریو مرۆییەکیدایە. ڕەفتارگەرایی بونیادوهەولو مـەرجی کۆمەڵایـەتی بەهانـدەری مرۆڤ دەزانێ، بە واتایەکی دی مرۆڤ لەژێر کاریگەریی تەواوی ئەو فڕوفێڵانەدایە کە لە

هەلپەرستیو هەڵخەڵەتاندنەوە سەرچاوە دەگرن.بەهەمان شێوە بەگوێرەی تیۆریی غەریزە مێژووی هەر جۆرە گیانلەبەرێك بەسەر کردەوەکانیدا باڵا دەستە. بەڵام هیچ یەکێ لەو تیۆرییانە دەستەبەری خواستە ڕاستەقینەکانی ئادەمیزاد ناکەنو لەگەڵ سروشتی مرۆییدا ناگونجێن.

ئەم دوو تیۆریە سەرەکیە بەشێکی گەورەی ((دەروونناسیی نوێ)) دەگرنەوە، بەڵام دەروونناسیی ڕەفتاری باوترە. زۆربەی زانایانی دەروونناسی لە ئەمریکا ڕەفتارگەرانو تەنانەت لە شورەویش لەبەر کۆمەڵێ هۆی سیاسی هەر هەمان ڕێبازی دەروونناسی زاڵە.

- سێ چەمکی سەرەکیی سیگمۆند فرۆید

جگە لەو دوو ڕێبازە سەرەکیەی کە باسمانکردن، ڕێبازێکی سێیەمیش هەیە کە سیگمۆند فرۆید دایمەزراندوبە شیکردنەوەی دەروونی (دەروونشیکاری) یان دەروونناسیی قووڵ ناسراوە. ئامانجی فرۆید تێگەیشتنێکی مەنتیقیانەی هەڵچوونەکان (Emotions) ی مرۆڤ بوو. بە تایبەتیش هەڵچوونە نا ئەقلانی (Irrational) ەکانی. دەیویست بزانێ هۆی یان سەرچاوەی ڕق، خۆشەویستی، ملکەچکردن، وێرانکاری، ئێرەییو حەسودی چین . ئەو هەڵچوونانەی کە کۆمەڵێ نوسەری گەورەی وەك (شەکسپیر و بالزاكو دۆستۆیڤسکی) لە کارەکانیاندا گرنگیان پێ داوە. فرۆید هەولی ئەدا ڕوخسارێکی زانستی بەو هەڵچوونانە ببەخشێ. فرۆید زانستی شتە نا ئەقڵانیەکانی داهێناو، دەیویست بە سوود وەرگرتن لە هێزە ئەقڵگەراکانو ناهونەریەکان لە شتە نائەقڵانیەکان بگات. بەم جۆرە هونەرمەندەکان ، بەتایبەتیش سوریالیستەکان لە دەروونناسانو دەروونشیکاران (کەئەو بیرو ڕایانەیان بە پوچو بێ هوودە دەزانی) زیاتر تیۆریەکەی فرۆیدیان پێ قبول بوو. چونکە ئامانجی فرۆیدو هونەرمەند یەك ئامانج بوو: هەڵچوونەکانی مرۆڤ چیەو چۆن دەرك دەکرێ؟ دەروونشیکاران بەدوای دۆزینەوەی ڕێگاو وەسیلەیەکدا دەگەڕان بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لە

نەخۆشـی ئـازار بـەخشو یـان لـەو شـتانەی لـە ژیانیـدا دەبنـە هـۆی ناكـامڵیو كەوكوڕی.

ئـەبێ ئـەوەش بڵـێم كـە تیۆریەكـەی فرۆیـد لەسـنوری لێكۆڵینـەوەی زانسـتیی ئەنگێزەكان (هەڵچوونەكان) دا كە لە پشت ڕەفتاری مرۆڤەوەن نەدەوەستا. فرۆیـد بـە پێچـەوانەی هـەوادارانی ڕێبـازە سـەرەكیەكانی دەروونناسـی نوێ،لایـەنگیری ئامانجی ئاكاری دەروونناسیی پێشین بوو. دەیویست مرۆڤ توانای تێگەیشتنی خۆی هەبێو نەستی خۆی كەشف بكات تا بتوانێ ئازادی بەدەست بێنێ.

ئامانجی ئەو گەیشتن بە یاسای عـەقڵو لـە ناوبردنی وەهـم بـوو، ئـەو بەشوێن ئـازادیو پێگـەیینو بـەركامالًی مرۆڤـدا دەگـەڕا. ئامانجـە ئاكاریـەكانی ئـەو هـەمان ئامانجـــەكانی چـــاخی ڕۆشـــنگەری (Enightenment) و ڕێبـــازی ئەقلانیـــەت (Rationalism) بوو. بەلاَم ئەو مەبەستانە لە ژێر پەردەی ئەو ئامانجانەدا ون بوو كە دەروونناســـانی دی گرتبویانەبـــەر. تـــەنها ئامـــانجی ئـــەو دەروونناســـانەش یارمەتیدانی خەڵك بوو بۆ بەرهەم هێنانی باشتر. ئەو مرۆڤە نمونەییەی كە فرۆیـد لەبەرچـاوی گرتبوولـە زۆربـەی لایەنەكانـەوە هـەمان ئـەو مرۆڤـە بـوو كـە فەیلەسووفانی گەورەی چاخی ڕۆشنگەری لەبەرچاویان گرتبوو.

تیۆریەكەیفرۆیـدو شـێوەی گوزارشـتی بـە ڕادەیـەكی زۆر كـەوتبووە ژێـر كاریگـەریی ڕۆحـی سـەردەمەكەیەوە، واتـە كاریگـەریی داروینیـزمو ، ماتریـالیزمو غەریزەگـەرایی كـە بەئاشـكرا لـە كارەكانیـدا دەردەكـەوێ. بـەمجۆرە جاری وا هەیـە تیۆریەكەی خۆی بە زمانێك دەخاتە ڕوو كە فرۆید وەكو ڕفتارگەرایەك دەناسرێو، ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی بەدحالێبوونێكی گەورە. لێرەدا هـەوڵ ئـەدەم باس لەگەوهەری دۆزینـەوەكانی فرۆیـد بكـەم. هـەر لەگەڵیشیدا ڕاوبۆچوونی خـۆم ئەخەمە ڕوو كە زۆربەی دەروونشیكاران لەگەڵ ئەو ڕاوبۆچوونانەمدا نین.

بـا سـەرەتا بـزانین مانـای نەسـت یـان ((چـەپاندن Repression )) چیـیە؟ ئـەمڕۆ عادەتەن ئەم چەمكە لەبیر دەكرێ. كـە گفتوگۆ دەربـارەی دەروونشـیكاری دەكـرێ“ یەكەمین شتێ كەدێتە بیری خەڵك (من . Ego) و (منی بالاَ . Superego) و (ئەو . id) و

گرێی ئۆدیپو لیبیدۆ libido یە کە فرۆید هیچیانی‌لە پێناسەیەکی سەرەکی‌ی دەروونشیکاریدا کۆ نەکردۆتەوە.

لەچەپاندنەوە دەست پێ دەکەین. جاری وایە بەپێی هەندێ ئەنگێزە ڕەفتار ئەکەین کە تەواو لێیان بێئاگاین. نموونەیەکی بچوك مەبەستەکەم ڕوون دەکاتەوە، ماوەیەك لەمەوبەر هاوڕێیەکم کە دەمزانی منی خۆش ناوێ هات بۆ دیدەنیم. لەو هاتنەی سەرم سوڕما. کە دەرگاکەم لێکردەوە هاتو دەستی درێژ کردو وتی ((خواحافیز)). لێکدانەوەکەشی ئەوەیە کە: نەستی فەرمانی گەڕانەوەی پێداوە. ئەو خوازیاری ئەو سەردانە نەبوو بۆیە لە جیاتی سڵاو بە وتنی خوا حافیزی بێمەیلی خۆی خستەڕوو. هەردووکمان نەمانتوانی چی بکەین؟ هیچ. ئەو کە دەروونشیکارێك بوو دەیزانی چی کردووەو نەیدەتوانی داوای لێبوردن بکاو بڵێ‌چ: ((مەبەستم ئەوە نەبوو)) و پاکانە بکات. چونکە هەردووکمان دەمانزانی کە دەروونشیکار لەمەبەستو مانای ڕاستەقینەی قسە دەگاو مانای درۆی بۆ داناتاشێ. بارێکی نائاسایی بوو. ناچار هەردووکمان بێدەنگ بووین. ئەمە نموونەیەکە لەسەدان نموونەی دی‌و، فرۆید تیۆریەکەی خۆی لەسەر بنچینەی ئەم حاڵەتانە دامەزراند.

نموونەیەکی تر بهێننە بەرچاوتان: باوکێکی سادیست کە لەکوڕەکەی خۆی ئەدا، لەزەت وەردەگرێ، ئەگەر لەخۆی بپرسن بۆچی وادەکات (عادەتەن ئەو پرسیارەشی پێناخۆش نابێ" چونکە ئەم کەسانە خۆیان حەز دەکەن زانیاریی لەو جۆرە بەدەستەوە بدەن) لە وەڵامدا دەڵێ: ((ئەبێ کوڕەکەم تەمێ بکەم تا ببێتە کەسێکی شایستە یان (بەشایستەیی بمێنێتەوە)، ئەم کارەی من لەڕووی خۆشەویستی‌ی باوکانەوەیە.)) ئایا ئێوە باوەڕ بەو قسەیەی دەکەن؟ لە وانەیەو لەوانەش نیە. بەڵام لەڕوخساری بڕوانەو لەو خەتو چرچی‌و لۆچیانە ورد بەرەوە کەلەکاتی لێدانی منداڵەکەیدا لەسەر دەو چاوی دەردەکەون. هەڵچوونێکی فرە لە چاوانیدا بەدی دەکەیت. خەتەکانی دەمو چاوی هەم گوزارشت لە ڕق‌و هەم لەلەزەتێك دەکەن کە لەئەنجامی لێدانەکەوە هەستی پێدەکات. هەمان ئەم

دیاردانە لە پۆلیسەكانو پەرستارو بەندیەوانەكانیش (هەڵبەتە هەموویان نا) و لە پەیوەندی تایبەتی دیكەشدا بەدی دەكرێن. ئەم جۆرە كەسانە كەمو زۆرو هەریەكە بەپێی بەرژەوەندیی خۆی ئەو سروشتەی خۆی دەشارێتەوە. بگەڕێینەوە سەر باوكە سادیستەكە. ئەگەر لەتەرزی لێدانەكەی ئەو ورد بینەوە دەبینین ئەنگێزەكەی ئەوە نیە كە ئەو دەیڵێ، پەروەردەكردنی كوڕەكە لە ((پاكانەكردنێك)) زیاتر نیە. ئەنگێزەی ئەو كردەوەیەی هاندەر Impulse ێكی سادیستانەیە كەخۆی لێی بێئاگایە.

نموونەیەكی گەورەی مێژوویی لەو گوتەیەی ئادۆلف هیتلەر دایە. هیتلەر لە هۆشو زەینی بەئاگای خۆیدا دڵنیا بوو كە بەتەنها چاكەومەزنی ئەڵمانیای دەوێ: بالا بوونی ژیانو دەسەلاتیئەڵمان لە جیهانداو شتی لەم بابەتە.. گەرچی دڵرەقانەترین فەرمانی ئەدا" كەچی ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین" هەرگیز هەستی بەوە نەدەكرد كە كاری نامرۆییو ستەمی ئەنجام داوە. بەڵكو گومانی نەبووە لەوەی كە كارەكانی لەپێناوی ئەڵماندایە. دەیویست یاساكانی مێژوو بخاتە بەرچاوو بەپێی حوكمی چارەنوسو حوكمی نەژادو حوكمی پەروەردگار دەجولایەوە. بێ ئاگا بوو لەوەی لەزەتی لەوێرانكاری دەبینی. بەرگەی بینینی لاشەی سەربازەكانو ساختومانە وێرانەكانی نەدەگرتو، هەربۆیە بەدرێژایی جەنگ سەردانی بەرەكانی شەڕی نەكرد. هۆی ئەوەش ترسنۆكی نەبوو، بەڵكو پڕ كێشی نەدەكرد ئەنجامی مەیلی لە ڕادەبەدەری خۆی بۆ وێرانكردن ببینێ.

هەمان دیاردە دەتوانین لەو كەسانەدا ببینینەوە كە وەسواسی شتنو ئاو بەكارهێنانیان هەیە. ئەمانە بەنیازی ئەوە ئەو كارە ئەنجام ئەدەن كە ئەیانەوێ هەمیشە پاكو تەمیز بن. بەلام ئەگەر بخرێنەبەر شیكاری دەروونیەوە دەردەكەوێ كەلەنەستیاندا ئاگاداری دەستە خوێناویو چەپەڵەكانی خۆیانو دەیانەوێ لەو بارە قورسەی نەستیان ئازاد بن كە دەشێ تاوانێبێ، تاوانێكی شاراوە یان مەیلێ بۆ گوناهێك. هیتلەریش لەم تەرزە مرۆڤانە بوو. وەسواسی شتنی نەبوو، بەلام كەسانێك شایەتی ئەوەن كە زیاد لەڕادەی پێویست بایەخی بەپاكو تەمیزی ئەدا.

مەبەستم لە هێنانەوەی ئەم نموونانە پیشاندانی حاڵەتی نزیك لە حاڵەتی باوکی سادیستەکە بوو. هیتلەر نەیدەویست دان بەڕاستیی هاندەرەکانی خۆیدا بنێت، ئەوانەی دەچەپاندو تەنها ڕێی بەدەرکەوتنی نیازە پاکەکانی خۆی ئەدا.

هەڵبەتە ئەم کارە تا سنورێکی دیاریکراو بڕی کرد. بەڵام چونکە سەرەنجام لەوە گەیشت کە ئەڵمانیا، یان ڕاستتر وایە بڵێین خودی ئەو، جەنگەکەی دۆڕاندووە، چەپاندنی مەیلی وێرانکاریش وەستا. ناکاو گەیشتە ئەوەی کە هەموو خاکی ئەڵمانیاو هەموو میللەتی ئەڵمان بفەوتێنیٚ. هیتلەر لەگەڵ خۆیدا ووتی: ((ئەم میللەتە مادام توانای بردنەوەی جەنگەکەیان نەبوو کەواتە شایانی ژیان نین.)) ئەوە بوو کە دوا جار شەهوەتی وێرانکردن لەلای کەوتە گەڕ. ئەم شەهوەتە بەردەوام لای هەبووەو بە شێك بووە لە سروشتی، بەڵام بە چەپێنراوی مایەوە تا ئەو دەمەی ئیدی پێویست بەشاردنەوەی نەما. تەنانەت لەو کاتەشدا پاکانەی بۆ ئەو شەهوەتی وێرانکاریەی خۆی دەکرد: ((ئەڵمانیەکان دەبیٚ بمرن چونکە شایانی ژیان نین.))

دەتوانین نموونەی دراماتیك یا نادراماتیك ـ ی لەم جۆرە لە هەموو کاتێکداو هەموو شوێنێکدا ببینینەوە. خەڵك ئاگاداری ئەنگێزە ڕاستەقینەکانی خۆیان نین، لەبەر کۆمەڵیٚ هۆی جیاواز ناتوانن بەرگەی ئەو شتانە بگرن کە دژ بەهەستی بەئاگا یاخود بیرو باوەڕی گشتین. ئەگەر خەڵك لە ئەنگێزە ڕاستەقینەکانی خۆیان بە ئاگا بن بارێکی زۆر شپرزەوپەشێویان ئەبیٚ. کەواتە پێیان باشە کە هەر لەو ئەنگێزانە بێئاگابن تا لەگەڵ ((خودی باشتر)) ی خۆیانو ((خەڵکی بەرێز)) و بیرو ڕاکانی خەڵکی بەرێزدا دووچاری پێکدادان نەیەن.

ئێستاش دەچینە سەر بەرەنجامێکی چەپاندن کە شایستەی سەرنج دانەو دووەمین چەمکی فرۆیدە، ئەگەر خەڵکی لە ئەنگێزە ڕاستەقینەکانی کردەوەکانیان ئاگادار بکەینەوە کاردانەوەیان کردارێك ئەبیٚ کە فرۆید ناوی نا بەرەنگاری ـ Resistance . خەڵکی نایانەوێ ئەو زانیاریانە بزانن، تەنانەت ڕاستیەك کە سوودیشیان پیٚ دەگەیەنیٚ پێیان قبوڵ ناکریٚ. خەڵك ناتوانن ڕاستیەکانی ناو

ناخی خۆیان ببینن. ئەگەر بەشۆفێرێك بڵێی دەرگای ئۆتۆمبیلەکەی کراوەتەوە یان تایەکەی هەوای کەمە زۆر سوپاس گوزار ئەبێ. بەڵام ئاشکرا کردنی ئەگێزەی ڕاستەقینەی کردەوەی مرۆڤ ئەم کاردانەوەیەی نابێ بەڵکو لە ئاستیدا بەرەنگاری دەنوێنن. لە تەواوی شتە چەپێنراوەکاندا ئەبێ چاوەڕێی ئەوە بین کە بە ئاشکرا کردنی ئەوەی لە دەروونی مرۆڤدایە ڕووبەڕووی بەرەنگاری دەبینەوە.

نیشانەکانی ڕەفتاری بەرەنگاریئامێز چی‌یە؟ نموونەی زەقی: تووڕەیی‌و سەرکێشی‌و شەڕەنگێزی‌یە. دەڵێی خەڵکی دەیانەوێ تەواوی گەواهیەکان لەسەر تاوانەکانیان لەناو بەرن. لەبەر ئەوەی ناتوانن نهێنی درکێنەکەی ناو ناخی خۆیان بکوژن . چونکە کارێکی مەترسیدارە . بە شێوازێکی ڕەمزیانە لە خۆیانی دوور دەخەنەوە. بە دادو هاوارەوە دەڵێن ((تۆ ئێرەییم پێ‌دەبەیت‌و هاندەرێکی ناشرین پاڵت پێوە دەنێ قسەم پێ‌بڵێیت. تۆ ڕقت لە منەو لەزەت لەو قسانە دەبینی کە دەیانخەیتە پاڵ من.)) وهتد.... جاری وایە تووڕەیی خەڵك دەگاتە ڕادەیەکی زۆر خەتەرناك. ئاستی تووڕە بوونیان بەندەبە پلەو پایەو بارو دۆخ‌و ئەو حاڵەتانەی کە تیایاندان. ئەگەر ڕێ بە گوزارشت کردن لە تووڕەیی نەدات (وەکو باری کەسێکی ژێر دەست بەرامبەر کەسێکی باڵا دەست) ئەو کەسە بێدەنگ ئەبێ‌ودوای ئەوەی دەچێتەوە ماڵەوە بە هاوسەرەکەی دەڕێژێت. بەڵام ئەگەر کۆت‌و بەندێکی وەها لەئارادا نەبێ‌و، بۆ نموونە ژێردەستەکە بتوانێ‌ڕەخنە لە باڵا دەستەکە بگرێ (هەڵبەتە بەو مەرجەی ڕەخنەکەی دروست بێ) ئەوا ڕەخنە لێ‌گیراو بەهەر شێوەیەك کە خۆی بزانێ کاردانەوەنیشان ئەدا. سەرۆکەکە دەتوانێ کارمەندەکەی بەردەستی ڕیسوا بکات، یان هەر لەکارەکەی دەری بکات‌و بیانووشی ئەوەیە کەکارمەندەکە تۆمەتی خستۆتە پاڵ‌و شتی بۆ هەڵبەستووە.

شێوازێکی سادەتری دەربڕینی بەرەنگاری ئەوەیە کە مرۆڤ گوێی خۆی لە ئاستی ئەو شتانەدا کەڕ دەکات کە نایەوێ بیانبیستێ. ئەو زانیاریانەی کە لەگەڵ سروشتیدا ناگونجێن یا بە پێچەوانەی مانای ڕاستەقینەیانەوە باون" گوێیان لێ

ناگرێ. گەرچی ئادەمیزاد ناتوانێ هەمیشە کەڕ بێ، بەڵام بەهەر حاڵ ئەم حاڵەتە سادەترینو باوترین ڕێی بەرەنگاریە.

ڕێگایەکی تری بەرەنگاری خەمبار بوونو خزانە گۆشەیەکەوەیە. ئەمە شێوازێکە کەزیاتر لە نێوان ژنو مێردەکاندا بەدی دەکرێ. کاتێ یەکێکیان ئەنگێزەی ڕاستەقینەی کردەوەیەکی ئەوی تر دەداتەوە بەچاویدا، ئەوی تردوچاری دڵتەنگی دەبێو لە بەامبەردا بەشێوەیەك لە شێوەکان یان بە ڕاشکاوی دەڵێ: ((چاوت لێیە قسەکانی تۆ منیان دڵتەنگ کرد.)) لێرەدا گرنگ دروستی یان نادروستیی ئەو بیرهێنانەوەیە نییە، بەڵام تەرەفەکەی دیکە لە ئاشکراکردنی ناواخنی نەستی هاوسەرەکەی تۆبە دەکات، چونکە بەرامبەر بەوە دەبێ نرخێکی گران بدات.

شێوەیەکی دیکەی بەرەنگاری هەڵاتنە. ئەم جۆرە  بەرنگاریە بە زۆری لە نێوان هاوسەرانێکدا بەدەردەکەوێ کە یەکێکیان شتێکی کەشف کردبێ کە ئەوی تر هەوڵی شاردنەوەی دابێ. تەنانەت لەوانەیە ئەو دووانەسەرنجی ئەوەیان نەدابێ کە شتێکی وەکو چاوشارکێ دەکەنو لە ناکاوا یەکێکیان هەست دەکات کە هاوسەرەکەی زیاتر لەوەی هەیە دەیبینێ. ئەویش ناتوانێ لەگەڵ ئەو بارەدا بسازێو نایەوێ بەهایەکی ئەوتۆش بۆ دیدی بەرامبەرکەی دابنێ چونکە بیر لە گۆڕان ناکاتەوەو دەیەوێ لە هەمان باردا بمێنێتەوە، هەر بۆیە تاقە ڕێگاچارە هەڵاتنە. ئەم بابەتە لەبەردەم دەروونشیکاریدا دووبارە دەبێتەوە: ئەگەر دەروونشیکار شتێ بڵێ کە نەخۆشەکە حەز بەبیستنی نەکات، نەخۆشەکە دەستبەرداری چارەسەر دەبێوچیدی هاموشۆی پزیشکەکە ناکاتەوەو لە وانەشە بڵێ: ((وازم لەچارە سەر هێنا چونکە دەروونشیکارەکە خۆی شێتە. قسەی وا دەکات کە نیشانەی شێتیەتی، ئەو قسانە هەر لەشێت دەوەشێتەوە.))

هەموو دەزانن کە دەروونشیکارەکە ڕاستە، بەڵام نەخۆشەکە کە ترسی لەوە هەیە گۆڕان بەسەر خۆیدا بهێنێ بەناچاری کاردانەوەیەکی تووڕەی دەبێ (هەموو شێوەکانی بەرەنگاری کە لێیان دوایین جۆرێکن لە توونودتیژیو شەڕەنگێزی) و دەڵێ: ((لە بەرچاوم وون بە، نامەوێ لەوە زیاتر ئەو قسەیە ببیستم)).

بەڵام ئەگەر ئەو كەسە ئامادەبێ گۆڕان بەسەر خۆیدا بهێنێت بارەكە تەواو جیاواز دەبێ. ئەگەر كەسێك بیەوێ لە خۆی بگاتو ڕاستیەكان دەربارەی خۆی بزانێ تا بتوانێ دەست بەگۆڕانكاری لەخۆیدا بكات چیدی بە تووڕەیی یان هەڵاتن كاردانەوە پیشان نادات. بەرامبەر بەبیستنی ئەو ڕاستیانە كەیاریدەی گەشەی ئەدەب سوپاسگوزارو خۆشحاڵ دەبێ. هەر وەكو ئەو نەخۆشەی كە نەخۆشیەكی جەستەیی هەیەو كاتێ پزیشك چارەسەری دەكات پێدەزانێو سوپاسی دەكات. بەڵام زۆربەی خەڵك مەیلی گۆڕانكاریان نییەو گۆڕان بۆ كەسانی دی بە پێویست دەزانن.

زێدە ڕۆیی نیە گەر بڵێم زۆربەی خەڵك زۆرترین هێزی خۆیان بۆ چەپاندنی ئەنگێزە ڕاستەقینەكانی خۆیان تەرخان دەكەنو، ئەگەر نەیانتوانیو ئەو ئەنگێزانە چوونە ویژدانی بە ئاگایانەوە دەست بە بەرەنگاری دەكەن. بێگومان وزەیەكی زۆر بەم جۆرە بەهەدەر دەڕواو، سوود وەرگرتنێكی كاریگەر لە تواناو بەهرەكان دژوار دەبێ.

ئیستا دێینە سەر چەمكی سێیەمی فرۆید: گۆڕین یان گواستنەوە . Transform.

گۆڕین لای فرۆید واتە نەخۆشەكە دەروونشیكار لەجێی یەكێك لەو كەسێتیانە دادەنێت كە لەمناڵیدا كاریگەرییان لەسەری زۆر بووە، بۆ نموونە وەكو باوك یان دایك. بەم پێیە كاردانەوەی بەرامبەربە دەروونشیكارەكە وەكو كاردانەوەی بەرامبەر كەسێك نییە كە ڕووبەڕووی یان لەپشتیەوە وەستاوە. نەخۆشەكە دەروونشیكار بە كەسێكی دی دەبینێ (باوك، دایك، بابە گەورە یا دایە گەورە) و چاوەڕێشە ڕۆڵی هەمان كەسێتیش ببینێ. نموونەیەكی ڕوون بهێنمەوە:

دەروونشیكارێك بەم جۆرە باسی ئافرەتێكی بۆ كردم كە سێ هەفتە بوو هامشۆی دەكرد. ڕۆژێكیان كە ئافرەتەكە عیادەكە جێ دەهێڵێ، بە وردی سەیری دەروونشیكارەكە دەكاتو پێی دەڵێ: ((چۆن؟ ڕیشت نییە؟!)) دەروونشیكارەكە هەرگیز ڕیشی نەبووە. بەڵام ئافرەتەكە بەدرێژایی ئەو سێ هەفتەیە ئەوی بە پیاوێكی ڕیشدار دیوە، چونكە باوكی ڕیشی هەبووە. ئەو ئافرەتە ناسنامەو

کەسێتیە ڕاستەقینەکەی دەروونشیکارەکەی نەدەبینی، بەڵکو ئەوی لە جێی باوکی دانابوو کە ڕیشی هەبوو.

چەمکی گۆڕین بایەخێکی فراوانتری لە بەکارهێنانی تیۆری دەروونناسیدا هەیە. گۆڕین یەکێکە لەباوترین هۆیەکانی ((هەڵەو ناکۆکی)) ی مرۆڤ بەرامبەر بەڕاستی. گۆڕین وامان لێ دەکات دونیا لە پشت چاویلکەی خواستو ترسەکانی خۆمانەوە ببینینو لە ئەنجامدا ڕاستیەکان لەگەڵ وەهەمو هەڵەی هەستی (حیسی) دا تێکەڵ بکەین. ئێمە خەڵکی وەکو خۆیان نابینین بەڵکو بەگوێرەی خواستو ترسی خۆمان دەیانبینین. ئەو تەسەورەی هەمانە بۆ کەسانێك بەگوێرەی ئەوەیە کەلێیان چاوەڕێ دەکەینو کاردانەوەی ئێمە بەرامبەر کەسێتیە ڕاستەقینەکە نییە بەڵکو بەرامبەر بەو وێنەیەیە کە ئێمە دەربارەی ئەو لە زەینو خەیاڵی خۆماندا خوڵقاندوومانە.

چەند نموونەیەك بهێنمەوە. دوو کەس بهێننە بەر چاوتان کە یەکتریان خۆش دەوێ. ئەمڕۆ کەمتر عیشقو خۆشەویستی دەبینینەوە. چونکە ڕێگای ئاسانتر هەیە بۆ گەیشتن بە دوا مەبەست. بەڵام با واز لەم ڕاستیانە بهێنینو وا دابنێین کە دوو کەس خۆشەویستیەکی ڕاستەقینەیان بەرامبەر یەك هەیە.عاشقی جوانیەکانو خووە بەرزەکانو سیفاتەکانی یەکترو شەیدای یەکترن. ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی بۆ یەك ببنو بچنە ژیانی ژنو مێردایەتیەوە. بەڵام هەمووی شەش مانگ دوای ئەوە هەردووکیان تێ دەگەن کە ئەو کەسە نین کە عاشقی یەکدی بوونو هاوسەرەکە کەسێکی تری لێ دەرچووە. ئەو دووانە عاشقی ڕووکەشێکی خەڵەتێنەرو گۆڕاو بوون، لە بەرامبەرەکەیاندا ئەو شتەیان دەبینی کە لەبنەڕەتدا دەیانویست ببینن: باشی، زیرەکی، هاوڕێیەتیو ڕاستگۆیی . لەوانەشە هەمان سیفەتەکانی دایكو باوکیان بووبێ و بێئاگابوون لەوەی گرفتاری وەهەمو هەڵەی حیسسی بوون. لەوە بەدوا گیروگرفتەکان بەدەر دەکەون" هەردووکیان هەست بەبێزاری دەکەن، چونکە هاوسەرەکەیان بەگەمەی دەست ئارەزووەکانیان دەبینن. بەڵام ئەسڵی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەوانە خۆیان فریو داوە. بەتەنها وەهەمو

خەیاڵەکانی خۆیان دیوە نەك ڕاستیەکان، هەر بۆیە ئەگەر خەڵکی لە ((گۆڕین)) بگەن هەرگیز شتی وا ڕوو نادات.

هەمان دیاردە لەدونیای سیاسەتیشدا بەدی دەکرێ. ئەو جۆش‌و خرۆشەی خەڵك بهێنەرە بەرچاوت کە بەرامبەر بەسەرکردەیەکی سیاسی پیشانی ئەدەن. (ئەمەش نەك لە ئەڵمانیادا بەڵکو لە هەموو دنیادا ڕوو ئەدات). ئەو سەرکردانە دەشێ خراپ بن‌و دەشێ باش. بەڵام مەسەلەی سەرەکی باشی‌و خراپی سەرکردەکە نیە، گەرچی خۆی بۆخۆی ئەمەش مەسەلەیەکی گرنگە" بەڵکو ئەوەیە کە زۆربەی خەڵك چاوەڕێی ئەوەن‌و پێویستیان بەوەیە کەسێك بێت‌و ڕابەریان بکات. کەسێك کە نیازی پاك بێ. ئەگەر کەسێك کە دەزانێ چۆن ڕۆڵی ڕابەرێك دەبینێ بێتە مەیدانەوە، خەڵکی ئارەزوو و خواستەکانیان ((دەگوێزنەوە)) بۆ ئەوو یەقینیان لا دروست ئەبێ کە ئەو فریادڕەس‌و ڕزگارکەریانە. گەرچی لەڕاستیدا ئەو سەرکردەیە کاولکەرو شەڕەنگێزبێ‌و ببێتە مایەی کۆسپ‌و کارەسات بۆ میللەت‌و وڵات. تەنانەت سەرکردە بچوکەکانیش لەم بۆچوونانەی خەڵك سوود وەردەگرن. هەیدێ ئەو سیاسەتمەدارانەی کە بەوریایی‌و ئاگاییەوە سوودیان لەو مەیلەی خەڵك بۆ ((گواستنەوە)) لە پێناوی گەیشتن بەسەرکەوتنی گەورەدا بینیوە. ڕواڵەت‌و ڕەفتاری پەسەندیان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن ئەو خەڵکە فریو ئەداکە دەنگیان بۆ ئەدەن، چونکە ئەو قسانە دەکەن کە میللەت پێی خۆشە، منداڵان ماچ دەکەن، دەبنەمایەی بەهێزکردنی هەڵەی هەستی‌و وەهمی بینەرانو، دواجار مادامەکی منداڵانیان خۆش دەوێ کەواتە ناکرێ مرۆڤێکی خراپ بن.

ئەگەر خەڵکی باشتر لە ((گواستنەوە)) بگەن‌و بزانن چۆن هیواو خۆزگەکانیان ڕەنگێکی درۆ بەو شتانە ئەدات کە دەیبینن، ئەگەر چاودێرێکی بێلایەن بن‌و ئەگەر دیدێکی ڕەخنەییان هەبێ هیچ یەکێك لەو شتانە ڕوو نادات کە باسمان کردن. جاری وایە هەندێك کردەوەی بچوك‌و بێبایەخی کەسێك لە وتارێکی درێژ کە پشتی بەزۆر مەسەلە بەستووە" زێتر شتمان بۆ ئاشکرا دەکات. ئەگەر ئێمە بتوانین پەردەی وەهم‌و هەڵەی هەستی وەلاوە بنێین، ئەوکاتە خۆشەویستیمان،

ژیانی ژنو مێردایەتیمانو بارو دۆخی سیاسیمان لەکارەساتو بەدبەختی خاڵی دەبـێ. ئیـدی نابینـە نێچـیری دەسـت نـاکۆکیی نێـوان ڕاسـتیەکانو وەهـم. جیاکردنـەوەی شتە ڕاسـتەقینەکان لـە شـتە خەیاڵیـەکان کـارێکی ئاسـان نییـەو پێویستی بە لێکۆڵینـەوەو مەشقو ئەزمونی ڕۆژانەیە. ژیانی ڕۆژانە مەیدانێکی فراوانـی ئـەم مەشـقو تاقیکردنەوەیەیـە. تەلـەفزیۆنیش وێـڕای هـەموو خەوشەکانی‌خەسـڵەتێکی باشـی هەیـە: سروشـتو سـیفاتەکانی کەسـانمان پـێ پیشـان ئـەدا، چـونکە دەتـوانین لەسـەر شاشـەی تەلـەفزیۆن لـە نزیکـەوە ڕەفتـارو هەڵسوکەوتی خەڵکی ببینین. سەروسیماو قسەو لێدوانەکانی سیاسەتمەداران لەو سندوقە سیحریەدا کۆمـەڵێك زانیـاریی زۆرمـان سـەبارەت بـەو کەسێتییە دەخاتـە بـەر دەسـت. بێگومـان بـەو مەرجـەی فێـری چۆنیەتی ((بیـنین)) بین. لـەڕێی ئـەو شتانەوە کەلەم باسەدا بەرچاوتان کەوت دەتوانن لـەگرنگیی تێگەیشـتنی چەمکی گواستنەوە لە چاککردنی چۆنێتی ژیانی سیاسیو تاکە کەسدا ئاگادار بن.

## - زیاتر فراوانبوونو کامڵبوونی دەروونشیکاری

بـەڕای مـن دەتـوانین بـە شـێوەیەکی کـورت لەسـەر قوتابخانـە جۆراوجۆرەکـانی شـیکردنەوەی دەروونیـو ئاسـۆو فراوانبوونیـان لـە ئایندەدا بـدوێین. سـیگمۆند فرۆیـد یەکـەم کـەس بـوو کـە گەشـەو بەرکـەماڵی زیـاتری بـە دەروونشـیکاری بەخشی. ئەو لە بیستەکانی ئەم سەدەیەدا دەستی بەسەر لەنوێ پیاچوونەوەی تیۆریی هاندەرەکان (مۆتیڤەکان) ی خۆیداکرد کە لەسەر بناغەی ناکۆکیی نێوان هاندەری سێکسیو غەریزەی پاراستنی خود بوو، لەبری ناکۆکیی نێوان هاندەرە بایەلۆژیکـەکان پێشـنیاری تیـۆریی غـەریزەی ژیـانو غـەریزەی مـەرگی کـرد. خۆشەویستیی ژیان خەڵکی کۆك دەکاو غەریزەی مەرگیش بۆ وێرانکاری دنەیان ئـەدا. ئەمـە سـەرەتای قوتابخانـەی شـیکردنەوەی دەروونیـە کـە فرۆیـد بـە دامەزرێنەری دەژمێردرێ.

دووەمین هەنگاوی کامڵبوون دەروونشیکاریەکەی ((کارل گۆستاڤ یۆنگ)) ە. یۆنگ (کە وەکو ژمارەیەك دەروونشیکاری دی لە بیرو ڕاکانی فرۆید جیا بوو بۆوە) بە پێچەوانەی فرۆیدەوە، ڕۆڵی سەرەکی بە سێکس نەدا. ئەو ووزەی ڕۆحی (psychic energy) ی بەیەکەیەك دەژماردو زاراوەی ((لیبیدۆ)) ی تەنها بەسەر هێزی سێکسیدا دانەدەبڕی بەڵکو بەووزە دەروونیەگشتیەکانی دەزنی. یۆنگ بە ئاوەزێکی بەرزو قووڵەوە ئاشکرای کرد ئەو شتانەی دەروونشیکاران لەنەستی نەخۆشەکانیاندا دەیدۆزنەوە لە ئەفسانەو سیمبوڵەکانی میللەتانی جیهاندا بەرامبەریان هەیە (چ لە کەلتووره سەرەتاییەکانو چ لە کەلتووره پێشکەوتوەکاندا) .

ئەلفرێدئادلەر (١٨٧٠- ١٩٣٧) تێڕوانینێکی دیکەی هەبوو. ئەو مەسەلەیەی ئەو بایەخی پێئەدا ستراتیژی ململانێی مانەوە بوو نەك ئەفسانەو قووڵایی ڕۆح. هەر بۆیە ئەو ((مەیل بۆ دەسەڵات)) ی بە کلیلی تێگەیشتنی جووڵەو بزاوتەکانی ئادەمیزاد لەقەڵەمدا. بەڵام ناسینی تیۆریەکەیئادلەر بەهەمان ئەم سادەییە نییە. نووسینەکانی ئەو زۆر ئاڵۆزو مەعقولنو یارمەتیەکی زۆری ئێمە ئەدەن تا لەسروشتی ئادەمیزاد بگەین. هەروەها ئادلەر یەکەمین دەروونشیکارا بوو کە لە سیستمی دەروونناسیدا پایەیەکی سەنتەریی بۆ مەسەلەی شەڕەنگێزی لای مرۆڤ داناو، لەم بوارەدا پێش فرۆید کەوت.

دوو قوتابخانەی تریش هەن کە خاڵی هاوبەش لەنێوانیاندا زۆرە. یەکەمیان قوتابخانەی دەروونپزیشکی (Psychiatry) ە کە ئەدۆلف مایەری ئەمریکایی بە بنەچە سویسری دامەزرێنەری بوو، دووەمیشیان قوتابخانەکەی هاری ستۆك سۆلیڤانی دەروونپزیشکی ئەمریکاییە. دەروونناسی ئینگلیزیش رۆناڵدلینگ پەیڕەوی لە تێڕوانینو بیرو بۆچونەکانی سۆلیڤان دەکات. ئەم زانایانە وێڕای جیاوازیی بیروباوەڕیان دوو تێڕوانینی هاوبەشیان هەیە. یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو تیۆریە ڕەت دەکەنەوە کە مەیلی سێکسی بە ئەنگێزەی سەرەکی دادەنێ لای مرۆڤ. دووەمیش لەبری پەیوەندیە کەسیەکان بایەخ بەکاریگەریو کاردانەوەی

خەڵکی بەرامبەر بەیەکترو هەروەها بە بونیادی مەیدانی ژیانی هاوبەشی ئادەمیزادەکان ئەدەن. ئەوەی شایانی باسە هەردوو ئەم قوتابخانەیە تەوەرەی توێژینەوەکانیان بە دەوری ((شیزۆفرینیا)) دا دەسووڕێتەوە کە بە مانا باوەکەی بە نەخۆشیی نازانن و ئەو دیاردەیە بە ئەنجامی ئەزمونی تاکە کەس یان پەیوەندیی نێوان کەسەکان دەژمێرن کە دەرەنجامی کاریگەری بە دواوەیە، بەڵام شتێك ناخاتە سەر مەسەلەکانی دەروونناسی. بە تایبەتیش لینگ سوودێکی زۆری لەو تیۆریە دیوە، چونکە لە هەموو کەسێ باشتر توانیویەتی پەیوەندیی نێوان شیزۆفرینیا وەکو ((نەخۆشی)) یەکو باری کۆمەڵایەتیی ناو خێزان بدۆزێتەوە.

کۆمەڵێ دەروونشیکاری تریش هەمان باریان هەبوو. تیۆریەکانی فیرباك و گانتریپو بالینتو هەروەها تیۆریەکەی منیش، هەمان خاڵی سەرەتایان هەیە. خاڵی سەنتەر لەو تیۆریانەدا شیزۆفیرینیا ذیە" بەڵکو بەپلەی یەکەم ئەو هێزە کۆمەڵایەتیو دەستە جەمعیانەیە کە ڕۆڵیان لە فۆرمەلەی پەیوەندیەکانی نێوان تاکە کەسەکاندا هەیە.

ئێستاش، دوای ئەوەی کە چاوێکمان بەگەشە سەندنو کامڵبوونی دەروونشیکاریو دەسکەوتە دیارەکانیدا خشاند، پرسیارێك هەیە کە ئەبێ جێی سەرنجو بایەخمان بێ: ئاسۆی داهاتووی دەروونشیکاری چۆن دەبێ؟

گەرچی دەمەوێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، بەڵام چونکە بیرو بۆچوونی جیاوازو جۆراو جۆر هەیە وەڵامدانەوەی ئاسان نابێ. ئەکرێ ئەم پرسیارە بخەینە نێوان دوو باوەڕی سەرەکیەوە لە نێو باوەڕە جۆراو جۆرو جیاوازەکاندا: باوەڕی یەکەمیان دەڵێ: دەروونشیکاری کارێکی بێ هوودەیەو بە پێچەوانەی ئەوناو بانگەیهەیەتی سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوەو، چارەسەرکردن بەو ڕێگایەش ئاسنی سارد کوتانە. باوەڕی دووەمیش دەڵێ: دەروونشیکاری تاقە ڕێگەی چارەسەرکردنو ڕێگەچارەی مەسەلە دەروونیەکانە" گەر کەسێك کێشەیەکی هەبوو تاقە ڕێی چارەسەری ڕاکشانە لەسەر قەرەوێڵەیەكو شیکردنەوەی

دەروونیەتی بۆ سێ چوار ساڵ. تا ئەو دواییەش لە ئەمریکادا پەیڕەویی بۆچوونی دووەم دەکرا، بەڵام هاتنە کایەوەی شێوازی تری چارەسەرکردن ئەو کاریگەریەی نەهێشت.

بەبڕوای من ئەو رایەی کە دەڵێ دەروونشیکاری بێهودەیەو بێ کاریگەریە رایەکی نامەنتیقیە. چل ساڵ ئەزموونی منو توێژینەوەی هاوکارانم ئەو رایە ناسەلمێنن. جگە لەوەی نلبێ چاو لەو ڕاستیەش بنوقێنین کە زۆر بوار هەیە دەروونشیکاران تیایدا ئەو توانستەیان نیە. (هەموو پیشەیەکیش ئەم کەمو کورتیەی تیایە). دەروونشیکاری خەڵکێکی زۆری چارەسەرکردووە یان یارمەتی داون تا بۆ یەکەمجار خۆیان بناسنو ، لەگەڵ خۆیاندا راستگۆتر بنو، ئازاد تربنو، بۆ ئەوەی نزیکتر لە حەقیقەت بژین. ئەمانە کۆمەڵێ دەستکەوتی گرانبەهان کە بەکەم تەماشا دەکرێن.

هەڵبەتە هەندێ شتیش هەن کەلەسەر دەروونشیکاری حسێب کراون. خەڵکێکی زۆر دەرمان بە تاقە وەسیلەی چارەسەرو یارمەتیدانی ڕاستەقینە بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکانیان دەزانن. بەلای ئەوانەوە نەخۆشیەك ئەگەر دەرمانێکی خواردنی نەبێ چارەسەری نیە. رایەکی باوی تر ئەوەیە کە دەبێ لە توانامانـدا بێت هەموو نەخۆشیەکان وەکو یەك چارەسەر بکەین. ئەم بۆچوونە لە کتێبی ((من باشم، تۆ باشیت)) ی هاریس (T.A.Harris) دا هاتووە، ئەم کتێبە کتێبێکی کەم بەهاو لاساییکردنەوەیەکی ڕواڵەتیانەی تیۆریەکەی فرۆیدە. ئەو نووسینە لەشێوەی پێ وتنەوەدا ڕەنگە بۆ کەسانێك سوود مەند بووبێت کە باوەڕیان پێی بووبێت. ئەو ئامۆژگاریەی نووسەرەکە دەیکات زۆر سادە بووەو زوو پراکتیك کراوەو پێویستی بەبیرکردنەوە نەبووەو ، لەوەش خراپتر لە ئێمە چاوەڕێ ناکەن بەرهەڵستی بکەین. دەبێ هەموو شتێ سادەو ئاسان بکەینەوە. ڕۆژگار ئەمەی لێمان دەوێ.

ئێستا خەڵکی وا دەزانن دەبێ هەموو شتێك بە ئاسانی خواردنی حەبێك قوت بدەینو، ئەگەر فێربوونی شتێك پێویستی بەتەرخانکردنی کات هەبێ ئەوەندە گرنگ نىیە فێری ببین.

چیرۆکێکم لایە کە مەبەستم روون دەکاتەوە: پیاوێکی لاو دەچێتە چێشتخانەیەکی پلە یەکەوە، داوای مینۆ (لیستی خواردنەکان) دەکات، ماوەیەك لێی ورد دەبێتەوە، پاشان بە خزمەتکارەکە دەڵێ: ((ببوورە ئەو خواردنەتان نیە کە من ئەمەوێ)) چێشتخانەکە جێدەهێڵێت، بەڵام دوای دوو هەفتە بۆ هەمان چێشتخانە دەچێتەوە. خزمەتکارەکە لێی دەپرسێ (هەڵبەتە بە شێوازێکی رێزدارانە چونکە چێشتخانەکە بەرزە): ((جاری پێشوو چۆن ئەو خواردنەتان لە لیستەکەدا نەدۆزیەوەکە حەزتان لێی بوو؟)) کابرا لاوەکەش وەڵام ئەداتەوە: ((لە راستیدا ئەو خواردنەی من لەلیستەکەدا هەبوو، بەڵام دەروونشیکارەکەم ئامۆژگاریی کردووم کە جەسوورو یەك قسە بم)) بەو رەفتارە متمانەیەکی زیاتر بە خۆمان پەیدا دەکەینو وەکو کەسێکی دڵنیا دەنوێنینو سڵ لە خزمەتکارەکە ناکەینەوە، بەڵام پەی بە هۆی نائارامیی خۆمان نابەین. لەو راستیە بێئاگا دەبین کە دەمانەوێ بەچاوی پلەو پایەو سەرچاوەی دەسەڵاتەوە بڕوانینە هەرکەسێ . کە ئەمەش خۆی جۆرێکە لە گواستنەوە . تەنانەت گەر شێوازی ئەو پیاوە لاوە ئەنجامێکی راستەوخۆشی لە چێشتخانەکەدا هەبێو هەست بە متمانەیەکی زیاتریش دروست بکات" دیسان ناگەینە رەگو ریشەی هۆیەکانی ئاسوودە نەبوونی خۆمانو، لەو دیو رووکاری تازەیخۆمانەوە هەمان کەسی نائاسوودە دەمێنینەوە. بەڵکو بارمان خراپتر دەبێ چونکە ئیدی لەنائاسوودەیی خۆشمان بێئاگا دەبین. بۆچی نائاسوودەین؟ هۆی ئەوە ترس نىیە لە سەرچاوەی دەسەڵات" بەڵکو هۆیەکەی ئەوەیە کە مرۆڤێکی کامڵبووی تەواو نین، توانای رووبەڕووبوونەوەی خۆمان نىیە، لە قۆناغی منالّیدا ماوینەتەوەو هەر بۆیە پێویستمان  بە یاریدەی کەسانی دی هەیە، تەواو پێنەگەییوین، هەموو گیانمان پڕە لە  گومانو دوو دڵی بەرامبەر بە خۆمانو هتد.... لەم جۆرە حاڵەتانەدا

تەنانەت شێوازەکانی چارەسەری ڕەفتارگەرایش هیچی پێناکرێو، پەنابردن بۆیەوەك ئەوە وایە پیسیەکانی سەرفەرشێك بەجۆرێك گسك بدەیت بکەوێتە ژێر فەرشەکەوە،

بەڵام هەموو ئەو ڕەخنانەی لە دەروونشیکاری گیراون بێبناغەو ناڕەوا نین. وا لێرەدا باسی هەندێ لەو ڕەخنانە دەکەم کە بەدروستو مەنتیقیان دەزانم. زۆر جار دەرووونشیکاری دەگاتە ئاستی زۆر وتنو هەڵە وەڕی، تا ڕادەیەك هۆی ئەمەش بۆ تیۆریی وەیادهێنانەوەی ئازادی هزرو بیرەوەرییەکان (التداعی الحر‌ـ و ـ) ی فرۆید دەگەڕێتەوە. فرۆید دڵنیا بوو لەوەی کە هاندانی نەخۆشەکە بۆ وتنی هەرچیەك بەخەیاڵیدا دێ وای لێدەکات ئەوەی لە دەروونیدایە بیدرکێنێو بەم جۆرە دەروونشیکارەکە کۆمەڵێ شتی گرنگی واقعی چنگ دەکەوێ. بەڵام لە زۆربەی شیکردنەوە دەروونیەکانی نەخۆشەکاندا بۆ سەدەمین جار باسی جەفای مێردانو ڕەفتاری توندو تیژی دایکانو باوکان لە تافی مناڵیدا کراوە کە هیچ کێشەیەکی چارەسەر نەکردووە. گەرچی نەخۆش چەند جارێك بابەتێك دەگێڕێتەوە، گوێشی لێ دەگیرێ. ئەو هەست دەکات ئەو گوێگرتنو بایەخدانە بە قسەکانی دەبێتە هۆی چاك کردنی باری دەروونی ی، بەڵام ئەو جۆرە گفتوگۆو قسانەنەکەسێكو نەشتێکیان گۆڕیوە. مەبەستی فرۆید ئەوە نەبوو. بەڵکو ئامانجی کەشفی بەرەنگاریو ململانێ لەگەڵ ئەوەدا بوو. فرۆید هەرگیز نەیدەوت کە بەبێ هەوڵێکی فراوان و هەمە لایەنە دەتوانین لە کارەکانماندا سەرکەوین یا مەسەلە دەروونیە دژوارەکان چارەسەر بکەین، بەبێ هەوڵو کۆشش ناتوانین بە ئامانجەکانی ژیان بگەین، تەنانەت گەر پڕوپاگەندەو لافلێدانی پێچەوانەش هەبێ. هەرکەسێ لە هەوڵو تەقەلا بترسێت، هەرکەسێ لە ناکامیو تەنانەت ئازارو دەردیش بترسێت هەرگیز بە هیچ ناگات، بە تایبەتیش لە دەروونشیکاریدا.

نشوستیەکی دیکەی دەروونشیکاری لە ئەقلانیکردنی هەڵچوونەکاندایە. نەخۆشەکە بەجۆرێك باسی لێدانی خۆی لەلایەن دایە گەورەیەوە یا هەر ڕووداوێکی دی دەکات" تیۆریی لێ دروست دەکات. خۆ ئەگەر بڕوانامەیەکی

زانكۆییشی هەبێت لەوانەیە تیۆریەكی ئاڵۆزتری لێ دروست بكات. گەرچی لەوانەیە تیۆری پاش تیۆری بهێنێتە ئاراوە بەڵام (هەست بەهیچ ناكات)" پەی بەوەی دەروونی نابات. هەست بەترسەكەی خۆی ناكات. پەی بەبێتوانایی خۆی لە خۆشەویستیو هەروەها گۆشەگیری لە خەڵك نابات. بەرەنگاری ڕێی لێ دەگرێو ناتوانێ بەوانە بگات. بەم جۆرە دەروونشیكاری لەگەڵ زەمانەدا دەبێو بە تەنها بایەخ بە ((مرۆڤی خاوەن مێشك Cerebralman )) یا مرۆڤی ئەقڵگەرای پەتی ئەدات. ئێمە چاوەڕوانی ئەوەین لە ئەقڵ كە چاودێری هەموو شتێبێو هەڵچوونەكانو هەستو سۆزەكان كەلەبری پارسەنگو هێزی هاوسەنگین ئەفەرۆز ئەكەین.

هەیدێ ئەو كەسانەی كە هەر ئەوەندە تووشی سادەترین گیروگرفتی ژیان بوون یەكسەر دەچنە لای دەروونشیكارو، تەنانەت ئەوەندە ئەزیەتی خۆشیان نادەن كە ڕووبەڕووی گیروگرفتەكاتی خۆیان ببنەوە. خەڵكی ئەبێ كاتێ بچنە لای دەروونشیكار كە سەرباری هەوڵو كۆششەكانی خۆیان نەتوانن دەرك بەباری خۆیان بكەنو چارەسەری كێشەكانیان بكەن.

دەروونشیكاری باشترین شێوازی چارەسەركردنی ئەو گیروگرفتانەیە كە لە خود شەیدایی (نێرگسێتی) ەوە سەرچاوە دەگرنو دەبنە هۆی ئەوەی ئەو كەسە نەتوانێ لەگەڵ كەسانی تردا پەیوەندی ساز بكات. هەروەها دەروونشیكاری كاریگەرترین شێوازی چارەسەركردنی ئەو كەسانەیە كە تووشی وەهمو خەیاڵات، گەشە نەكردنی دەروونی، وەسواسی ئاو بەكارهێنانو ئەو نەخۆشیانە بوون كە هەست بە ناچاری ئەكەن تیایداو ژەینیان داگیر دەكات.

دەروونشیكاری ڕۆڵێكی دیكەشی هەیە كە گرنگیەكەی لە چارەسەركردن كەمتر نییە: دەروونشیكاری دەتوانێ ئاستی گەشەی ڕۆحیو وەدیهێنانی خود (Self Realization) بەرەو باڵاتر بەرێت. جێی داخە ئەمرۆكە بەتەنها كەمینەیەكی بچووك هەڵوەدای گەشەپێدانی رۆحی خۆیانو ئامانجی زۆربەی خەڵك هەبوونو سەرفكردنی زیاترە. ئەوانە وەختێ تەمەنیان دەگاتە بیست ساڵان ئیتر وا دەزانن

رۆحیان پێگەیشتووەو دوای ئەوە تەواوی ووزەی خۆیان بۆ سوود وەرگرتن لە ئامێری بوونی خۆیان بەکار دەهێنن. بەلاّم ئەو ئامێرە کاتێ لە سوودی ئەواندا کاردەکات کە بیانەوێ خۆیان بگۆڕن.

ئەگەر مرۆڤ بگۆڕێ ئیدی لەو وێنەیەدا نامێنێتەوە کە لای خۆی‌و خەڵك چەسپیوە، نازانێ دەساڵی تر چۆن بیر دەکاتەوەو ئەو گۆڕانە چ کاریگەریەکی لەسەر ئەو دەبێ. زۆربەی خەڵکی نایانەوێ گەشە بکەن‌و بگۆڕێن‌و ڕاستی دەربارەی خۆیان بزانن. دەیانەوێ ئەوەی‌لەبەر دەستیاندایە" تەنها سوود لەوە وەربگرن‌و بیکەنە دەستمایەی خۆیان.

بێگومان لەمەشدا ئاوارتە هەیە. هەندێ بزاڤی جیاواز هەیە، بە تایبەتی لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەبینرێ خەڵکێکی زۆر لەوە گەیشتوون کە تەنانەت ئەگەر خاوەنی هەموو شتێکیش بن، دەشێ شاد نەبن، دیسان ژیانیان بێ‌مانا بێ‌و بە دڵتەنگی‌و نیگەرانی بمێننەوە. ئەگەر ئامانجمان کرینی ئۆتۆمۆبێلێکی گرانبەها تر بێت ژیان چ مانایەکی ئەبێ. خەڵکی‌دیویانە کە چۆن باوو باپیرانیان تەواوی ژیانی خۆیان بۆ بەدەستهێنانی هەندێ شت بە فیڕۆ داوە کەبەخەیاڵی خۆیان بەدیهێنەری داخوازیەکانیان بوون.

ئەو کەمینە بچووکەی کە باسمان کردپەندێکی کۆنمان دووبارەبۆ کەشف‌و زیندوو دەکەنەوە: مرۆڤ تەنها بە پارچە نانێك ناژی، دارایی‌و دەسەلاّت دەستەبەری بەختەوەری نین، بە پێچەوانەوە دەبنە هۆی نیگەرانی‌و سستی. ئەم کەمینەیە ((بوون)) یان دەوێ نەك ((هەبوون)). دەیانەوێ زیاتر ئەقڵگەرابن‌و خۆیان لە وەهم‌و خەیالاّت ڕزگار بکەن‌و ئەو هەلو مەرجە کۆمەلاّیەتیە باوەی کە لەئارادایەو تەنها لەرێی وەهمەوە دەتوانرێ‌بپارێزرێ، هەلاّوگێڕ بکەن‌و بیگۆڕن. بەلاّم ئەم ئارەزووە زۆر جار شێوەیەکی سادە بەخۆیەوە دەگرێ. وەکو شەوق‌و تامەزرۆیی بۆ ئاینە خۆرهەلاّتیەکانی وەکو: یۆگاو زن بوودایزم هی‌تر.

بێگومان لێرەدا کە دەڵێم ((سادە)) مەبەستم سادەیی شێوازی مەیلی ئەو کەسانەیەو نەك ئەو ئاینانەی کە بەهیچ شێوەیەك سادەو سەرەتایی نین. مەبەستم

ئەوەیە کە ئەو کەسانە بە هەندێ قسەیوەرزشەوانێکی هیندی، کە خۆی لە ڕیزی پیاوانی پیرۆزدا دادەنێو لافی ئەوە لێدەدا کە دەتوانێ گەشە بەهەستەکانی مرۆڤ بدا، فریو دەخۆنو هەڵدەخەڵەتێن. بەڕای من لێرەدا دەروونشیکاری ئەرکێکی زۆر گرنگی هەیە. ئەم زانستە دەتوانێ لە ناسینی خۆمانو دەرکی واقعدا یاریدەمان بدا تا بتوانین خۆمان لە وەهمو نیگەرانیەکانو چاوچنۆکیو ئێرەیی پێبردن (حەسوودی) ئازاد بکەین. بە یاریدەی دەروونشیکاری دەتوانین بە دیدێکی دی لە دونیا بڕوانین. هەر ئەوەندەی توانیمان بەسەر ئەوەدا زاڵ بین کە ((خود)) تاقە سەنتەری بایەخدانی ئێمە بێتو، خۆمان بە کەسێکی کاراو هەستیارو نامۆ نەبوو بزانین، ئەوکات جیهان دەبێتە سەنتەری بایەخدانو خولیاو هێزە کاراکانی ئێمە.

دەتوانین ئەوە بەدی بهێنینو، دەروونشیکاری دەتوانێ لەم ڕێڕەوەدا یارمەتیدەرمان بێ، چونکە شێوازێکە ئەبێتە مایەی ئەوەی کە خۆمان چۆنین وا بڕوانینە خۆمان ، بزانین کێین لە کوێداینو، بۆ کوێ دەچین؟ بۆیە ئەبێ هامشۆی دەروونشیکارێك بکەین کە لەم چەمکانە دەگاتو ئامانجی شیکردنەوەی دەروونی بە یەکسانکردنو گونجاندنی مرۆڤ نازانێ، ماوەی شیکردنەوە دەروونیەکەش نابێ زۆر بێ، چونکە وا لەو کەسە دەکات بە دەروونشیکارەکەوە وابەستە بێ، دوای ئەوەی نەخۆشەکە فێر بوو چۆن ئامرازەکان بەکار بێنێ ئیدی دەبێ خۆی دەروونی خۆی شیبکاتەوەو تا ڕۆژی مەرگیش بەردەوام بێ. باشتریش وایە ئەو پرۆسەیە هەموو ڕۆژێك لەگەڵ هەناسەی قووڵو مەشقەکانی تێرامان Meditation بە شێوازی بوودایی ئەنجام بدرێ. گرنگترین مەرجی پارێزیش لە هەڵچوونەکانی ژیان، بە خۆدا هاتنەوەو واز هێنان لەکاردانەوەی بەردەوامی ئەنگێزەکانو ((خۆ خاڵیکردنەوە)) یە، هەڵبەت بەجۆرێك کە لەناوەوەی خۆماندا کارابین.

هەرکەسێ ئەم مەشقانە بکات تواناکانی هەستی خۆی قووڵتر دەکاتەوە . ساغو دروست ئەبێ . ساغ بە مانا پزیشکیەکەی نا بەڵکو بە چەمکە مرۆییە قووڵەکەی. بەڵام ئەم ڕەوتو پرۆسەیە پێویستی بە سەبر هەیە کە لای هەموو کەسێك نییە. ئەوکەسانەش کە ئەم ڕێیە ئەگرنەبەر، هیوام سەرکەوتنیانە.

# بەناوی (ژیان)ەوە
## - گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەریك فرۆمدا-

شـۆڵتز: مەبەسـتی ئێمـە لـەم دانیشـتنەدا گفتوگۆیـە نـەك چـاوپێكەوتن، گفتوگۆیـەكی بـێ خـۆ ئامادەكردن و بـێ بیركردنەوەیـەكی پێشترو بـێ هـیچ جـۆرە ئامـانج و بابـەتێكی دیـاری كـراو، بەتـەنها دەمانـەوێ قسـەبكەین و گـوێ بـدێرین و لەزەت بچێژین.

رۆڵـی مـن رۆڵـی كەسـێكە هاتۆتـە دیـداری نووسـەرێك كـە كتێبـەكانی خوێندۆتـەوە، واتـە خوێنـەرێك كـە دەیـەوێت لـەو شـتانە زیـاتر فێـر بێـت كـە لـە كتێبەكاندا نووسراون، هیوادارم ئەمشەو زۆربەی كاتی من بـۆ گـوێ گـرتن تـەرخان بێ، هەوڵ ئەدەم ئەو پرسیارانەی دەیانكەم وەها بن تـەنها ببنـە هـۆی ئـەوەی ئێـوە هان بدەن بۆ قسەكردن، نەك پرسیار بن بۆ روونكردنەوەی شتێكی دیاری كراو.

گەرچـی لەسـتۆدیۆی پەخشـدا دانیشـتووین، بـەڵام دانیشـتنەكەمان هێنـدە رەسمی نییـە، لەراستیدا خـەڵكی لەستۆدیۆدا بـۆ گفتوگـۆ دانانیشـن، ئـم شـوێنە شـوێنی ئامـادەكردنی نمایشـی سـەرگەرمكەری بینـەران و بیسـتەرانە، ئیـدی وەهـا بێت یان نـەبێت، بـەڵام مەبەستی ئێمـە ئەمشـەو تـەنها ئاخـاوتنی دروسـت و راسـتە لەگفتوگۆدا.

ریشـەی لاتینیـی هـەردوو وشـەی ( گفتوگـۆ conversation)و (conversion هەڵگێڕانـەوە) یـەك ریشـەیەو، دەشـێ هەڵگێڕانـەوە بەشـێكی جیانـەكراوەی هـەر گفتوگۆیەكی راستەقینە بێ، چونكە گفتوگـۆ جۆرێكـە لـەیاری كـە مەبەست تیایدا ئـاڵو گـۆڕە نـەك سـەركەوتن، یارییـەكی هـۆش و ئـاوەز (ئـەقڵ)ە كـە كـەس تیایـدا سەرناكەوێ، بەڵام هەموو براوە دەبن.

دوای ئەم پێشەکی‌یە پرۆفیسۆر فرۆم، دەمویست بپرسم، ئایا بەڕای ئێوە ئەم گفتوگۆیەی کە لێرەدا پێوەی مەشغولین، شایستەی ئەم رۆژگارەی ئێمەیە یان نە ء کێ دەتوانێ شتێك کە روو لەنەمانەو لەئاخرو ئۆخردایە سەر لەنوێ زیندووی بکاتەوە؟ ئێمە شایەتی مەرگی هێمنی هونەری نامە نووسین، ئایا دەکرێ هونەری گفتوگۆ لەنەمان رزگار بکرێ؟ جەخار رەحمەتەو ئەمەش خەسارەتێکی گەورەیە.

فرۆم: من پتر پێ دادەگرم و دەڵێم ئەو روو لەنەمانەی کە باست لێوە کرد نەك تەنها خەسارەتە، بەڵکو نەنگینەو مایەی شەرمەزاری‌یە، چونکە ئەوە نیشانەی کەموکوڕی‌ی فەرهەنگی ئێمەیە کە مایەی داخ و تەنانەت نوقڵانەی مەرگە، دەتوانم مەبەستی خۆم بەم جۆرە روون بکەمەوە: ئێمە زۆربەی کاتی خۆمان و توانای خۆمان لەکارێکدا سەرف دەکەین، کە دەسکەوتی تێدابێت، دەسکەوتی وەکو پارە یاناوبانگ، یا پلەو پایە،و کەمتر شان ئەدەینە بەر کارێك کە مەبەست و ئاکامێکی نەبێت، سەرنجی ئەوەمان نەداوە کە ئەنجامی هەر کارێك کە ئامانجێکی دیاریکراویشی نەبێت شتێکی شیاوو تەنانەت پەسەندو زیاتر شادی بەخشیشە، یەکێك لەگەورەترین خۆشیەکانی ژیان ئەوەیە کە مرۆڤ تواناکانی خۆی تەنها لەپێناوی چالاکی‌دا بخاتە گەڕ، بەبێ ئەوەی ئامانج و مەبەستێکی دیاریکراوی لەپشتەوە بێت، بۆ نموونە سەرنج بدەنە (خۆشەویستی) خۆشەویستی ئامانج و مەبەستێکی نی‌یە، گەرچی خەڵکانێکی زۆر هەن دەڵێن، خۆشەویستی ئامانجی هەیە، هەر خۆشەویستی‌یە وامان لێ دەکات پێداویستی‌ی سێکسیمان بۆ دابین بکات، بچینە ژیانی ژن و مێردایەتی‌یەوە، ببینە خاوەنی منداڵ و ژیانێکی ئاسایمان هەبێت، ئەمە ئامانجی خۆشەویستی‌یە لەم رۆژگارەداو هەر بۆیەش دەگمەنە، خۆشەویستی بێ مەبەست خۆشەویستی‌یەکە کە تەنها ئامانجی خودی خۆشەویستی خۆیەتی‌و بەس، لەم جۆرە خۆشەویستی‌یەدا رۆڵی ئەسڵی لە (بوون)دایە نەك لە (سەرف کردن)دا. خۆشەویستی‌ی بێ مەبەست واتە خستنەڕووی تەواوی توانا مرۆڤانە– خود بەیانەکان. بەڵام لەفەرهەنگی ئێمەدا (دونیای رۆژئاوا) کە لەکۆمەڵێك ئامانجی دەرەکی‌دا چڕبۆتەوە! وەکو

سەرکەوتن و بەرهەم هێنان و سەرف کردن، ئەو جۆرە خۆشەویستی یە کەمتر بەرچاو دەکەوێت و هێند دوور دەستە کە ناتوانین تەنانەت لەخەیاڵی خۆشماندا حەقیقەتەکەی بەرجەستە بکەین.

گفتوگۆ یان وەکو کەلوپەلێکی لێ هاتووە و یان هۆیەکە بۆ مشتومڕو ناکۆکی. ئەگەر وتووێژێك لەکۆبوونەوەیەکی گەورەدا روبدات، شێوەی زۆرانبازیی کابازەکان بەخۆوە دەگرێ، هەر تەرەفە هەوڵ دەدات بیناقاقای ئەوی تر بگوشێت و بیخنکێنێت. یاجڵەوی قسە دەگرنە دەست تاقسەزانی و ئاستی بەرزتری خۆیانی پێ بنوێنن، یان دەست دەکەن بەزۆر بڵێیی و بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە حەق لەگەڵ ئەواندایە. ئەو جۆرە وتووێژانە ڕێگایەکن بۆ ئەوەی مرۆڤ پیشان بدات کە تەنها بیرکردنەوەی ئەو راستە، نەك ڕێگایەك بن بۆ زانینی زیاترو بەدەست هێنانی بیروڕای نوێ، لەم دانیشتنی وتووێژانەدا هەر کەس بیروڕای تایبەتی خۆی هەیە،و دەزانێت کە بەرامبەرەکەی چ دەڵێت. ئەوەی جڵەوی قسە دەگرێتە دەست دەیەوێ بەقسەکانی خۆی ئەوە پیشان بدات کە کەس ناتوانێت ئەو قەناعەتەی کە هەیەتی پێ ی لەق بکات.

گفتوگۆی راستەقینە زۆرانبازی نی یە، بەڵکو ئاڵوگۆڕە، مەسەلە ئەوە نی یە کێ لەسەر حەقەو کێ لەسەر حەق نی یە، تەنانەت قسەی بەماناو قەناعەت پێ کەریش کرۆکی مەسەلەکە نی یە، بەڵکو گرنگ رەسەنایەتی ی جۆری گوتارەکەیە، نموونەیەك دەهێنمەوە تامەبەستم روون بکەمەوە، گریمان دوو هاوکار پێکەوە بەرەو ماڵ دەچنەوە، دوو کرێکاری کان یادوو دەروونناس، یەکێکیان دەڵێت: (ماندووبووم) ئەوی تریش وەڵام دەداتەوە (منیش) لەوانەیە ئەم گفتوگۆیە وەکو وتووێژێکی ساکارو ئاسایی بێتە پێش چاو، بەڵام وانی یە، چونکە ئەو دوو کەسە هەردووکیان یەك کار دەکەن، کەواتە جۆری ماندووبوونەکەشی دەوانن، بۆیە گفتوگۆیەکی رەسەن و مرۆڤانە لەنێوانیادا روو دەدات، (ئێمە هەردووکمان ماندووین و هەریەکەمان ئەوی تر لەرادەی ماندووبوونی یەکتر ئاگادار دەکاتەوە) .

(ئـەم وتووێـژە زیـاتر شایسـتەیە (گفتوگـۆ)ی بەسـەردا دابـڕین گـەر هـاتوو لـەنێون دووڕۆشنبیردا ڕوویدا کەسەرگەرمی باس کردن لەفلان یاهەمان تیۆرین.

هونەری گفتوگۆو ئەو خۆشیو لەزەتەی کە لێوەی دەستمان دەکەوێت زاریـیە (گفتوگۆ بـەو مانایـەی کـە پێویسـتی بەپەیوەنـدیو بەرامبـەر هەیـە دەشـێ شـێوەی تریش بگرێتە خۆی. وەك سەما...) ئەم جۆرە پەیوەندییانـە وەختـێ دێنـە دی کـە گـۆڕانی بنـەڕەتیو گـەورە لەفەرهـەنگی ئێمـەدا ڕووبـدات، واتـە کاتێـك کـە بتـوانین خۆمان لەتاکرەویو شێوەی ژیانی مەبەستدار ئازاد بکەین، دەبێ ڕوانینـی وەهـا پــەروەردە بکــەین کــە هێــزو توانــا شــاراوەکانی مــرۆڤ بــۆ چــالاکی هــان بــدات، بەواتایەکی سادەتر بەمەبەستی سودو سـەرف کـردنو بالابوونـەوە دەبـێ (بـوون – وجود) بەرامبەر (هەبوون – دارابوون) هەلبژێرین.

شـۆڵتز: ئەمڕۆکـە گەرچـی لـەجاران زیـاتر کـاتی ئـازاد هەیـەو دەرفـەتی پـتر بـۆ گفتوگۆ هەیە کەچی هەرچەند هەلومەرجە دەرکیـەکانی ژیـان زیـاتر ئـەو دەرفەتـە دەڕەخسـێنن ئـارەزووی نـاوەوە بـۆ لـەدەوری یـەکتر کۆبوونـەوەو گفتوگـۆکردن کـەم دەبێتەوە، زۆر هۆکار هەن بوونەتە لەمپەر لەبەردەم پێکەوە بووندا) گەلـێ ئـامرازو ئـامێر لەسـەری ڕێمـان وەسـتاون، دەڵـێی هۆکـارێکی تایبـەتی کاریگـەر ئێمـە لـە (گفتوگۆ) دوور دەخاتەوە

فرۆم: بەبڕاوی من ئـەکرێ بـوترێ کـە خـەڵکانێکی زۆر (ڕەنگـە زۆربـەبن) گومـان دەکـەن لەگـەڵ یـەکتردا بتـوانن هـەڵ بکـەن بـەبێ بەرنامەیـەکی کـار، بـەبێ ڕادیـۆو تەلەفزیۆنو بابەتێك بۆ باس لێوەکردن، نازانن بڵێن چی؟ لەوڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکادا هـەرگیز کەسـێك یـان دوو کـەس بـۆ مـاڵان دەعـوەت ناکـەن، نـازانم عادەتێکی وەها لەئاڵمانیش هەیە یان نە ء عادەت وایە کە هەمیشە دەبێ ژمارەی میوانەکان زیادبێ، چونکە ئەگەر بۆ نمونە تەنها چوار کەس بن، ئـەوا دانیشـتنەکە ساردو سڕ دەبێ، هەروەها گەر ژمارەی میوانـەکان کـەم بـێ، ئـەبێ خانـە خـوێ زۆر تەقەللا بکایو چی لەهەگبەکەیدایە هەڵیرێژێ تاکەش (جو)ی دانیشتنەکە ساردو سڕنەبێ، بەڵام گەر ژمارەکە بگاتـە شـەش کـەس، گەرچـی گفتوگۆیـەکی ڕاستەقینە

دروست نابێ، بەڵام ئەودەم وەك كەڕو لاڵەكان دانانیشن، بەردەوام یەكێك لەئامادەبووان بابەتێك دەهێنێتە گۆڕێ، كە قسەكانی یەكێك تەواو بوو، یەكێكی تر دەست پێ دەكاتو جڵەوی قسە دەگرێتە دەست، دەڵێی دوو گروپی كۆنشرتۆ بەنۆرە سەرگەرمی ژەنینی ئاوازێكن، دەنگی مۆسیقاكە ناپچڕێت، بەڵام گفتوگۆی راستەقینەش لەگۆڕێدا نییە، بەبڕوای من هەندێك هەن لەو بڕوایەدان كە ئەگەر نەتوانن میوانداریەكی لەو جۆرە دابین بكەن، ناچنەدڵەوە، راگەیاندنی كۆمەڵگای پیشەسازی ئەو بڕوایەی لای خەڵك دروست كردووە كە شادیو كامەرانی لەكڕینی شتدایە، ئەوانەی كە دەزانن ژیان بەبێ كڕینو هەبوونی شتیش مایەی ئارامیو خۆشحاڵییە ژمارەیان لەكەم بوونەوەدایە، ئەمەش گۆڕانێكی گەورەیە لەچاو جاراندا، من تەمەنم (٧٣) ساڵە، پەنجا ساڵ لەمەوبەر خەڵك، تەنانەت كەسانێك كە دەرامەتێكی مام ناوەندیان هەبوو، هێندە ئارەزووی خۆیان بۆ كڕینی كەلو پەلی (كەمالیات) پیشان نەدەدا، رادیۆو، تەلەفزیۆن،و ئۆتۆمبیل لەئارادا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا كۆڕو كۆبوونەوەو گفتوگۆ هەبوو.

هەڵبەتە ئەگەر گفتوگۆ وەكو هۆیەكی ساختەكاری تەماشا بكرێ دەبێتە قسەی پڕوپووچو بێهوودە، گفتوگۆی راستەقینە (لەسەر رێی راست لاناچێت) گفتوگۆی راستەقینە پێویستی بەچڕكردنەوەی ئاگا هەیە، چڕكردنەوەی تەواوی تواناكان، گەر كەسێك لەناخی خۆیدا زیندوو پڕ جموجووڵ نەبێ، قسەكانیشی بێ گیانو ساردوسڕ دەبێ، خەڵكانێكی زۆر ئەو توانایەیان تێدایە كە ئەگەر لەقاڵبی خۆیان بێنە دەرەوە، ئەو قاڵبەی كە لەترسی كەوتنە ناو پڕوپووچییەوە كردوویانە بەداڵدەی خۆیان، ئەوا بەرۆحو بەجۆشو خرۆش دەبن.

شوڵتز: لەپشت مایكرۆفۆنی رادیۆوە قسە دەكەینو كاری رادیۆو تەلەفزیۆنیش ئاگادار كردنەوەو سەرگەرم كردنی خەڵكە، هەڵبەتە لەچوارچێوەی ئەو سنوورە یاساییەی كە بۆ پەخشەكە دانراوە.

بەڵام لەسەرێكی دیكەوە هەروەكو ئێوەش ئاماژەتان بۆ كردو كەسیش نكووڵی لەوە ناكات كە رادیۆو تەلەفزیۆن خۆیان هۆكارێكی بنەڕەتیی نەمانی گفتوگۆن.

فرۆم: ئەم مەسەلەیە زۆر جێی بایەخی منە، حەزیش دەکەم لەم رووەوە ئێوەش باس لەئەزموونی خۆتان بکەن، ئایا رادیۆو تەلەفزیۆن کاریگەرییەکی چوون یەکیان لەسەر خەڵك هەیە، یالەرووی کاریگەریەوە جیاوازن؟

شۆڵتز: بەرای من ئەو دوو دەزگایە جیاوازیەکی زۆریان هەیە. لەتوێژینەوە زانستیەکاندا سەبارەت بەجیاوازی کاریگەریی رادیۆو تەلەفزیۆن هێشتا ئەنجامێکی تەواو بەدەستەوە نەدراوە، بەرامبەر بەمە وەڵامی من لەئەزموونی خۆمو رادەی ئەو کاریگەریە لەسەر هزرم سەرچاوە دەگرێت.

بەڕای من رادیۆو تەلەفزیۆن هۆیەك نین بۆ گفتوگۆو ناڕاستەوخۆ کاردەکەن، لەلایەکەوە کەسێکی (گەیەنەر) هەیەو لەلاکەی ترەوە (وەرگر) ئیتر نەناکۆکی لەگۆڕێدایەو نەوەڵام، وەختێ کە رادیۆو تەلەفزیۆن پێ دەکرێن گفتوگۆ دەوەستێت، رادیۆو تەلەفزیۆن دەتوانن هەستی گفتوگۆ بورووژێنن، بەڵام ناتوانن دروستی بکەن، ئەمەش یەکێکە لە سیفەتە دیارەکانی دەزگاکانی ئێمە، دەبێ لەوە بکۆڵینەوە کە ئایا رادیۆو تەلەفزیۆن ئێمە بۆ گفتوگۆ هان دەدەن یان بۆ گفتوگۆ زیانبەخشن، دواجار دەڵێین کە لەم رووەوە زیانی رادیۆ لەتەلەفزیۆن کەمترە.

تەلەفزیۆن لەهۆیەکانی تری راگەیاندن پتر دەبێتە هۆی خرۆشانو، باشترین هۆیە کە بۆ (کات بەسەر بردن) دامان هێناوە، بەڵام گفتوگۆی راستەقینە پەیوەستە بە(کات)ەوە، ئێمە گەر کات بەسەر بەرینو بیکوژین گفتوگۆ گەشە ناکات، بەڵام رادیۆ ئەو قودرەتەی نیە بەڵکو پێویستی بەئاگاو خەیاڵی زیاتر هەیە، دەکرێ رادیۆ سەرچاوەیەکی بەردەوامی چەشنەها بابەتی گفتوگۆ بێت، گەرچی خۆی راستەوخۆ هۆیەك نیە بۆ گفتوگۆ بەڵام دەتوانێ زەمینەی بۆ خۆش بکاتو دەتوانێ سەرنجمان بۆ گفتوگۆی رووبەڕوو راکێشێتو بەو جۆرە لەزەتمان پێ ببەخشێت.

فرۆم: هەڵبەتە قسەکانتان بۆ من پڕ مانان ، منیش دەمەوێ ئەزموونی خۆم لەم رووەوە وەکو گوێگرێكو بینەرێك بخەمە سەر قسەکانی ئێوە، کاردانەوەی هاوسەرەکەشم بەرامبەر رادیۆو تەلەفزیۆن وەکو هی من وایە، حەزم ئەکرد رای

ئێوەو گوێگرانیشم بزانیایە تائاگاداری کاردانەوەتان بم، وەختێ گوێ بۆ رادیۆ شل دەکەم، هەست دەکەم هێشتا کەسێکی ئازادم، هەر کاتێك حەزم لەگوێگرتنی بەرنامەیەك بێ لەو کاتەدا رادیۆکە دادەگیرسێنم (ئالوودەی نەبووم). گوێ گرتن لەرادیۆ وەکو قسەکردن بەتەلەفۆنە. بێگومان ئەوەی لەرادیۆ دەیبیستین بەپێچەوانەی گفتوگۆی تەلەفۆنی شتێکی تایبەتی نىیە، هۆگری رادیۆ یاتەلەفۆن نابین، بۆیە لەگوێگرتن یانەگرتن ئازادین، بەڵام کاردانەوەم بەرامبەر تەلەفزیۆن تەواو جیاوازە، بەرامبەر تەلەفزیۆن بڕێك ئازادیی خۆم لەدەست دەدەم وەختێ تەلەفزیۆن دادەگیرسێ، وێنەکە دەبینم، لەراستیدا ناچار دەبم تەماشا بکەم. هاندەرێك یائارەزوویەکی بەتین من بۆ تەماشاکردنی رادەکێشێت گەرچی دەشزانم بەرنامەکە شتێکی بێ کەڵکەو هەڵەوەرییە، بێگومان ناشڵێم کە هەموو بەرنامەکانی تەلەفزیۆن پڕوپووچ و بێ مانان، بەڵام مەبەستمە بڵێم کە تەنانەت بەرنامە هیبچەکانیش من بەلای خۆیاندا رادەکێشن.

هێزی راکێشانی تەلەفزیۆن لەرادیۆ زیاترەو سیحرێکی سایکۆلۆژیی وەهای هەیە کە وەسف ناکرێ، لەو بڕوایەدام کە ئەو راکێشانە رەگ و ریشەیەکی قووڵی لەسروشتی ئێمەدا هەبێ، تەنها بەدوگمەیەك دونیایەکی دی دەهێنینە ناو ماڵەکانمانەوەو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ غەریزەو حەزمان بەسیحر.

من لەگەڵ تەلەفزیۆندا وەکو جۆرە خودایێکم لێ دێ دەتوانم لەراستیەکانی ژیان جودابیمەوەو لەبری ئەوە جۆرە راستیەکی دی بخولقێنم کە لەرێی دوگمەیەکەوە بۆم دێتە دی. کەم تازۆر وەکو خودایەکی خولقێنەرم لێ دێ، دونیایەك کە دەبینم ئافەریدەی خۆمە. چیرۆکێکم هاتەوە یاد کە بەڕاستی رووی‌داوەو مەبەستم روون دەکاتەوە، باوکێك لەگەڵ کوڕە شەش ساڵانەکەیدا بە ئۆتۆمۆبیلەکەیان لەکەشێکی باو باراناویدا رێ دەبڕن، ئۆتۆمۆبیلەکە پەنچەر دەبێ‌و باوکەکە دەوەستێت تا تایەکە بگۆڕێت ، لەو کەشە ناهەموارەدا کە گۆڕینی تایەکە گەلێ دژوار بوو کوڕەکە بەباوکی وت: (بابە ناتوانین کەناڵی تەلەفزیۆنەکە بگۆڕین؟) مناڵەکە دونیای بەو جۆرە دەبینی، گەر دیمەنێکمان بەدڵ نەبێ کەناڵەکە دەگۆڕین.

هاوســەرەکەم لــەم دواییــەدا باســی چــیرۆکێکی لەهســتانی بــۆ کــردم کــە خوێندبوویەوەو گەلــێ سەرسووڕهێنەر بوو، چیرۆکەکە دەربارەی کوڕی کابرایەکی گەلــێ دەوڵەمەنـدو نائاسـاییە، کوڕەکـە لـە خانوویـەکی زۆر گـەورەدا پـەروەردە دەکرێ، بەڵام فێری خوێندنـەوەو نوسـینی ناکەن و هـەرگیز لەگەڵ کەسیشدا قسـە ناکـات و تـەواو لـەدونیای واقع دابڕاوەو تـەنها تەلـەفزیۆنێکی هەیـە، تـەواوی رۆژ تەلـەفزیۆن دەکاتـەوەو ئـەوەی دەیبینـێ بەراستـەقینەی دەژمێـرێ، بـاوکی دەمـرێ و کوڕەکەش ناچار ئـەو خـانووە جـێ دێڵێـت و دەچێتە نـاو خەڵکەوە، بەڵام هەست بـەوە ناکـات کـە ئـەوەی لەکۆمەڵـدا دەیبینـێ واقیعێکـە تـەواو جیـا لەوێنـەکانی تەلـەفزیۆن، ئـەو لاوە ورتـەی لێـوە نایـەت، ئەسـڵەن هـەر نازانـێ قسـە بکـات و هـیچ نازانــێ، تــەنها دەزانــێ تەماشــا بکــات چــونکە دنیــا بــەلای ئــەوەوە بریتیــە لەنمایشێکی تەلەفزیۆنی و هیچی تر، سەرئەنجام رێی دەکەوێتـە ماڵی کابرایـەکی ئـەمریکایی و لەبـەر ئـەوەی ورتـەی لـەدەم نایەتـە دەرەوە بەکەسـێکی زۆر مـوهیمی دەزانـن، بـەزوویی نـاوی دەکەوێتـە سـەر زمانـان و ئاخرییەکـەی بـۆ سـەرۆکایەتی کۆمار دەپاڵێورێ، چونکە بەردەوام ورتەی لێوە نایەت.

ئـەم چـیرۆکە ئـەوە روون دەکاتـەوە کـە مـن مەبەسـتمە، دونیـای واقیـع و ئـەو شتانەی تەلەفزیۆنەکە پیشانی دەدا بوونە یەك، توانستی خستنە نـاو دونیایـەکی دیکەوە بەهۆی یەك دوگمەوە ئـەزمونێکی لەخشـتەبەرە، مـەرجیش نییـە ئـەو شـتە (بــاش) بێــت کــە لەتەلەفزیۆنــدا پیشــان دەدرێ تــا بــەلای خۆیــدا راتبکێشــێت، سیحری ئەو راکێشانە لەماهیەتیدایە، خـەڵکی چۆن لـەدەوری ئاگرێك کۆدەبنـەوە کـە کەوتۆتـەوە، یـان هـەر دیمـەنێکی سـەرنج راکێشـی دی، ئاوەهـاش هـۆگری ئـەم سندووقە سیحرییە دەبن.

شۆڵتز: بەڵێ، بەرانبەر تەلەفزیۆن شوێنێك هەیە کە خەڵکی وەك بینـەر دەمێننـەوەو هـەرگیز خۆیـان ئامـادەی ئـەنجام دانـی کارێـك ناکـەن و لـەبارێکی (ناکـارایی)دان، بـەڵام دەکرێ گوێگرتن لەرادیۆ وەکو وەرامێك تەماشا بکرێ، وەکو جۆرە ئامادەبوونێك بۆ چالاکی کە نابێ لەگەڵ چاوەڕوانی بۆ ئاگاداریدا تێکەڵ بکرێ.

پرۆفیسۆر فرۆم، ئێستاش پرسیارێکی ترم هەیە، دەڵێن لەدۆخێکدا نیت کە بتوانیت دەربارەی ئەڵمان بدوێیت، بەڵام تەلەفزیۆن گۆڕانکارییەکی ریشەیی لەخودی گوێگرتنی ئێمەدا هێناوەتە ئاراوە، تەلەفزیۆن بووەتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی خووی سەرنج دانی وردیان لەبیر بچێتەوە، بۆیە ئێستا لەو بڕوایەدا نیم گوێ بۆ ئەم گفتوگۆیەی ئێمە رادێرن، پرسیارەکەم ئەوەیە: ئایا رادیۆش هەرزوو ئەو دەورەی نەبینیوە؟ ئایا دەربارەی رادیۆش ئەوە راستە کە ئیتر ئەوەندە گوێی بۆ نادێرن و سەرنج راناکێشێت؟ ئایا نابێ رادیۆ لەم رووەوە فریای خۆی بکەوێت؟ تەلەفزیۆن کاریگەریی رادیۆی تەواو کەم کردۆتەوە، لەراستیدا وای لێ هاتووە کە ئیدی رادیۆ وەکو هۆیەکی راگەیاندن نازمێردرێ، بێگومان دەبێ سوپاسگوزاری ئەمە بین، کەواتە ئەی نابێ ئەرکی تازە بەرادیۆ بسپێردرێ بەجۆرێك کە جیای بکاتەوە؟

فرۆم: من ناتوانم رابدەم، چونکە ئاگاداری بەرنامەکانی رادیۆی ئەڵمان نیم، بەڵام ئەوەی ئێوە وتتان مەسەلەیەکی گرنگە، دەزانم رادیۆی ئەڵمانی خوارووو بەرنامەی فراوانی هەیەو بابەتی وەها پەخش دەکات کە لەئاستی زانستو وانە زانکۆییەکاندایەو دەشێ زمانی لەزمانی ئەوانیش سادەتر بێت (وانە وتنەوە بەزمانی سادە لەزانکۆکاندا دەبێتە هۆی تێگەیشتنی باشتری وانەکان) رادیۆ رۆڵی فێرکردن ببینێت شتێکی زۆر چاکەو هەروەها ئەو شتەی ئێوەش گوتتان دەربارەی سەرنجدانی ورد مەسەلەیەکی گرنگە، ئەمڕۆکە خەڵکی چ لەبیرکردنەوەدا، چ لە ژیانو چ لەکاردا کەمتر ورد ئاگان، کا هێندە پچڕ پچڕو پەرش و بڵاوە کە بەتەنها وردئاگایی (ترکیز)ی میکانیکی لەتوانادایە. وردئاگایی تەواو دەگمەنە. کرێکارێك ئەوەندە پێویستی بەوردئاگایی هەیە کە بتوانێ لەکاتی دیاری کراودا بورغوەیەك لەدوایەکەکان قایم بکات، ئەم وردئاگاییە لەگەڵ کۆکردنەوەی تەواوی تواناکاندا جیاوازە. لەرێی وردئاگایی راستەقینەوە دەکرێ گوێ شل بکەیت بەبێ ئەوەی بیرو هزرت بئاڵۆزێت، وەك بەڵگەنەویستێك هیچ کارێك بەبێ وردئاگایی ئەنجام نادرێ، ئەوەی کە بەبێ وردئاگایی ئەنجامی

دەدەین بەهایەکی ئەوتۆی نابێت، گەر وردئاگایی نەبێ چالاکیەکانمان قەناعەت پێ کەر نابن، ئەم راستیەیە بەسەر گشت کەسێکدا وەك یەك دەسەپێو تایبەت بەهونەرمەندان یازانایان نیە.

شۆڵتز: پرۆفیسۆر فرۆم، بەیارمەتیی خۆتان، چەند خولەکێك گفتوگۆکە دەپچڕم، تاکورتەیەکی ژیانتان پێشکەش گوێگران بکەم.

ئەریك فرۆم Erich Fromm لە ٢٣ی مارسی ١٩٠٠ لەفرانکفۆرت لەدایك بووە، تاقانەی خێزانەکەی بووەو لەسەر ئایینی یەهود پەروەردە بووە. دواتر دەربارەی ژیانی پێشووی پرسیاری لێ دەکەین، چیرۆکەکانی چاخی کۆن (العهد القدیم) کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر فرۆم. لەلاوێتیدا هەڵوەدای ئاشتیی جیهانی بووە، جیهانێك کە تیایدا گورگو مەڕ لەیەك سەرچاوە ئاو بخۆنەوەو مەیلێکی تەواوی بۆ ئینتەرناسیۆنالیسمو ژیانی سۆشیالیستیی میللەتان هەبوو، لەساڵی ١٩١٤دا کەقوتابیی ئامادەیی بوو، هیستریاو بێ ئاوەزیی جیهان کە بووە هۆی جەنگی جیهانیی یەکەم تەواو ناخی هەژاند.

هەمان ئەو رۆژانە پێشهاتێك روویدا کە کاریگەریەکی قووڵی کردە سەر نەشونماو ئایندەی فرۆم. ئافرەتێکی هونەرمەندی لاوو جوان کە دۆستی خێزانەکە بوو، مەرگی باوکی وەها کاری تێ کرد کە گەیشتە ئەوی خۆی کوشت، لەوەسیەتنامەکەشیدا نووسیبووی کە لەگەڵ باوکیدا لەیەك شوێندا پێکەوە بیاننێژن، مەرگی ئەو ئافرەتە وەك بربەنێك رۆحی فرۆمی وردو خاش کرد- ئەمە چ خۆشەویستیەك بوو کە بەسەر هەموو لەزەتەکانی تری ژیانی ئەو ئافرەتەدا زاڵ بوو؟ ئەو رووداوەو پرسیارەکانی ئەو رووداوە وای لەفرۆم کرد سەرگەرمی شیکاری دەروونی بێتو لەئەنگێزە (دافع)ەکانی رەفتاری مرۆڤ بکۆڵێتەوە.

فرۆم وەختێ قوتابیی زانکۆ بوو کۆمەڵێك بیرمەند (مفکر)ی ناسی کە زۆر لەپێغەمبەرانی چاخی کۆن دەچوون، نووسینەکانیانی لەبەر دەکرد، بوودا، مارکس، باخ ئۆفنو فرۆید قووڵترین کاریگەریی فیکرییان لەسەر ژیانی فرۆم هەبوو، گەرچی ئەم بیریارانە لەرووی فیکرو رێبازەوە لەیەکدی جیاواز بوون، بەڵام

فرۆم هەوڵی‌دا خەتی هاوبەش لەنێوانیاندا بدۆزێتەوە، دواتر لەم بارەیەشەوە دەدوێین.

فرۆم لەزانكۆی هایدبێرگ، دەروونناسی‌و فەلسەفەو كۆمەڵناسی‌ی خوێند. لە ٢٢ساڵی‌دا دكتۆرای وەرگرت‌و پاشان لەمیونخ و فرانكفۆرت درێژەی بەخوێندنی خۆی‌داو سەرەنجام لە ١٩٣٠دا لەدەزگای شیكاریی دەروونی‌ی بەرلین بووە پسپۆڕ. جگە لەدەزگای شیكاریی دەروونی‌و مەڵبەندی لێكۆڵینەوە كۆمەڵایەتیەكان لەفرانكفۆرت وانەی دەوتەوە، فرۆم لە ١٩٣٤دا چوو بۆ ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاو لەوێ لەچەند زانكۆیەك وانەی وتەوە، كۆمەڵێك دەزگای گرنگی شیكاری دەروونی‌و دەروونناسی‌و كۆمەڵایەتی‌ی دامەزراند، لەهەمان كاتدا لەعیادەكەی خۆیدا سەرگەرمی شیكردنەوەی دەروونی بوو، لەساڵی ١٩٤٩دا لەزانكۆی مەكسیك پایەیەكی پێ دراو دوای خانەنشینی لە ١٩٦٥دا بڕوانامەی دكتۆرای ڕێزلێنانی ئەو زانكۆیەی قبووڵ كرد، فرۆم لەو ماوەیەدا لەمەكسیك كاری جیا جیاو كاریگەری ئەنجامدا. ساڵانێكە لەتیسین ( Tessin كە شارێكە لەسویسرا) نیشتەجێ بووەو تەنها سەرگەرمی نووسینەو گەرچی هەندێ جار لەمەكسیك‌و نیویۆركیشدا وانە دەڵێتەوە.

پرۆفیسۆر فرۆم بەردەوام لەتەقەلادا بووە لەپێناوی ئاشتی‌داو یەكێكە لەبنیادنەرانی ڕێكخراوی گشتی ئاشتی ئەمریكا (SANE). ئەم دەزگایە جگە لە چالاكی خۆی دژ بەچەكی ئەتۆمی پەرەسەندوو، هەڵوێستی ناڕەزایی بەرامبەر جەنگی ڤیەتنام پیشاندا.

فرۆم لەساڵانی پەنجاكاندا بووە ئەندامی حیزبێكی سۆشیالیست، بەڵام هەر زوو كەناری گرت چونكە بەلایەوە ئامانجەكانی حیزب بەقەدەر پێویست رادیكال نەبوون، كاری فرۆم لەئامێتەكردنی تیۆری شیكاری دەروونی لەگەڵ سوشیالیسم لەمەكسیك‌و تیۆری‌یە نوێ كراوەكەی فرۆید كە هۆكارەكان بۆ لایەنی ئینسانی‌و كۆمەڵایەتی دەگەڕێنێتەوە (لای فرۆم) كارێكی زۆر گرنگ بوو، بەو نووسینانەدا دەچووەوە كە زانایان لەهەموو قوژبنێكی جیهانەوە بۆ سیمپۆزیۆمی هیومانیزمی

سۆشیالیستی (کۆڕی مرۆڤایەتی سۆشیالیست) دەیانناسن. کەم کەس وەك فرۆم بایەخی بەمەسەلە سیاسیەکان داوە، کتێبی (شۆڕشی هیوا Rovolution of Hope) وەك پەیامێکی جەدەلیە کە بۆ پشتیوانی کردن لەپالاوتنی (یۆجین ماك کارتی) بۆ سەرۆکایەتی کۆماری ئەمریکا نووسیویەتی، فرۆم پشتیوانی لەو سیناتۆرە دەکرد کە رەگێکی شاعیرانەو فەیلەسوفانەشی تێدا بوو، فرۆم توانای زیندوو کردنەوەی هیواو ئومێدی هاونیشتمانانی لەماکارتیدا دەبینییەوە. چونکە فرۆم هیوا بەیەکێك لەوەسیلەکانی سیاسەت دەزانێت، لەسیفەتە دیارەکانی پرۆفیسۆر فرۆم ئەوەیە کە بیروڕاکانی، گوتەکانیو کردەوەکانی ناسکولاییو نابلاون، سیفەتێك کە لە ئەهلی قەڵەمو زانکۆدا کەمتر بەرچاو دەکەوێ، بیروڕاکانی بێ رەنگ نین بەڵکو سەر شارن لەهەستی ژیانبەخشیو، پەردەو تۆز لەسەر رێ دادەماڵێتو رێی نوێ بۆ گەڕانو پشکنین دەخاتە سەرپشت، لەبیروڕای رێبەستو وەستاو بێزارە، لەزمانی عیبریدا رۆح (spirit)و با (Wind) یەك وشەن، بۆیە ئەویش هەمیشە بە(ناتەواوی) (واتە کۆتایی پێ نەهاتوو) دەمێنێتەوە، نەدۆستەکانیو نەدوژمنەکانی، نەهەوادارانیو نەناحەزەکانی ناتوانن خۆیانی لێ لابدەن.

پرۆفیسۆر فرۆم، دوای ئەوی کە من کورتەیەکم لەمەڕ ژیانی ئێوە پێشکەش کرد، ئایا دەکرێ شتێك دەربارەی خۆتان بدوێن؟ لەنووسینەکانتاندا چاوم بەعیبارەتی (بایۆگرافیی رۆشنبیر) کەوتووە، کاریگەریی تافی لاویو قوتابێتی لەژیانتاندا چی بووە؟

فرۆم: هەندێ خاڵ هەن باسکردنیان بایەخی هەیە، تاقانەی دایكو باوكو نیگەرانییان لەسەرم هەڵبەتە کاریگەریەکی خراپی لەمندا جێ هێشتووە، بەلام بەدرێژایی ژیانم هەوڵم داوە ئەو کەلێنانە پڕ بکەمەوە.

ئەوەی کارێکی باشو راستەوخۆی لەسەر من کرد، ئایینی بنەماڵەکەمان بوو، من لەدایكو باوکێکی یەهوودی ئایین پەروەر هاتوومەتە دنیاوە، کە باووباپیرانیان زانای ئایینی بوونو، بەگیانی ئەو ئایینە کۆنە گۆش کراوم کە ئایینێکی پێش

بۆرژواو پێش سەرمایەداریو پتر سەر بەسەدەکانی ناوەڕاست بووە، نەك سەدە نوێکان. ئاینی یەهوود لای من زیاتر ئەو ڕووەی ڕاستەقینە بوو کە لەدابو نەریتەکانی سەدەی بیستەمدا پێوەی پەیوەست بووم، لەقوتابخانەو پەیمانگای ئاڵمانی خوێندنم تەواو کرد، پاشان چونکە زانکۆو بەقووڵی کەوتمە ژێر کاریگەریی فەرهەنگی ئەڵمانییەوە. دواتر لەم بارەیەوە قسە دەکەم.

هەستی من گۆشکراوی جیهانێکی کۆن بوو، نەك جیهانێکی نوێو مۆدێرن، جیهانێك لێواو لێو لەخوێندنەوەی (تەلمود)و کتێبی پیرۆز)و بیستنی بەسەرهاتی باوو باپیرانم، کە لە دونیای پێش بۆرژوازیدا دەژیان، بانموونەیەك بهێنمەوە تاپتر مەبەستم ڕوون بێ، یەکێك لەباپیرانم تلمودزایێکی گەورە بوو، بەڵام بەزانایەکی ئایینی لەقەڵەم نەدەدرا، دوکانێکی بچوکی بەدەرامەتێکی کەمەوە لەباڤاریا هەبوو، ڕۆژێکیان پێشنیارێکی کارێکی تریان خستە بەردەم کە پارەیەکی باشی لێ دەست دەکەوێت، بەڵام دەبووایە جار جارێك بۆ ئەم لاو لا سەفەری بکردایە، ئەمیش ماڵو منداڵی زۆر بوو، ئەم کارەش وەك دەرگا والابوونێك بوو لەبەردەم ژیانیدا، مەسەلەکەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا باس کردو وەرامی ئەویش وەها بوو کە (باش بیربکەرەوە). مانگی سێ ڕۆژ سەفەر دەکەیت، لەبری ئەوەش کەمێك دەرامەتمان باش دەبێ) کەچی باپیرم وتی: (دەتەوێ ئەو کارە قبوڵ بکەمو لەمانگێکدا سێ ڕۆژ تلمود نەخوێنمەوە) ژنەکەشی دەڵێ: (بەخوا نە ؛ ئیتر ئەو کارە ڕەت دەکاتەوەو هەر لەدوکانەکەی خۆیدا دادەنیشێت و سەرگەرمی خوێندنەوەی تلمود دەبێ، هەر کە کڕیارێکیش دێ بۆ دوکانەکەی تاشتێکی لێ بکڕێت، سەر لەسەر کتێبەکە بەرزدەکاتەوەو دەڵێت:

(ناتوانیت بچیت لەدوکانێکی تر بیکڕیت؟) ئەمە دونیای ڕاستەقینەی من بوو، بەڵام دونیای نوێ بەمن نائاشنا بوو).

شۆلتز: تاکەی؟

فرۆم: تائەمڕۆ. دێتە بیرم کاتێك تەمەنم دە دوانزە ساڵان بوو، وەختێ فرۆشیارێك یان سەنعەتچییەکم دەبینی واقم وڕ دەماو لەدڵی خۆمدا دەموت:

(خوایە، ئەم کابرایە چۆن دەتوانێ ژیانی خۆی بۆ پارە پەیداکردن تەرخان بکاتو هیچی تر نەکات؟) ئێستا ژیان فێری کردووم کە دەشێ مرۆڤ تەمەنی خۆی بۆ پارە کۆکردنەوە تەرخان بکات، بەلاَم تائێستاش لەو جۆرە شێوازەی ژیان واقم وڕ دەمێنێ، من بەکارو کاسپیو فەرهەنگی بۆرژوازی بێکانەمو، هەر بۆیە تێڕوانینێکی وام بەرامبەر کۆمەڵگای بۆرژوازیو سەرمایەداری لادروست بوو و بوومە سۆشیالیست. ئەو کۆمەڵگایەی کە بەرامبەری خۆم دەمبینی هەروەها بەرژەوەندییەکانی ئەو کۆمەڵگایە، گوزارشتی لەتەرزی بیرکردنەوەی من نەدەکرد، هەمیشە بەرامبەر بەبارودۆخی باو خۆم بەنامۆ زانیوەو سەرسام بووم چۆن سیستمێکی وەها هاتۆتە گۆڕێ.

شۆڵتز: بەلاَم بێگومان ئەزموونی وەهاتان هەبووە کە دژ بەو هەستە ڕۆنراوە، بۆیە ناکرێ بوترێ کە دونیای نوێ کاری لە بیرو ژیانی ئێوە نەکردووە، دونیایەك کە بەمەترسیی گەورەو ئومێدی گەورەوە هاتۆتە گۆڕەپانەکەوە.

فرۆم: وەلاَمەکەی من زۆر سادەیە، ئەوەی منی هۆگری دونیای نوێ کرد، هەندێ سەرچلوەن کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی پێش بورژوازی، سپنۆزا بوو، مارکس بوو، باخ ئۆفن بوو، من هاویاری ئەوانە بووم، لەوانەدا پردێکم دەبینییەوە لەنێوان ڕابردوویەکدا کە بۆ من زیندوو بوو، لەگەڵ دونیایەکی نوێدا کە خۆشم دەویست هەندێ لایەنی دونیای نوێ کە ڕیشەیان لەڕابردوودا هەبوو بەمن نزیك بوو، بۆیە ناکۆکییەکم لەنێوان ئەو دوو دونیایەدا نەدەبینی، ئەمە بوو ئەو دونیایەی کە من دەمناسی، ئەو دونیای کە لەزەتم لێ دەبینیو لەئەنجامدا خوازیاری هەر شتێك بووم کە ئەڵقەی پەیوەندیکەری نێوان کۆنو نوێ بوو.

شۆڵتز: ئایا ئەم بیروڕایانە لەتافی قوتابێتیدا لەئێوەدا پەیدا بوو یاپێشتر؟ ئەو دوو جیهانە کەی لەویژدانی ئێوەدا بوونە یەك؟

فرۆم: هەروەکو ئێوە وتتان جەنگی جیهانی یەکەم هۆکارێکی گەورە بوو بۆ گۆڕانگار فیکری لەمندا، چواردەساڵان بووم کاتێ ئاگری جەنگ هەڵگیرسا، من وەکو هاوتەمەنەکانم هێشتا مناڵ بوومو نەمدەزانی هۆی ئەو جەنگە چییە، بەلاَم

هەر زوو پرسیارێك لەهزرمدا دروست بوو کاتێك هۆو بیانوویان بۆ ئەو جەنگە دەهێنایەوە، چۆن شتی وادەبێت؟ چۆن رێی تێ دەچێت ملیۆنەها مرۆڤ ملیۆنەها مرۆڤی تر بکوژن و خۆشیان بەکوشت بدەن؟ ئەم حاڵەتەش چوار ساڵ بەردەوام بێ؟ کوشت و کوشتارێك لەپێناوی کۆمەڵە ئامانجێك کە نائەقڵانین و کوشت و کوشتار لەپێناوی ئامانجی سیاسیدا، کە هەر کەسێك پەی بەکرۆکی بەرێت هەرگیز خۆی ناکاتە قوربانی، چ بیانوویەك هەیە جەنگ رەوا بکات و هۆکاری سیاسیو دەروونی هەبێت؟ ئەم پرسیارانە دەروونی منیان گڕ تێ بەردەداو، ئەمڕۆش هەر کاریگەریەکی قووڵیان لەسەر بیروڕاکانی من هەیە قۆناغی پێش بۆرژوازیو جەنگی جیهانی یەکەم، لەوانەیە بنەڕەتی ترین هۆکاربن کە شێوەیان بەفیکرو هەستی من بەخشی.

شۆڵتز: ئەو کتێبانەی کاریگەریان هەبووە لەسەرت چین؟ مەبەستم ئەو کتێبانە نییە کە پەیوەندیان بەپسپۆڕیی خۆتەوە هەیە، بەڵکو هەموو ئەو کتێبانەی کە لەژیانی تایبەتیتاندا کاریگەریان هەبووە.

فرۆم: من خۆم دەربارەی ئەم پرسیارە زۆر بیرم کردۆتەوە، لەڕاستیدا چەند کتێبێك کاریگەریان لەژیانی مندا هەبووە یائیلهام بەخشی من بوون. لێرەدا دەمەوێ ئەوەبڵێم کە پێویستە کتێب وەسیلەیەك بێت بۆ لایەنگیری ژیانمان، زۆر ئەو بابەتانەی کە دەیانخوێنینەوە ئەم خاسیەتەیان تێدا نییە، یاپەیوەستن بەبواری پسپۆڕیمانەوەو یا واتاو مەبەستێکی واقیعیان نییە، بەڵام بەهەرحاڵ هەرکەسێك پێویستە لەخۆی بپرسێت: ئەو کتێبانە کامانەن کە رۆڵیان لەگۆڕین و کامڵبوونی مندا هەبووە؟

شۆڵتز: ببوورن قسەکەتان پێ دەبڕم، فلۆبێر قسەیەکی هەیە کە لەگەڵ ئەم قسەیەی ئێمەدا دەگونجێ، ئەو دەڵێ: (کتێب دەخوێنمەوە تابژیم، نەك تافێربم).

فرۆم: زۆر راستە قسەیەکە لەجێی خۆیدایەتی، پێشتریش ئەو قسەیەم بیستووەو ئەو مەسەلەیە روون دەکاتەوە، کە دەمەوێ باسی لێوە بکەم. ئەگەر ئەوە پێوەرمان بێ کتێبی کاریگەر هێند زۆرنین، هەڵبەتە کتێبی وەهاش هەن کە

کەم تازۆر کاریگەریی خۆیان هەیە چونکە هیچ کتێبێك نییە کە کاریگەریی ئەوەندەی گفتوگۆیەکی نێوان دوو کەس نەبێ، گەر دوو کەس گفتوگۆیەکی جیدی بکەن، هەردووکیان شتێك تاقی دەکەنەوە، یان باشتر بڵێین گۆڕانکاریەك تیایاندا روو دەدات، بەڵام ئەم گۆڕانە هێند کەمە کە دەرك ناکرێ ئەم شتەش خاڵێکمان لادەسەلمێنێت کە ئێوە گوتتان، گەر دوو کەس پێکەوە گفتوگۆ بکەن، بەڵام گۆڕان لەهیچیاندا روو نەدات، کەواتە ئەمانە قسە لەنێوانیاندا ئاڵوگۆڕ نەکراوە، بەڵکو تەنها پیت و ووشە، دەتوانین هەمان شت دەربارەی کتێب بڵێین، چوار پێنج کتێب منیان کرد بەم کەسەی ئێستا، گەر ئەو کتێبانە نەبوونایە نەمدەزانی ئێستا چ کەسێکی تر دەبووم و چ کەسێتییەکم دەبوو، بەپێی پۆلین بەپلەی یەکەم (کتێبی پێغەمبەران) دێ، سەرنج بدەن، ناڵێم (چاخی کۆن)، لەرۆژانی لاویمدا بەپێچەوانەی ئێستامەوە شەڕە سەربازیەکانی کەنعانم بەخراپ لەقەڵەم نەدەدا، گەرچی لەو رۆژانەشدا زۆر لەگەڵ ئەو کارانەدا نەبووم و بەهەمووی یەك دوو جار مێژووی ئەو شەڕانەم خوێندۆتەوە، بەڵام کتێبە ئاسمانیەکان و مەزموورەکان بەتایبەتیش یەکەمیان چ لەرابردوودا و چ ئێستا سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی من بوون.

شۆڵتز: ئایا بیرتان لەوە کردۆتەوە رۆژێك لەرۆژان بەلێکدانەوەی خۆتان ئەو کتێبانە بەسەر بکەنەوە.

فرۆم: پێشتر کتێبێکی وەهام بەناوی (تۆ وەکو خوات لێ دێ) وە بلاوکردوەتەوە کە لێکدانەوەیەکە سەبارەت ئاینی یەهوود، لەو کتێبەدا مەزموورەکانم لێك داوەتەوە و ئەو نووسینانەی کە دەبنە هۆی بزواندنی دەروون و خەم دەکەنە شادی جیام کردوونەتەوە لەو بابەتانەی کە هیچ گۆڕانکاریەك ئەنجام نادەن، بەڵام لەکۆتاییشدا دژایەتیەکی ناوەوەیی ئەو دووانەدا بەدی ناکرێ، هەندێ لەمەزموورەکان کاتێك لێیان تێ دەگەین کە سەرنج بدەین قسەکەرەکە بەنائومێدیەوە دەست پێ دەکات، بەڵام بەسەریدا زاڵ دەبێ، نائومێدی سەر لەنوێ دەگەڕێتەوە و دووبارە بەسەریدا زاڵ دەبێتەوە.

خوێنـەر وەختێك گـۆڕانی قـووڵو ئومێدبـەخش لـەناخی خۆیـدا هەسـت پـێ دەكات كە نائومێدیەكەی بگاتە ئەوپەڕی. مـەزمووری(٢٢) كـە بەرِستەی (خوایـە بۆچی دەسبەرداری من بووی؟) دەست پێ دەكات نموونەیەكی باشی قسەكەمانە.

خاڵیكی گرنگ هەیـە كـە پێویسـتە ئامـاژەی بـۆ بكـەم، بۆچـی مەسـیح (د.خ) وەختـێ لەمـەرگ نزیك دەبێتـەوە بەنائومێدیـەوە دەدوێ؟ ئـەم پرسـیارە لەمناڵیمدا هەمیشە جێی سەرسوڕمانی من بووە، ئەو قسانەی لەگەڵ ئەومەرگەیدا كە خۆی بـۆ پێشـوازیی دەڕوات ناگونجـێ. گەرچـی لەراسـتیدا دوو شـتی دژ بەیـەك نـین، چونكە هـەروەكو لـەو كتێبەشدا باسـم كـردووە مـەزموورەكان لـەئایینی یـەهوودو مەسیحدا بەدوو شێوەی جیاواز دەخوێنرێنەوە، لەئایینی مەسیحدا مەزموورەكان بـەژمارە دیـاری دەكـرێن، بـەڵام لـەئایینی یـەهوودا بەرِسـتە یاچـەند وشـەیەكی سـەرەتای مەزموورەكـە، بەرانبـەر بەمـە ئـەوەی لـەكتێبی پـیرۆزدا هەیـە دووبارەبوونـەوەی مـەزمووری(٢٢)ە لـەرێی حـەزرەتی مەسـیحەوە، گـەر ئـەو مـەزموورە بخوێنیتـەوە دەبینیـت كـە بەنائومێـدی دەسـت پـێ دەكـاتو بەئومێـد كۆتـایی دێ، لەوانەیـە مـەزمووری (٢٢) كـە زیـاترو باشتر لەمـەزموورەكانی دیكـە گەیەنەری پەیمانی گەڕانەوەی حەزرەتی مەسیحە لەسەرەتای مەسیحەیەتدا، گەر حەزرەتی مەسیح تەنها رستەی یەكەمی وتبێت كە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ كرد، ئەی كەواتە پەیامە ئومێد بەخشەكەی دواتر چییە، رستەكە لەئینجیلدا گۆڕاوە بۆیـە بۆتـە هـۆی بـەدحاڵی بـوون، لـەوە دەچـێت زۆریـش قسـەم كردبێـت، بـەڵام بەهەرحاڵ بەبەرنامەیەكی دیاریكراوەوە پەیوەست نین.

ئەمە یەكێك بوو لەبنـەڕەتی ترین هۆكاری كاریگەر لـەژیانی منـدا، ئەمرۆكـەش (كتێبـەكانی پێغەمبـەران) هـەروەكو پـەنجا ساڵ لەمەوبـەر بۆ مـن تـازەو زینـدوونو فێركەرن، بەڵكو زیاتریش.

نووسـینەكانی مـاركس دووەمـین هۆكـاری كاریگـەر بـوون لەسـەر مـن. ئـەوەی لەودا منی بەلای خۆیدا راكێشا فەلسەفەو دیـدی ئـەو بـوو سـەبارەت سۆشیالیزم، كە لەشێوەیەكی نائایینیو هیومانیـدا دەیبینێتـەوەو دەڵێت كە ئامانجی بەشەر

دەبێ کردنەوەی دەرگا بێ لەسەر هێزە پەنهانەکانی خۆی، نەوەکو بەدەست هێنان و کەڵەکە کردنی کەلوپەل و سامان. ئەم ئەم تێڕوانینەی خۆی بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٨٤٤دا لە نووسینە فەلسەفیەکانیدا بەیان کرد. ئەگەر ئەو کتێبە بخوێنیتەوە بەبێ ئەوەی بزانیت نووسەرەکەی کێیەو گەر مارکس باش نەناسیت، زەحمەتە بڕوا بکەیت کە ئەو خاوەن بیرێکی وەها بووە، بێگومان کە ئەو نووسینانە لەگەڵ شێوازو بیروباوەڕەکانی مارکسدا ناکۆک نییە، بەڵام کەمتر روخساری ئەوی تێدا دەبینیتەوە، لەبەر ئەوەی لەسەرێکەوە ستالینستەکان و لەسەرێکی ترەوە سوشیالیستەکان بەڕادەیەك سیما ناڕاستەقینەو درۆزنانەکەی مارکسیان لەهزری ئێمەدا چەسپاندووە، وەکو ئەوەی تاقە بایەخی ئەو ئاڕاستەی هۆکارە ئابوورییەکان و گۆڕانە ئابوورییەکان بوبێت، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە مارکس گۆڕانکاریی ئابووری وەکو وەسیلەیەك بۆ ئامانجێکی دی لەقەڵەم دەدات، ئامانجی مارکس ئازادی ئینسان بووە لەمانا هیومانیستییەکەیدا، گەر بەراوردێك لەنێوان فەلسەفەی گۆتەو مارکسدا بکەین وێکچوونێکی سەیر لەنێوانیاندا دەبینینەوە، مارکس رەگ و ریشەیەکی قووڵی لەفیکری هیومانیستدا هەیە، گەر نووسینەکانی ئیکهارت (زانای ئایینی و بنیادنەری تەسەوفی ئەڵمانی ١٢٦٠-١٣٢٧) بخوێنیتەوە، کە یەکێکە لە خاوەن بیرە زۆر رادیکاڵ و پڕ کێشەکان، وێکچوونێکی زۆر لەنێوان بیروراکانی ئەوو مارکسدا دەبینیتەوە.

شۆڵتز: شتێکی بەجێیە بەرگری لەمارکس و کەلێ لەهاوبیرانی لە رێبازە جیاجیاکاندا بکەین. بەرامبەر پەیڕەوانی خودی مارکس خۆی، بەڵام کێ ئەم ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ؟ هەمان شت بەنیسبەت برێخت و فرۆیدو ئێرنست بلۆخ یاهەر بیرمەندێکی دی کە ئەمڕۆکە کاریگەرییان دیارە، لەکام زانکۆ یادەزگای زانستیدا هەوڵ دەدرێ تا بیرمەندێکی وەکو مارکس لە لەقاڵب دان و یەکڕەهەندی بپارێزرێ؟

فرۆم: کەم مارکس ناس هەیە کە مارکسی بەڕاستڕەو یاچەپڕەوێکی سەد دەرسەد نەژماردبێ، ئەوانە مارکسیان کردۆتە پشتیوانی بیروباوەڕەکانی خۆیان،

جگە لەوە مارکس دەکەنە پاکانە بۆ کردەوە سیاسیەکانی خۆیان کەتەواو دوورە لەبیرو راکانی مارکسەوە، وەختێ سەماریەداران بەشەقڵی رووسی یاسەرمایەدارانی خۆرئاوا بەمۆری لیبراڵ (مەبەستم سۆشیال دیموکراتەکانە) مارکس بەسەرچاوەی خۆیان دەزانن، ئەمە تەحریف کردنی ئەوە، ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەڕاستی مارکس دەناسن کەمە، لەوانەیە شتێك بڵێم بەخۆ لەبایی بوونی لەقەڵەم بدەن، بەڵام بەهەرحاڵ من لەو باوەڕەدام کە بەتەنها من و چەند کەسێکی تر بەدروستی لەبیرو باوەڕو بۆچوونەکانی مارکس دەگەین، ناشڵێم کە ئەم قسەیەم ڕێسایەو ئاوارتن (استثناء)ی نیە، بەڵام لەسەر ئەوە پێ دادەگرم کە زۆربەی مارکس ناسان ئەو راستیە نابینن کە فیکری مارکس فیکرێکی دینیە، هەڵبەتە (دینی) نەبەو مانایەی کە باوە، چونکە بەو مانا باوە (بوودیسم)یش دین نیە، بوودیسم خوای نیە، بەڵام بیرو باوەڕو بنچینەو دەستوورە بونیادیەکانی دینیە، چونکە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێتەوە کە پێویستە مرۆڤ لەنێرگسیێتی و خۆپەرستی و گۆشەگیری دوور بکەوێتەوەو خۆی بخاتە نێو جەرگەی ژیانەوەو وەکو ئیکهارت دەڵێ وەها پاکژ بێ کە بتوانێ کامڵ بێ و لەگەڵ (کل)دا ببێتە یەك، ئەم بیروباوەڕە کە بەشێوەی جیا جیا تەعبیری لێ دەکرێ لەنێو دڵی نووسینەکانی مارکسدا هەیە. هەندێ جار چەند پەرەگرافێکی نووسینە ئابووری فەلسەفیەکانی مارکسم بۆ کەسانێك خوێندۆتەوە لەوانە دکتۆر سوزوکی کە یەکێکە لە نوێنەرانی دیاری زنی بوودیسم، بەڵام بەبێ ئەوەی ناوی مارکس بهێنم، دوایی پرسیومە: ئەمە زن نەبوو؟ لەوەڵامدا وتویەتی: بەڵێ بێگومان جارێکی تر هەمان ئەو نووسینانەم بۆ دەستەیەك لەحەکیمانی (لاهوت)ی رۆشنبیر خوێندەوە ئەوانیش هەریەکەو وتی هی نووسەرێك یافەیلەسوفێکی کلاسیکیە لەتۆماس ئەکویناسەوە، بگرە تازانایانی دینیی ئەمرۆ، یەکێکیان ناوی مارکسی نەهێناو مارکسیشیان هەر نەدەناسی.

مارکس ناسانێکی دیکەش هەن، بۆ نمونە وەکو ئیرنست بلۆخ کەسیمای راستەقینەی مارکس بەڕوونی دەبینێ، هەروەها زانایانی کاسۆلیکی دژ

بـەمارکس، وەکـو ژان ئیـف کالفـە، گەرچـی ژمارەیـان کـەم نییـە بـەڵام ئەگـەر بەراوردیان بکـەین لەگـەڵ ڕێبـازە دیارەکـانی لێکدانـەوەی بیرو بـاوەڕی مـارکسدا، کاریگەریەکی ئەوتۆ نابینین، بێجگە لەکەسانێك کەوان لەنێو حەکیمانی لاهوتدا.

سـێیەمین بیرمەنـدیش کـە کاریگەریـەکی قـووڵی لەسـەر مـن هـەبووە (یۆهـان یـاکۆب یـاخ ئـۆفن)ە. ئۆفن یەکـەمین بیریـارە کـە کۆمـەڵێ دایکسـالاریی دۆزییـەوە، گەرچی بەداخەوە ئەوەندە نەناسراوە، ئۆفن ئەو نوسینەی خۆی زیاتر لەسـەدەیەك بەر لەئێستا نوسیویەتیو سالأنێك لەمەوبەر بۆ یەکەم جار کرا بەئینگلیزی، باخ ئـۆفن ئـەوەی دۆزیوەتـەوە کـە بـەر لەباوکسـالاری کۆمـەڵگای بەشـەری سیسـتمی دایکسـالاری بەخۆیـەوە دیـوەو، پاشـان جیـاوازی نێـوان ئـەو دوو سیستمەشـی خستۆتەروو، بەکورتی دایکسالاری لەسەر بنچینەی خۆشەویستیی ئینسانیی بـێ مـەرج دادەمـەزرێ، دایـك هـەموو رۆڵـەکانی خـۆی وەکـو یـەك خـۆش دەوێـتو میهرەبـانیی ئـەو پەیوەسـت نییـە بـەتواناو لێهـاتوویيو هتـدی ئەورۆلانـەوە، خۆشیانی دەوێت لەبەر ئەوەی رۆڵەی ئەون، خۆگەر میهرەبانیی دایکانە کاتێ بخرۆشێکە مناڵەکە زەردەخەنەیەك بکەوێتە سەر لێوی، یاهەڵسوکەوتێکی شیرین بنوێنـێ، ئـاخۆ وەختـێ کـە منـاڵان لەبرسـانا دەمـرن چـەند بخرۆشـێ، بـەڵام بـاوك رۆڵـەکانی خـۆش دەوێـت لەبـەر ئـەوەی بەقسـەی دەکـەنو فەرمانـەکانی بەگشـتی بـەجێ دەهێـننو لـەو دەچـن، مەبەسـتم دایکـانو باوکـان بەشـێوەی گشـتی نییـە. بـەڵکو جـۆری کلاسـیکی بـاوكو دایـك، ئـەگینا کـەم نین ئـەو باوکانـەی کـە سـۆزی دایکانیان هەیەو ئەو دایکانـەش کـە بـاوك ئاسا لەگەڵ مناڵەکانیاندا هەڵسوکەوت دەکـەن، جیاوازیەکـە بەنـدە بەسیسـتـمە کۆمەڵایەتییەکـەوە ئایـا دایکسـالارییە یاباوکســالاری، جیــاوازیی نێــوان ئــەو دووانــەش، کــەس نــەیتوانیوە وەك سـۆفۆکلیس وێنـەی بکێشـێت، ئەمـەش لەشـانۆیی (ئـەنتیگۆنا)دا، ئـەنتیگۆنا نوێنەری دایکسالارییە، (من لێرەدام بۆ سۆز بەخشین نەك بۆ رقو بێزاری،) بـەڵام کریـۆن نیشـانـدەری بونیـادی باوکسـالارییە، ئـەو بونیـادەی کـە وڵاتو دەوڵـەت

دەخاتــە ســەروو بــەها مرۆڤایەتیەکانــەوە. (ئـەو بونیـادەی ئـەمڕۆ پــێی دەڵــێن فاشیزم).

دۆزینـەوەی باخ ئـۆفن نـەك هـەر بەتـەنها بـووە کلیلـی تێگەیشـتنم لەمێـژوو و لەکۆمـەڵگای باوکسالاری، کـە لـەم سیسـتمەدا خۆشەویسـتی پابەنـدە بەکاربـەجێ هێنانــەوە، بــەڵکو لــەڕێی ئــەوەوە پــەیم بەمەســەلەی پەرەســەندن و کــامڵبوونی مرۆڤیش برد:  بۆچـی ئێمـە، لـەژن و پیـاو، خوازیـاری خۆشەویسـتیی دایکانـەین؟ وابەسـتەیی بەدایکـەوە یـانی چـی؟ مانـای راسـتەقینەی سـۆزی دایکانـە چـییە، گەوهەری گرێی ئۆدیپ چییە، ئایا کۆتێکی سێکسـییە؟ بەلای منـەوە نـەخێر، خواستی خۆشەویستیی دایکانە لەپێداویستییەکی قووڵی ئینسانەوە سەرچوە ئەگرێ، لەئەڵهایەك بۆ سیمایەکی بالاّ، بۆ خواوەنـدێکی مـێ کـە ئێمـە لەئەرکـەکان قوتـار بکـات، مەترسـییەکانی ژیانمـان لــێ دوور بخاتــەوە، (تـرس لـەمردن)مـان لانەهێڵێت و لەبەهەشتێکدا دالّدەمان بدات. ئێمە نرخی پارێزەر (حامی)ەێکی وەها بەوابەستەییمان بەدایك و لەدەست دانی خۆبوون دەدەین، ئەمانـە هـەموو کۆمـەڵێك مەسەلەن کە لـە سالاّنی بیستی ئەم سەدەیەدا بایـەخێکی دیاریان لای مـن بـەباخ ئۆفن  خولقاند.

کاریگەریەکی بنەڕەتیی تر لەسەر من لەبوودیسمەوە بوو، ئەو ئایینە منی فێـر کـرد کـە دەکـرێ بـەبێ خواوەنـد ئـایین هـەبێ، بـۆ یەکـەم جـار لەسـالّی ١٩٢٦دا بە(بوودیسم، ئاشنا بووم، کە گەورەترین ئەزموونی ژیـان مـن بـوو، خۆشەویسـتیو پەیوەندیی من بەبوودیسمەوە هەرگیز کـەمی نـەکردووەو تۆژینـەوەکانم سـەبارەت زن بودیسم، چ ئەوەی لەگـەڵ دکتـۆر سـوزوکیدا کردبێتم و چ ئـەوەی بەتـەنیا خـۆم ئەنجامم دابێ، ئەو پەیوەندییەمی قووڵتر کردبووەوە.

هێشتا دەربارەی سیگمۆند فرۆید قسەم نەکردووە، هەر لەهـەمان ئـەو سالاّنەدا فرۆیـدم ناسـی، بیروڕاکـانی ئـەو هەمیشـە یانـەی فیکریـی مـن بـوون، ئـەو هۆکـارە کاریگەرانەی کە باسم لـێ کردن ئاییني مارکس، دایکسالاری، بوودیسم و فرۆیـد- جگـە لـەوەی کـە بیروربـاوەڕی منیـان داڕشـت، رۆڵێکـی بنـەڕەتیان لـەگۆڕینی مـن و

کامڵبوونمدا هەبوو، چونکە هەرگیز نەمتوانیوە دەربارەی مەسەلەیەك بیربکەمەوە ئەوانم لا زیندوو نەکاتەوە، من بێ بەشم لەبیرکردنەوەی (مجرد)و تەنها ئەو بیروڕایانە ڕێی خۆیان بۆ هزرم دەدۆزنەوە کە دەتوانم بەشێوەیەکی (عەینی) تاقییان بکەمەوە، ئەگەر پەیوەندیەکی وەها لەمیاندا نەبێ مەیلم بێ ڕەنگ دەبێو ناتوانم تواناکانم بخەمەگەڕ.

شۆڵتز: وێڕای ئاشنایی تەواوەتیتان بەمارکس-یان باشتر بڵێم مارکس باش دەناسن- کەچی کەس ئێوە بەمارکسیت لەقەڵەم نادات، بەو مانایەی کەباوە،و دەوترێ کە ئێوە بەفرۆید نزیکترین، ئەوتان کردۆتە خاڵی دەست پێ کردنتان، یان چاکتر وایە بڵێم بەڕواڵەت لەوەوە دەست پێ دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەویشدا نامێنێتەوەو زیاتر تێ دەپەڕیت. لەم ڕوانگەیەشەوە ئێوە لەگەڵ تەواوی پەیڕەویکەرانی فرۆیددا جیاوازیتان هەیەو بەڵکو ڕەخنەشی لێ دەگرن.

فرۆم: من هەمیشە یەکێك بووم لەخەڵکانێکی کەم، تەنانەت لەهەواداریم لەباخ ئۆفنیش هەر لەو کەمینەیەم، چونکە پەیڕەوەی کەرانی ئەو کەمن. بەڵام سەبارەت بەفرۆید: لەبەرلێن پەیڕەویکاری تەواوی فرۆید بوومو سەرەتای تەواوی تیئۆرییە سێکسی‌یەکانو ئەوانی تریم پێ قبووڵ بوو، لەریزی ئەو قوتابیانە بووم کە بەبێ یەك و دوو وانەکانی مامۆستای خۆیان قبووڵ دەکرد، مەگەر چۆنها تاقیکردنەوەیەکی شەخسی لەژیانی‌دا یەکێك لەو تێزانە بەدرۆ بخاتەوە، بۆیە تائەو کاتەی کەخۆم شتێکم نەدەزانی ئەوانەم پێ قبووڵ بوو، بەهەرحاڵ، نووسینو بیروڕاکانی فرۆیدم بەوردی تاوتوێ کرد، ئەو ڕۆژانە گوشارێکی زۆریش هەبوو بۆ قبوڵ کردنی تێۆری‌یەکانی ئەو، بەڵام پاش چەند ساڵێك گومانو دڕدۆنگی لەمندا شکۆفەیان کرد، ئەوەی چاوەڕێم دەکرد لەنەخۆشەکانمدا نەمدەدۆزیەوە، بەڵکو گەیشتمە ئەو ڕاستی‌یەی کە تیۆریی فرۆید لەدۆزینەوەی نەخۆشی‌دا کۆمەك ناکات، نامەوێ دەربارەی تیۆری فرۆید بدوێم، چونکە کارێکی بەپێچوپەناو دژوارە، بەڵام لەپەیڕەویکردنی ڕێبازەکەی فرۆیددا هەموو شتێکم لەبەر ڕۆشنایی گرێی ئۆدێپدا دەبینی‌و هەڵم دەسەنگاند: ترس لەپیاوەتی

کەوتن، مەسەلە سێکسیەکان‌و ئەوترسانەی لەو مەسەلانەوە سەرچاوە دەگرن، پتر لەجارێك سەرنجم دەدا کە تیئۆرییەکە پەیوەندییەکی بەنائارامیی نەخۆشەکانەوە نییە، دوچاری شتی وەها دەبووم کە دەبووە هۆی نائومێدیی‌و بێزاریم، ئاخرییەکەی توانیم ئەوەی کەپێم وتراوەتەوە بەو تیۆریە ئەنجامی بدەم، بەڵام نەگەیشتمە ئەوەی خەوم لێ بکەوێت، (یەکێك لەمامۆستاکانم کە لەکاتی کاردا خەوی لێ کەوتبوو دەیوت خەوێکی بینیوە کە زیاتر لەگوێگرتن لەقسەکانی نەخۆشەکەی یارمەتی داوە بۆ دیاری کردنی جۆری نەخۆشییەکە، بەڵام ئەم قسەیەش جۆرە بیانوو هێنانەوەیەك بوو و هیچی تر)، بەڵام سەیرم کرد تەواو ماندوو دەبم‌و دوای حەوت هەشت سەعات کار ئیتر پەکم دەکەوێت، بەخۆم وت: بۆچی واماندوو دەبی؟ بۆچی وازوو بێزار دەبیت؟ بەڵام دوایی تێگەیشتم کە ماندوویی‌و بێزاریی من دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەناچمە ناو ژیانی نەخۆشەکانمەوە، بەڵکو خۆم بەزەینیانەوە خەریك دەکەم، گەرچی ئەو زەینانە لەشێوەی ئەزموونە سەرەتاییەکانی قۆناغی منداڵی‌و نەخۆشەکان دابوو.

لەو کاتەوە تێگەیشتن‌و بینینی راستەقینەی من دەستی پێ کرد، کە بایەخم بەپەیوەندییەکانی مرۆڤ‌و، بەتایبەتیش ئەو هەڵچوونانەی کەرەگ‌وریشەیان والەبوونی مرۆڤداو نەخۆشەکەشم ئەوەی من بینیم، ئەویش بینی‌و تێگەیشت کە: بەڵێ ئەمە رێگا راستەقینەکەیە، ئیتر هەستم بەبێزاری نەدەکردو دانیشتنەکانم لەگەڵ نەخۆشەکانمدا زیندوو بەگیان بوو، وادەهاتە پێشچاوم، کە ئەگەرچی شیکاری دەروونی سوکنایی بەنەخۆشەکە نەدەبەخشی بەڵام ئەو سەعاتانەی لەگەڵیدا دەبووم ئارامی بەخش‌و بزوێنەر بوو، نەخۆشەکەش لەو ماوەیەدا چوست‌و چالاك دەبوو.

بەڵام وێڕای ئەوەش ماندوو دەبووم، دەمویست بەنەخۆشەکە بڵێم: تەماشاکە ئەمە چ حاڵێکە؟ پێش هاتنی تۆ چەند چاك بووم، کەچیئێستا زۆر ماندووم ئایا قسەو خەم‌و ئازارەکانی تۆ وایان لەمن کرد، یاشتێك بەسەر مندا هاتووە؟ بەم

جۆرە سەرکەوتوویی یاشکستی دانیشتنێکم بەپێی گەرمو گوڕیی ئەو دانیشتنە هەڵدەسەنگاندو کارم بەوە نەبوو کە لەو ماوەیەدا رووی دەدا.

شۆڵتز: ئەو هۆکارانەی ئاماژەت بۆیان کرد –کتێبی پیرۆز، مارکس، باخ ئۆفن، فرۆیدو بودیسم– پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا هەیە، بەڵام بەجۆرێك ناتەبان کە کۆکردنەوەیان لەبۆتەیەکدا، یان بەقسەی هەندێ لەدۆستانتان دروستکردنی تیۆرییەك لێیان لەلایەن ئێوەوە شتێکی سەرسوڕهێنەرە، ئایا ئەم گونجاندنە لەخاسیەتەکانی کاری ئێوەیە؟

فرۆم: واهەست دەکەم وەهابێت، قووڵترین ئەنگێزەی فیکریو عاتیفیی من هەرەسهێنانی ئەو دیوارانە بووە کە لەنێوان ئەو لایەنە بەڕواڵەت ناتەبایانەدا هەبووە، کە جگە لە بوودیسم هەموویان کەرەسەی خاوی بینای فەرهەنگی ئەوروپایین، دەمویست بونیادێکی هاوبەش لەوانە پەیدا بکەمو لەیەك تیۆریدا کۆیان بکەمەوە، لەراستیدا زاراوەی تیۆری لێرەدا لەجێی خۆیدا نییە، چونکە ئەوەی من دەمویست روونتر پیشانی بدەم ئەوەبوو کە ئەو رێبازە فیکرییە جیاوازانە کۆمەڵێك رووی جیای یەك رەگو ریشەو یەك چەمکی بونیادین، بۆ ئەوەی مەبەستم روونتر بێ، ئیکهارتو مارکس بەنموونە دەهێنمەوە کە هەردووکیان جێی بایەخی منن، رەنگە بوترێ کە رێبازی ئەو دووانە تەواو لەگەڵ یەکتردا جیاوازنو بەیەك چاو تەماشا کردنیان نیشانەی کەمو کورتییە لەفیکردا، بەڵام رادیکالیسمەکەی ئیکهارتو فەلسەفەی مارکس لەتوانای رۆچوونە نێو رەگو ڕیشەوە زۆر لەیەك دەچن، ئیکهارت دەڵێت: ریشەی هەر شتێك پیشاندەری نەشونمایەتی، مارکسو فرۆیدیش هەمان شت دەڵێن، ئێمە راهاتووین کە نووسەرانو ئاسەوارەکانیان بخەینە قاڵبێکی دیاری کراوەوە، پێ لەسەر لایەنێ لەلایەنەکانی ئەو نووسەرە دادەگرینو هەندێ شت دەدەینە پاڵی بەبێ ئەوەی لەگەوهەرو مانای گشتیی نوسینەکانی بگەین، خواستی من ئەوەبوو ئەو فاکتەرە گرنگانەی کەژێرخانی فیکری ئەوروپاییان پێکهێناوە لەزەمینەی خۆیاندا

بیانبینمو لەیەك جیادا كۆیان بكەمەوە، ئەم ئەنگێزەیە بناغەی ئەو كارانە بوو كە لەچل ساڵی رابردوودا ئەنجامم داون.

شۆلتز: ئێستا ئەگەر ئێوە راتان لەسەربێ چەند دەقیقەیەك گفتوگۆ دەخەینە لاوەو لەگەڵ بینەراندا گوێ لەمۆسیقا دەگرین. پرۆفیسۆر فرۆم، دەزانم كەچێژ لەمۆسیقا وەردەگرنو حەز دەكەن میوانەكانیشتان لەو چێژەدا بەشداریتان بكەن ئێوە خۆتان بەپسپۆڕێكی مۆسیقا نازانن، بەڵام عاشقی مۆسیقان ، لەمۆسیقادا حەزتان لەچییەو حەزتان لەچی نییە؟

فرۆم: چێژو سەلیقەم لەمۆسیقادا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانێكی زۆر لەمەوبەر، لەمۆسیقادا پسپۆڕ نیم، بەڵام لایەنی ئەزموونی مۆسیقام بەلاوە زۆر گرنگە، ناتوانم ژیانێك تەسەور بكەم كە بەبێ مۆسیقا بچێتە سەر.

شۆڵتز: لەكاتێكا ویستم دەربارەی رابردووتان ئاگاداربم، سەرنجم دا كە ئێوە حەز بەمۆزارت ئەكەن، بەتایبەتیش كۆنشرتۆكانی كە بۆ كەمانچە دایناون، هەروەها حەز بەبتهۆڤنیش دەكەن، بەڵام وتوشتانە كە حەز بەسوێتەكانی باخیش دەكەن بەتایەتی ئەگەر لەلایەن (پابلۆكاسالس)ەوە لێ بدرێن، كاسالس كە لەهەرزەكاریدا بەو سوێتانە ئاشنا بوو، پێش ئەوەی لەئاهەنگە گشتییەكاندا پێشەكەشیان بكات دوانزدە ساڵ مەشقی تیایاندا كردووە، ئەو سۆیتانەی بە(گەوهەری كارەكانی باخ) لەقەڵەم دەدا، من كاسێتەكانی ئەو شەش سویتەم لەگەڵ خۆمدا هێناوە تابۆ چەند دەقیقەیەك گوێیان لێ بگرین، بەڵام سەرەتا حەز دەكەم شتێك بڵێم: لەم دواییەدا چاوپێكەوتنێكی تەلەفزیۆنیان پیشاندا كە لەگەڵ كاسالسدا كراوەو خۆشی چەند ساڵێك دەبێ كۆچی دوایی كردووە، لێی دەپرسن: ئەگەر پێت بڵێن چ قسەیەكت هەیە بۆ خەڵكانی تەواوی ئەم دونیایە بیڵێ: چییان پێ دەڵێیت؟ كاسالس وەڵام دەداتەوە: پێیان دەڵێم خەڵكینە ئێوە هەموو حەز بەئاشتی دەكەن نەك جەنگ، حەز بەژیان دەكەن نەك مەرگ، حەز بەرووناكی دەكەن نەك تاریكی، كەواتە بۆ ئەوەی نەك هەر بەتەنها

هەستو سۆزیان وەکو یەك بخرۆشێنم، بەڵکو بۆ ئەوەی کە نهێنی ژیانیشیان تێ بگەیەنم، پارچە مۆسیقایەکی باخیان بۆ دەژەنم.

شۆڵتز: ئێوە پێنج شەش ساڵی خۆتان بۆ نووسینی کتێبی (ئەناتۆمی ویرانکاریی مرۆڤ) تەرخان کرد، ئەو کتێبەی ئێوە گەلێ بیروباوەڕی باو سەبارەت مرۆڤ پووچەڵ دەکاتەوە، لەبەشێك لەبەشەکانی کتێبەکەدا کە زۆر سەرنجی خوێنەرانی ئەڵمانی راکێشا، باستان لەسیفاتەکانی هیتلەر کردووەو لەگەڵ بیروباوەڕی باوی رۆژانەدا بەراوردتان کردووە.

فرۆم: لەم دواییەدا هەندێ لەنازییە کۆنەکان لەچەند نووسینێکیاندا کە بلاویان کردۆتەوە بەشانو باڵی هیتلەردا هەڵیان داوەو ئەویان گەیاندۆتە لووتکە، کە بڕوا ناکەم خوێنەریان زۆربێت، دووان لەم کتێبانە بەپێنوسی فێستو ماسەر نووسراونو لایەنگەریش کتێبێکی لەم جۆرەی لەئەمریکا بلاوکردۆتەوە، ئەم کتێبە مێژوویەکی سەیری هەیە، ئەم کتێبە بەمەبەستی ئاگادارکردنی دائیرەی راگەیاندنی ئەمریکا لەتایبەتمەندێتییە دەروونیەکانی هیتلەر نووسراوە، نووسەرەکەی پسپۆڕی شیکاری دەروونییە.

ئەو نووسینەش وەکو کۆمەڵێك بەڵگەنامەی خاڵی لەنهێنی تائەو دواییە وەکو نهێنینامە پۆلبەندی کراوە، نووسەرەکە شتێکی ئەوتۆی نەوتووەو بەتەنها هاتووە هیتلەری لەدیدگایەکی فرۆیدیانەوە شی کردۆتەوە: هیتلەر گرێی ئۆدیبی هەبووە، ئاگاداری پەیوەندیی سێکسی دایكو باوکی بووەو لەم بابەتانە، ئەمانە وەسفو شیکردنەوەی خسوسیاتی هیتلەرە، بەلام ئەو ئەنجامەی کتێبەکە دەیدا بەدەستەوە شتێکی سادەو ساکارە، چونکە لەو زانیارییانەوە ئینسان ناتوانێ پەی بەخوو رەفتارو گرێکانی هیتلەر بەرێت.

نووسەرێکی فەرەنسایی کەناوی ژاك برۆسە شیکردنەوەیەکی دەروونی باشتری دەربارەی هیتلەر ئەنجام داوە، ئەو بەپشتگوێ خستنی پێچو پەناکانی شیکردنەوەی دەروونی وێنەیەکی رووناکی سروشتی هیتلەرمان بۆ بەرجەستە دەکات، بەلام کاتێ دوچاری هەندێ گرێو گۆڵی رێبازەکەی خۆی دەبێت،

بیروڕاکانی بەڕادەیەك ئاڵۆزو سەیر دێتە پێشچاو کە باسکردنی وەختێکی زۆری دەوێت، بەشێوەیەکی گشتی و دوور لەیاساو رێسای تیۆرێك و شیکاری، کتێبەکە لەچاو خۆیدا لەهەموویان باشترە.

شیکردنەوەی من دەربارەی هیتلەر هەم لەگەڵ ئەو توێژینەوە مێژووییانە کە لەم دواییەدا لەئاڵمان چاپ کراون و هەم لەبایۆگرافیی دەروونناسیی خۆی جیاوازە. لەکتێبی (هەڵاتن لەئازادی)دا کە لەساڵی ١٩٤١دا چاپ کرا، لێکۆڵینەوەیەکم دەربارەی هیتلەر نووسیوە کە گرنگی بەتافی منداڵیی نادات، دواکاری من کە وردتر بووەو لەنووسینیدا سوودم لەبەڵگەنامەی مێژوویی و ئەو شتانەی کە دەستم کەوتوون، بینیوە، رونترو باشتر بووە، لەلێکۆڵینەوەی یەکەمیانمدا هیتلەرم وەك ئازاردەرێك و ئازار چێژێك لەقەڵەم داوە، واتە (بەبۆچوونی خۆم) کەسێك کە حەز ئەکات بەسەر خەڵکانی تردا دەسەڵاتدار بێت و هەم حەز دەکات خۆیشی لەژێر دەسەڵات و رکێفی خەڵکی تردا بێت، بەڵام ئێستا دوای لێکۆڵینەوەی زیاترو وەدەست هێنانی بۆچوونی باشتر هۆکارێکی ترم دۆزیەوە کە گرنگترە، ئەو هۆکارەش ناوم ناوە (مەرگ پەرستی) مانای ئەسڵیی ئەم وشەیە جۆرە لادانێك (انحراف)ی سێکسییە (مەیلی سێکسی بەلای مردوودا) بەڵام بەو چەمك و مانایەی کەمن بەکاری دەهێنم دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفی ئیسپانیایی گەورە (میگل دی ئۆنامۆنۆ) کە لەساڵی ١٩٣٦دا لەوتارێکدا وتی کە دروشمی فالانژیستەکان (بژی مەرگ) دروشمی مەرگپەرستییە، مەبەستم زمانی ناسێکسیی و ناجەستەیی ئەو وشەیەیە، واتە هۆگربوون بەهەموو بوونەرێکی مردوو و بێ گیان، پارچە پارچەکردن و لێك ترازانی هەمەجۆرە پەیوەندیەك بەژیانەوە، مەرگپەرست، مەیلێکی میکانیکی دەیبزوێنێ، نەك خۆشەویستی ژیان، مەرگپەرستی واتە خۆشویستنی هەر شتێك کە مردووە، Nekro واتە تەرم، واتە هەر بوونەوەرێك کە زیندوو نییە، مەرگپەرستی، بەپێچەوانەی رواڵەتی زاراوەکەوە، خۆشەویستی مەرگ ناگەیەنێ، بەڵکو خۆشەویستیی هەموو شتێکی مردوو و بێ گیان، بەرامبەرەکەشی زاراوەی زیندووپەرستی (خۆشەویستی

زیندوو) Biophilia یە، خۆشەویستی‌ی هەر شتێك كە نەشونما دەكاتو گەشە دەكات، بونیادێكی هەیە، یەكەیەك پێك دەهێنیّو پارچە پارچەو لێك ترازاو نیە.

بابگەڕێینەوە سەر ئەدگارەكانی هیتلەر: گەر بمانەوێ راستگۆ بینو راستی بڵێین دەبێ لە مەسەلەی جەنگ خوازی‌و كوشتاری ملیۆنەها مرۆڤدا تەنها سەرزەنشتی هیتلەر نەكەین، سەركردەكانو پیاوانی دەوڵەتو دەسەڵاتداران شەش هەزار ساڵە خەریكی شەڕو كوشتارنو ئەمەش بەبیانووی بەرگری كردن لەخاكی باوو باپیرانو بیانووی تر، ئەوەی هیتلەر لەوان جیادەكاتەوە ئەوەیە كە ئەم خەڵكی بی دیفاعیشی دەكوشت، ئامانجی شیكردنەوەی دەروونی‌ی من بۆ كەسێتی‌ی هیتلەر ئەوە بوو پێشانی بدەم كە هیتلەر رقێكی قووڵی لەهەموو گیاندار (خاوەن گیان)و بوونەوەرێكی زیندوو بووە، گەر بڵێین هیتلەر چاوی بەرایی نەهێناوە یەهودی‌یەكان ببینێ، زۆرمان نەوتوە، بەڵام ئەمە هەموو راستی‌یەكە نی‌یە، چونكە ئەو هەم رقی لەجوولەكەش بووەو هەم لەئەڵمانی‌یەكانیش، چونكە وەختێ زانی كە ئیتر ناتوانێ لەجەنگدا سەركەوتن بەدەست بهێنێ بڕیاریدا وڵاتی ئاڵمانیش لەگەڵ خۆیدا بەرەو هەڵدێر بەرێت، هیتلەر ساڵی ١٩٤٢ بەئاشكرا ئەم نیەتەی خۆی خستەروو و وتی ئەگەر ئەڵمانی‌یەكان شەڕ بدۆڕێنن، هەقی ژیانیان نی‌یە، هیتلەر نموونەیەكی زێدەڕۆی مرۆڤی مەرگپەرستە، كە گفتی باش كردنی دونیا روخسارە راستەقینەكەی لەچاوی لایەنگرانی شاردبۆوە.

هیتلەر نیشانەیەكی رواڵەتی هەبوو كە لەخاسیەتەكانی گەلێ لەمەرگ پەرستانە، ئەمانە بۆگەنیان لێ دێ، بەڵام ئەو بۆنە بەلووت ناگات، بەمانەیەكی سادەتر، بەچاوی قێزو بێزەوە تەماشای بوونەوەرانی زیندوو نەك مردوو دەكەنو، پەیوەندیشیان لەگەڵ ئەو بوونەوەرانە لەڕێی بۆنەوەیە، ڤۆن هێنتینگ لەنووسینەكانی خۆیدا دەربارەی تاوانو تاوانكاری ئاماژەی بۆ ئەم مەسەلەیە كردووە، بۆ نموونە ئەو كەسانەی كەیفیان بەبۆنی ناخۆش دێ، ئەم كەیف هاتنە لەسیفەتەكانی مردوو پەرستانە، هۆگری بوونی ناخۆشو پیسایی‌ولاشە دەبن

ئەمەش لە سیمایاندا دیارە، سیمایان ساردو بێ جووڵەیەو دەڵێی بەستوویەتی، بەڵام لەروخساری مرۆڤی (زیندووپەرست)دا نیشانەی جۆراو جۆر دەبینین، دەمووچاوی زیندوو پەرست بەبینینی هەموو بوونەوەرێکی زیندوو دەگەشێتەوەو رەنگ هەڵدێنێت.

یەکێك لەنیشانەکانی تری مرۆڤی مردووپەرست ئەوەیە کە دیمەنی مایەی تەوەزەلیە، بەڵام زیندووپەرست واذیەو لەهەر بابەتێك بدوێ، گەرچی ساکاریش بێت، قسەکانی پڕن لەژیان، مردوو پەرست گەر زۆر رۆشنبیریش بێت، قسەکانی هەربێ گیانن، وابزانم زۆربەیشمان لەم جۆرە گفتوگۆو قسانەمان دیوە (ئەم خاڵە دەشمانباتەوە بۆ خاڵی سەرەتای گفتوگۆکەمان) بەڵام خەڵکی رەمەکیشمان دیوە، کە ئەگەر چی رۆشنبیریش نەبووە بەڵام قسەکانی جارِسکەر نەبوون، بەڵکو خرۆشێنەر بوون، چونکە قسەکانی ژیانیان لێ دەرژێ.

ئێمە هەمیشە هۆگری بوونەوەری زیندووین، زیندوویێتیو سەرشار بوون لەژیان خەڵکی بەلای خۆیدا رادەکێشێت، ئەمرۆکە خەڵکانێك وادەزانن ئەگەر دەموچاوی خۆیان بەرەنگو بۆیە سواغ دا تادیمەنێکی دڵرفێن بدەن بەدەموچاویان، ئیتر دەبنە جێی سەرنجو خەڵکی خۆشیانی دەوێت، پیاوان لەو بروایەدانو ئەوانەی پێداویستییەکانی ماکیاژیش دروست دەکەن قەناعەتیان بەئافرەتان کردووە، بەڵام تەنها شتێك کە ئێمە بەلای خۆیدا رادەکێشێت چالاکییە، ئەم خەسڵەتە لەدڵداراندا بەدی دەکرێ، ئەمانە بۆ راکێشانی سەرنجی بەرامبەرەکەیان خۆشحاڵو چالاکتر دەبن لەباری ئاسایی، بەڵام ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە هەر ئەوەندە بەیەك گەیشتنو بوونە (خاوەن)ی یەکتر ئەو چالاکیو چوستییە کەم دەبێتەوەو دەبنە کەسێکی تری تەواو جیا لەو دڵدارەی پێشوو و پاش ماوەیەك خۆشەویستیان لانامێنێو تەنانەت نازانن بۆچی عاشق بوون، لەچاوی یەکتردا جیلوەی دڵداریان لانامێنێ، ئیتر جوانەکەی جاران نین، چونکە ئەو نەرمو نیانیو جوانییەی کە چالاکی بەسیمایانی بەخشیبوو فەوتاوەو نەماوە.

سیمای مردووپەرست هەرگیز جوان نییە، چونکە زیندوو گیاندار نییە، وێنەکانی هیتلەر گەواهی دەری ئەوەن کە نەیتوانیوە لەناخی دڵەوە پێبکەنێت، شپیر دەیگوت کە نانخواردنی نیوەڕوان و ئێواران لەگەڵ هیتلەردا دەبووە هۆی بێزاری، بەردەوام قسەی دەکردو گرنگیی بەوە نەدەدا کە گوێگرەکانی تاقەتیان چووە. خۆشی بەتەمەڵییەکی وەهاوە قسەی دەکرد کە لەکاتی قسەکردندا خەو دەیبردەوە، تەوەزەلیو ساردوسڕی لەئەدگارەکانی مردوو پەرستانە.

چەمکەکانی مردووپەرستیو زیندوو پەرستیم لەتاقیکردنەوە قەرەوێڵەیی (سریری)یەکانی خۆمەوە بەدەست هێنا، بەلاّم تیۆریی ئیرۆس و ئاناتۆسەکەی فرۆیدیش کەم تازۆر کاریگەریی لەسەرم هەبوو، سەرەتا وەکو زۆربەی زانایانی دەروون شیکاری تیۆریی (غەریزەی مەرگ–ئاناتۆس)م پێ قبووڵ نەبوو، چونکە بەمەسەلەیەکی خەیاڵییەتی دەهاتە پێشچاوم کە دوورە لەواقعەوە، بەلاّم تاقیکردنەوەقەرەوێڵەییەکانم سەلماندیان کە گەرچی ئەو تیۆرییەی فرۆید وەکو بیروڕاکانی تری مایەی پرسیارە بەلاّم دەستی لەسەر خاڵێکی زۆر گرنگ داناوە، دوو مەیلی سەرەکی لەئینساندا هەیە (مەیل بۆ ژیان)و (مەیل بۆ وێرانکاری) فرۆید بەکورتی ئەم دوو مەیلەی پێناسە کردووە، ئەو دەیوت غەریزەی ژیان یاهێزی ژیان (یان غەریزەی خۆشەویستی –ئیرۆس–) لەهەوڵی یەکپارچە کردنو پێکەوە بەستنەوەدایە بەلاّم ئامانجی غەریزەی مەرگ (ئاناتۆس) لێك ترازاندنی یەکپارچەییەو یان بەواتایەکی تر پارچە پارچەکردنە.

تیۆرییەکەی فرۆید و هەردوو زاراوەی زیندوو پەرستیو مردوو پەرستییەکەی لای من لەدوو خاڵدا لەیەکتر جیاوازن یەکەمیان: لەتیۆرییەکەی فرۆیددا ئەو دوو هێزە لەتواناادا یەکسانو هاوتان، ئەو دەڵێ مەیلی وێرانکاری لای مرۆڤ ئەوەندەی مەیلی ژیان بەهێزە، لای من وانییە، بەڵگە بایۆلۆژیکەکان ئەم بۆچوونەی فرۆید پووچەڵ دەکەنەوە، چونکە ئەگەر گریمان بەرزترین یاسای بایۆلۆژیك پاراستنی ژیانو گیانی مرۆڤ بێ، کەواتە لەدیدی مانەوەی رەچەڵەکەوە شتێکی راست نییە کە توانای یامەیلی وێرانکاری لەگەڵ مەیل بۆ

بەردەوامەی ژیان یەکسان بێ، لەشتێکی تریشدا لەگەڵ فرۆیددا نیم: بەڵگەمان هەیە کە مەیلی وێرانکاری واتە ئەو مەیلەی کە لە غەریزەی مەرگەوە سەرچاوە دەگرێ، بەهۆی شکست لەهونەری ژیاندا دێتە گۆڕێ.

خەڵکانێك هەن کە دەرفەتی ئازادبوون و بەخشینی بەرکەماڵییان نەبووە بەهێزو تواناکانی خۆیان، خەڵکانێك کە سنووریان بۆ دانراوەو خراونەتە چوارچێوەوە، لەچینێکدا یاکۆمەڵێکدا دەژین کە هەموو شتێك تیایدا میکانیکیو بێ گیانە، ئەم جۆرە خەڵکانە توانای خۆبزواندنیان لەدەست داوە، وردە بۆرژوا، ئەو چینەی کەلایەنگرانی هێتلەر زیاتر سەر بەو بوون، کەسانێك بوون کە توانای ئابووریو کۆمەڵایەتیان نەبوو، خەڵکانێکی بێ ئومێد بوون، گەشەسەندنی سەرمایەداری نوێ چینی ئەوانی بەرەو فەوتان بردبوو، بەڵام نازیەکان بەو ئومێدە ئەوانەیان لەخشتەبردبوو کە سبەینێ ئاسۆی روونەو تیایدا سوپەر مارکتەکان دەبنە موڵکی ئەوان. هەرکەسەو جێو رێی شایستەی خۆی دەبێت، ئەم دیمەنەی کە نازیەکان لەخەیاڵی خۆیاندا کێشابوویان، وێڕای ئەوەی کە درۆو دەلەسە بوو، توانای خەڵەتاندنی خەڵکی هەبوو، بەم جۆرە سۆشیالیزمی نەتەوەیی نەیتوانی هیچ بکات بۆ رێ گرتن لەگەشەی سەرمایەداریو بەپێچەوانەوە بەردەمی بەرەڵا کرد تاهەرچی زووترە گەشە بسەنێ.

هەمان پەیوەندی لەنێوان چالاکیی فەوتاوو مردووپەرستیدا، لەخەڵکدا هەیە، ژمارەی ئەو کەسانە کەم نەبووە کە خێزانەکانیان ئەوەندە مردوو بوون کە منداڵەکانیان لەقۆناغی منداڵیدا بچوکترین هەناسەی ژیانیان هەڵنەکێشاوە، هەموو شتێك لەژیانیاندا دیسپلین کراوەو ژیان بریتی بووە لەدارایيو هەبوونی مادی، دایكو باوك هەر کارێك کە منداڵ خۆی پێی هەڵسابێت بەخراپیان زانیوە، شتێکی بەڵگەنەویستە کە منداڵ خۆی زۆر چوستو چالاکە، ئەم راستییەش چ دەروونناسیو چ زانستەکانی دی سەلماندوویانە، بەڵام والەمنداڵ دەکرێ کە وردە وردە ئەو پرکێشیەی خۆی لەدەست بداتو لایەکی دی هەڵبژێرێت کە بەناچالاکیو ساردو سڕی کۆتایی دێ، سەرەنجام گەیشتمە ئەوەی کە ئەو

کەسەی لەزەت لەژیان نابینێ ئەنگێزەی بەرباد کردنی ژیان بەسەر هەست بەپڕوپووچیی ژیان لای زاڵ دەبێو گەرچی لەدیدی فیزیۆلۆژیکەوە زیندووە، بەڵام لەلایەنی دەروونییەوە مردووە، ئەمە هۆی مەیلی وێرانکارییە لای مرۆڤو هەروەها هۆی کوشتنو لەناوبردنی خەڵكو تەنانەت خۆیشی، لەجێی دان پیانانی بەوەدا کە نەیتوانیوە، دوای هاتنەوە دونیاوە چالاكو خۆشحاڵو بەروح بێ. ئەمە شتێکی تاڵەو گەر بڵێین ئەنگێزەی وێرانکاری لەم هەستەوە کە کاردانەوەیەکی کوێرانەیە سەرچاوە دەگرێ، ئەوا هەڵەمان نەکردووە.

شۆلتز: ئایا بەبۆچوونی ئێوە مردوو پەرستی لەزیادبووندایە؟

فرۆم: بەداخەوە بەڵێ، هێندە لەشتی میکانیکیدا نقوم بووین کە ڕێی گەشەسەندنی مردوو پەرستی ئاوەڵایە، ئێمە لەژیان هەڵدێین، دژوارە کەبڵێین بۆچی لەکۆمەڵگای سیبرنیتیكو فەرهەنگی ئێمەدا (شتەکان) خەریکن جێ بە (مرۆڤەکان) لەق دەکەنو خۆیان دەچنە جێیان، هەروەکو پێشتر وتم خەڵك خەریکن لەبوونی خۆیان دڵنیانابن، مەبەستم لەوشەی (بوون) زاراوەیەکە کە لەمێژووی فەلسەفەدا بایەخێکی زۆری هەیە، بوون چییە؟ بایەخی من زیاتر بەمانای زیندوو ئەزموونیی ئەو شتەیە نەك مانا فەلسەفیەکەی بۆ نموونە: وەختێ ئافرەتێك دەچێتە لای پزیشکێکی دەروونشیکاری دەڵێت:

(دکتۆر من کێشەیەکم (هەیە) مێردێکی باشم (هەیە) دوو منالم (هەیە).

ئەو ئافرەتە لەهەر قسەیەکیدا کرداری (هەبوون– دارایی) بەکاردێنێ. هەموو دونیا بەچاوی خاوەنداریەوە دەبینێ، کاتی خۆی ئەوە ئافرەتە بەم جۆرە باسی حاڵی خۆی دەکرد (دکتۆر من لەکێشەدام، من شادمانم، من نیگەرانم، مێردەکەم خۆش دەوێ یاخۆشم ناوێ) –ئەم جۆرە بەیانکردنەم لەهەردوو زمانی ئینگلیزیو ئەڵمانیدا تاقی کردۆتەوە– بەم تەرزە خەڵکی دەربارەی چالاکی هەستی خۆیان دەدوێن، نەك دەربارەیئەوەی کە (هەیانە)–، کەچی ئێستا مەیلی بەکارهێنانی کرداری هەبوون پەیدا بووە، من هەموو (شتێکم هەیە) بەڵام (هیچ نیم).

شۆلتز: بەو جۆرەی کە ئێوە پشت بەوشەی (ژیان) دەبەستن، گەر ئیتر مرۆڤ نەتوانێ بەناوی میللەت، یاقانوون، یاحیزب یائەرك یاسەرچاوەی دەسەلأتەوە لەپێناوی ئایندەیەکی ئینسانیدا هەوڵ بدات، تاقە ڕێگای‌گەیشتن بەو ئایندەیە (بەناوی (ژیان)ەوە) دەبێ، ئەم بایەخدانەی ئێوە بەژیان بێگومان پابەندە بەچەند مەرجێکەوە تاژیان گەشەبسەنێ، ئایا دەتوانن باسی مەرجەکانی گەشەسەندنی ژیانمان بۆ بکەن؟ ئایا زیندووپەرستی لایەنی سیاسیشی هەیە؟ ئێوە بەپێچەوانەی دەروونشیکارانی ترەوە، بایەخ بە سیاسەتیش دەدەن (گەرچی سەربەستن‌و سەر بەهیچ لایەنێك نین) بەلای ئێوەوە چالاکی ی سیاسی وابەستە ن‌یە بەچالاکی‌ی حیزبی‌یەوە، دەشێ کەسێك ئەندامی حیزبێك نەبێ‌و باشتر لایەنگیری بیروباوەڕێك بکات، بێ ئەمەش هەڵوێستی تیئۆریکی ئێوەیە، دەکرێ لەم رووەوە زیاتر شتمان بۆ روون بکەنەوە؟

فرۆم: بەڵێ پێم خۆشە، چونکە ئاماژەتان بۆ خاڵێکیش کرد کە بەلای منەوە لەرووی کەسی‌و کۆمەڵایەتی‌یەوە بایەخی خۆی هەیە، ئێوە راست دەکەن، لەقۆناغێکی ژیاندا -لەلاوی‌دا- کاتێك خەڵکی حەز دەکەن بچنە ریزی حیزبێکەوە، من ئەو کاتە نەچوومە ریزی هیچ حیزبێکەوە، دواتر چەند ساڵێك بوومە ئەندام لەحیزبی سۆشیالیستی ئەمریکادا. بەلأم لەبۆچوونی منەوە حیزبەکە ئەوەندە راستڕەو بوو، کە گەرچی بەرانبەر بەتواناشی گەشبین بووم، بەلأم هەر نەمتوانی تیایدا بمێنمەوە، من کابرایەکی تائەوپەڕی سیاسیم، بەلأم نەلەسیاسەتداو نەلەهیچ کارێکی تردا ناتوانم خۆم بەکۆمەڵێك وەهەم‌و خەیاڵ‌و درۆو دەلەسەوە هەڵواسم، تەنها لەبەر ئەوەی ئەو وەهەم‌و درۆیانە پشتگیری لە ( خەتی سیاسی)ی من دەکەن، دەکرێ درۆ وەسیلەیەکی پەیوەندی بێت لەنێوان ئێمەو حزبدا، بەلأم لەکۆتایی‌دا تەنها راستگۆییەکە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئازادی، بەلأم ئەوەی جێی داخە خەڵکانێکی زۆر لەئازادی دەترسن‌و وەهەم‌و خەیاڵی بەسەردا پەسەند دەکەن.

شۆلتز: چونکە خەتی حیزبی قبووڵ دەکەن و پەیرەویی لێ دەکەن، سیاسەتی حیزبی ئێمە چاوبەست دەکات، بەمانایەکی تر دەتوانین بڵێین کە سیاسەتی حیزبی ئێمە لەسیاسەت دوور دەخاتەوە، بێگومان لێرەدا مەبەستم هێرش کردنە سەر حیزبەکان نییەو نکوڵی لە پێویستیی بوونی حیزبیش ناکەم، بەڵام لەو بڕوایەدام کە زاڵبوونی حیزبە سیاسییەکان بەسەر ژیانی سیاسیی ئێمەدا ناچارمان دەکات کە نەبینە سیاسی.

فرۆم: بەڵێ، حیزبەکان، بەتایبەتیش حیزبە پەرەسەندووەکان کە بەدەگمەن لەشێوەی حیزبدا دەمێننەوە، ئەم حیزبانە زۆر پێویستیان بەکەسانی سەربەست هەیە. بوونی کەسانی سیاسیی چالاك کە پڕ کێشی ڕوونکردنەوەی فیکرو بەدەرخستنی پێودانگی ئاگایی خۆیان هەبێ، پێویستە. ژیانی تایبەتیو گشتی لەیەکتر جیاناکرێنەوە، ناتوانین هوشیاری بەخودی خۆمان و هۆشیاری بەکۆمەڵ لێکدی بترازێنین، چونکە ئەو دووانە پێکەوە بەستراونەتەوە، یەکێك لەهەڵەکانی فرۆیدو ژمارەیەکی دی لەدەروونشیکاران ئەوە بوو کە ئەو دوو هوشیاریەیان لەیەکتر جیا دەکردەوە، دەیانوت دەتوانین تەواو خۆمان بناسین و لەهەمان ماتدا لە پرۆسەکانی نێو کۆمەڵ بێ ئاگابین، بەڵام وانییە، جگە لەکۆمەڵێك بەڵگە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بڕوایە ناکرێ حەقیقەت دابەش بکرێ، ناکرێ لەشوێنێك حەقیقەت ببینین و لەشوێنێکی تر چاوی لێ بپۆشین، ئەم تێڕوانینە تەقەلای ئێمە بۆ گەیشتن بەحەقیقەت بێ ئاکام دەکات، وەختێ دەتوانین تێڕوانینێکی دروستمان سەبارەت بەخۆمان هەبێ کە بتوانین تێڕوانینێکی دروستمان سەبارەت بەخەڵکانی تریش هەبێ، واتە کاتێك کە توانیمان ببینین ئەو خەڵکە لەزەمینەی باری کۆمەڵایەتیاندا چۆن دەژین و چی لەدەوروبەرماندا ڕوودەدات، خۆشەویستیش وەهای لێمان دەوێ، گەر هاورەگەزی خۆمان خۆش بوێ ئیتر ناتوانین ئەو خۆشەویستییە بدەین بەچەند کەسێك و بەس، بۆیە دووچاری هەڵە دێین: دەبێ ببینە سیاسی، تەنانەت سیاسیەکی پڕ جۆش و خرۆش. هەرکەسەو

بـەگوێرەی ئاكـاری خـۆی، بـەگوێرەی ژیـانی كـاری خۆی‌و بـەگوێرەی توانـاو قابیلیەتی خۆی.

پێویستە ئاماژە بۆ خاڵێكیش بكەم كە هەر پەیوەندیی بەم مەسەلەیەمانەوە هەیە، ئەویش ئەوەیە كە رۆشنبیر ئەركێكی سەرەكیی هەیە كە دەبێ ئەنجامی بـدات، چ لەسـەرەتاداو چ لەكۆتایی‌داو هەمیشـە، ئـەركی ئـەو گەڕانـە بـەدوای حەقیقەتداو گوتنی حەقیقەت، ئەركی رۆشنبیر نیگاركێشانی دیمەنە سیاسیەكان (بەو مانایـەی باسمـان كـرد) نییـە، بـەڵكو ئـەركی بنـەڕەتی رۆشـنبیر ئەوەیـە كـە بەردەوام هەڵوەدای حەقیقەت بێ‌و لـەم رێگایەشدا گوێ بەبەرژەوەندیی خۆی‌و خەڵكی تر نەدات، ئەگەر رۆشنبیران رۆڵی خۆیان پشتگوێ بخەن‌و بەشوێن چەند راستی‌یەكدا بگەڕێن كە لەخزمەتی بەرنامەی حیزبێك یائامانجە سیاسی‌یەكانی بێت، بائەو ئامانجە سیاسیانە زۆر بەبەهاش بن، لەئەركە راستەقینەكەی خۆیان‌و تەنانـەت لەئـەركی گرنكـی سیاسـیی خۆشیان دوور دەكەونـەوە، چونكە بـەبڕوای من پێشكەوتنی سیاسـی بـەوەوە بەنـدە كە تاچەند ئێمـە لەحەقیقـەت ئاگـادارین، تاچەند لەگوتنی ئەو حەقیقەتەدا راشكاوو ئازاین‌و، ئەو حەقیقەتـەش تاچەند كار لەخەڵكی دەكات.

شۆلتز: بەرهەڵستیی سیاسی لەهەموو جیهاندا لەئارادایە، بەرهەڵستی (یان بـەرەنگاری) هـۆی زۆرەو لەشـێوەی جیاجیـادا خـۆی دەنوێنـێ، لەسـای هەنـدێ بارودۆخ‌و هەل‌و مەرجدا نـەك بەتـەنها هـەقی بەرهەڵستیمان هەیـە، بـەڵكو ئـەركی سەرشانیشمانە.

گانـدی توانایـەكی تیئـۆریی زۆری بـۆ بەرهەڵسـتی‌و بەرزكردنـەوەی سـتراتیژی بەرهەڵسـتی هێنایـە گـۆڕێ‌و تیایـدا سـەركەوتووبوو، تیئۆری‌یەكـەی ئـەو تـەنها لایەنێكی نەدەگرتەوە، بەڵكو هەموو بوونی مرۆڤی دەگرتـەوە. گانـدی بـەڕادەی بێ توندوتیژی (اللاعنف) بەرهەڵستیكارانی لەگەڵ سەربازەكاندا بەراورد دەكرد، واتـە دەبووایـە ئامـادەی گیـان فیـداكردن بوونایـە، بـەڵام ئازایـەتیی ئـەوان لـەجۆری پاڵـەوانێتیی شـەڕكردن نـەبوو، بـەڵكو ئـازایی بـوو بـۆ ئاشـتی. بڕنـدەترین چەكی

بەرهەڵستیی بێ توندو تیژی بەکارنەهێنانی چەك بوو. ئێمە تازە واخەریکین پەی بەگرنگیی بەرهەڵستی ناتوندوتیژ دەبەین، هیتلەر بەبەرهەڵستیەکی وەك بەرهەڵستیە بەرنامەرێژیکراوەکەی گاندی بەرامبەر هێزی ئیمپریالیستی بەریتانی نەبۆوە.

بەرهەڵستی بەرامبەر هیتلەر، کە لێرەدا کرۆکی باسەکەی ئێمەیە بەرهەڵستیەك بوو دژ بەو سازکرا، بەڵام بێهوودە بوو، بۆ دەرك کردنی مانای ئەو بەرەنگارییەی کە بەرامبەر هیتلەر هاتە گۆڕێ، سەرەتا پێویستە ئەو پیاوە بناسین، چۆن توانای لەرادەبەدەری ئەو پەرەی سەند؟

کتێب و نامیلکەی زۆر دەربارەی هیتلەر نووسراون، بەڵام هیچ کامێکیان شیکردنەوەیەکی وردی بەدەستەوە نەداوە، زۆربەی لایەنەکانی کەسێتیی ئەو نەزانراوە، گەلێ لەنووسەران بڕوایان وابووە گەر بەرەنگاری بەرامبەر هیتلەر وردترو کاریگەرتر رێك بخرایە سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا.

ئایا ئەم بڕوایە لەجێی خۆیدایەتی؟ ئایا ئەو پیاوو ئافرەتانەی کە دەستیان دایە بەرەنگاری دەیانزانی بەرانبەر چ کەسێك وەستاون؟ ئایا وێڕای نەتوانینی ناسینی کەسێتی ئاڵۆزی هیتلەر رووداوە سیاسییەکان، بەرەنگاربوونەوە لەجێی خۆیدا بوو؟ زۆربەی بەشداران لەبەرەی دژدا ئاشنای خسوسیاتی هیتلەر بوون، بەڵام دەبووایە بیانزانیایە کە لەگەڵ دیاردەیەکی گشتیدا تەرەفن، نەك لەگەڵ تاکە کەسێکدا، ئەوانە تێگەییبوون کە لەم قوماردا دەیدۆڕێنن، جگە لەوەی کە لە پشتیوانیی خەڵکانێك بەرخوردار نابن کە ئاگایان لەبارودۆخەکان بووە، لەو باوەڕەدا بوون کە هەم زووتروهەم درەنگتر لەکاتی خۆی دەست بەکاربوون، کەوتنی هیتلەر درەنگ بوو، ئایا میللەت گەیشتبووە ئەوەی تابێ بوونی ئەویش دەزگای سیاسی بخاتە گەڕ؟ ئەم گومانە رۆڵی سەرەکیو کۆنترۆڵکەری لەشێوەی بیرکردنەوەی رابەرانی سەرەکی پیلانەکەدا هەبوو.

پرۆفیسۆر فرۆم، ئێوە بەپێچەوانەی زۆربەی هاوکارانتانەوە، هەر لەسەرەتاوە خۆتان بەدەروونناسیو ئەنپرۆپۆلۆجیای سیاسییەوە خەریك کردووە، بەڕای من

هەڵسەنگاندنەكەی ئێوە لەمەڕ هیتلەر هەڵسەنگاندنێكی تۆكمەیە، چونكە هەم ئاسۆی دیدی ئێمە فراوان دەكات‌و هەم گەلێ پرسیاریش دەوروژێنێت.

فرۆم: هیتلەر كێ بوو؟ وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە وابەستەیە بەكەسێتی‌ی پرسیاركەرەكەوە، بەڵام بەهەر حاڵ پرسیارێكە كە دەشێ هەموو كەسێكیش بیكات، ئەو كێیە؟ من كێم؟ ئایا وەڵامێكی بنبڕ بۆ ئەم پرسیارانە هەیە؟ ئەم توێژینەوەیەش لەهیتلەر وەكو توێژینەوە لەهەر كەسێك دژوارە، چونكە هەركەسێك بریتی‌یە لە كۆمەڵێك ئەنگێزەو هاندەرو هاودژ، لەگەڵ ئەو شتانەی كە دەربارەی خۆی دەیزانێت‌و، هەروەها كۆمەڵێك هەست‌و كرداری نائاگایانەش لەمرۆڤدا هەیە كە خۆی نایانزانێت، بۆیە ناكرێ وەڵامی بنبڕانەی ئەم جۆرە پرسیارانە بدرێتەوە: ئەو كێ بووە یاكێیە؟ من كێم؟ بەڵام نابێ ئەم راستی‌یەش بكرێ بەبیانوویەك بۆ (نیسبیەت)و بوترێ كە ناسینی خودو خەڵكانی تر ئەستەمە، ناسینی خەڵكی بەرادەی پێویست بۆ مەبەستی كارو دیاری كردنی مرۆڤی باش‌و خراپ، سوودمەندو زیانمەند شتێكە لەتوانادایە، دوای ئەم پێشەكی‌یە بەرەچاوكردنی، دەكەوینە باسی هیتلەرو خەسڵەتەكانی.

لەبایۆگرافی‌ی هیتلەرڕا دیارە كە هەر لەتافی منداڵی‌یەوە لەعالەمی خەیاڵاتدا ژیاوە، هەڵوەدای شكۆمەندی‌و بەرزی بووەو ئەم هەستەش هەم ئارامی‌ی پێ بەخشیوەو هەم نەیهێشتووە لەگەڵ واقیعدا تەبابێت، لەكتێبی نەبەردی من –كفاحی–دا دەنووسێ كە لەگەڵ باوكیدا رێك نەبووە، چونكە ئەم دەیویست ببێ بەهونەرمەند، بەڵام باوكی دەیویست ببێ بەكارمەندی دەوڵەت، چونكە خۆی كارمەندی دەوڵەت بووە، باوكی پەی بەوە بردبوو كە كورەكەی هەستی بەرپرسیاری‌و ئیلتیزامی نی‌یەو هەوڵ نادات لەژیاندا رۆڵێكی كاریگەرانەی هەبێت، یائامانجێكی دیاری كراوی هەبێت، بەرانبەر بەمە هیتلەریش وەك گەلێ مرۆڤی نێرگسی رووبەرووی نائومێدی‌ی پەی دەرپەی دەبووەوە، چەند لەوەهمی شكۆو باڵایی خۆی‌دا زیاتر لەخۆی بایی دەبوو، درزی نێوان رواڵەت‌و واقیعی ئەو گەورەتر دەبوو، هەر ئەم درزەش دەبوە هۆی ئەوەی زیاتر رق‌و گۆڕان‌و نەفرەت‌و

تەنانەت وەهمی زیاتری لادروست بکات، بۆیە کەمتر بەلای واقیعدا دەشکایەوەو پتر خۆی دەدایە دەست خەیالات. ئەم بارەش هەر لەسالآنی سەرەتای ژیانییەوە لەیی دیاریدا. هیتلەر چوو بۆ ڤیەننا، لەوێ تاقیکردنەوەی قوتابخانەی هونەریداو رووی لەهونەری ساختومانکاری کرد، بۆ قبوولْ کردن لەو بەشەدا دەبووایە سالێکی تری وانە بخوێندایە، بەلآم نەیویستو حەزی نەکرد درێژە بەخوێندن بدات، سەرنەکەوتنی خۆی لەتاقیکردنەوەکاندا، تەنانەت لەنزیکترین کەسی خۆی دەشاردەوە، بەشەقامەکاندا دەسوورایەوەو لەسەر دیواری ساختومانە گەورەکان رەسمی دەکێشا، بەخەیالْی خۆی ئەوە رێی هونەری ساختومانکاری بوو، سەرئەنجام بووە هونەرمەندێکی بازاری، لاسایی تابلۆ جیهانیەکانی دەکردەوەو کۆپیی دەکردنو هەرگیز نەیتوانی خۆی شتێکی نوێ بخولقێنێو لەو پارەو پوولەی کە بەفرۆشتنی ئەو کارانە دەستی دەکەوت گوزەرانێکی خراپی دەبردە سەر.

هیتلەر بەپێچەوانەی لافو گەزافەکانی خۆیەوە، نموونەی شکستو ناکامی بوو، تائاگری شەری جیهانی هەلْگیرسا. لەجەنگدا (بێدار) بۆوە، هەستی کرد دەتوانێ لەریزی هێزی ئەلْماندا خۆی ببینێتەوە. پێویستیشی بەوە نەبوو سەربەخۆ کاربکات، هیتلەر لەراستیدا سەربازێکی ئازاو جێی متمانە بوو، بەلآم لەئاست ئەوانەدا کە لەخۆی گەورەتربوون مەرایی کەر بوو، ئەمە سیفەتێکی ریشەداربوو تیایداو تەنانەت وەختێ گەیشتە ترۆپکی دەسەلآتو ژێر دەستەکانی خۆی ناچار دەکرد کرنووشی بۆ بەرنو مەرایی بۆ بکەن، ئەو خەسلەتەی هەر تێدا مابوو، تەنها (چارەنووس)، قانوونی سروشتو خوا لەو بالآدەست تر بوونو لەبەردەمیاندا دەکەوتە سەرئەژنۆ.

ئەمە روخسارێکی هیتلەر بوو، سیفەتێکی تری ئەو خود شەیدایی (نێرگسێتی)یەکی فرەبوو، خود شەیدایی سیفەتێکە هەموومان دەتوانین ببینین. واتا دەتوانین لەخەلْکدا ببینین، بەلآم لەخۆماندا نە ء خود شەیدا تەنها ئەو شتانە بەراستو بەگرنگ دەزانێ کەراستەوخۆ کار لەخۆی بکەن، بیرو رای من،

بوونیمن، دارایی من، من باوەڕی من، هەستی من. هەموو ئەمانە هەن و ئەوەی پەیوەندیی بە منەوە نەبێ زەحمەتە هەبێ جاری وا هەیە خود شەیدایی دەگاتە ئاستێکی وەها کە نەخۆشەکە ناتوانێ تەسەوری هیچ شتێك بکات کە لە دەرەوەی خودی خۆیدا ڕوودەدات. هیتلەر لە تەواوی قۆناغەکانی ژیانیدا مرۆڤێکی خود شەیدا بوو. جگە لە بوونی خۆی، بایەخی بە هیچ شتێکی دی نەدەدا، گرنگی بە پەیوەندیو خواستەکانی دایك و دۆستانی نەدەدا. ئەسڵەن هاوڕێیەك چییە نەیبوو. تەواو گۆشەگیرو خۆپارێز بوو لە خەڵك، بە تەنها چاودێری خودی خۆیو، بەرنامەکانی خۆیو، خواستەکانی خۆی بوو.

دەتوانین بڵێین گرنگترین خسوسیەتی هیتلەر مردوو پەرستی بوو. مردوو پەرستی بەمانای خۆشەویستیی مردوو، خۆشەویستیی ویرانکاریو هەموو شتێك کە ژیانی تێدا نییە. مردوو پەرستی پێناسەیەکی ئاڵۆزی هەیە کە لێرەدا بواری نییە، بەڵام دەتوانم سیفەتەکانی بژمێرم. کەسانێك هەن کە خۆشەویستیی ژیان لە سروشتیاندایەو، بە ئاسانی دەناسرێنەوە. سیمای ئەمانە کە نەك تەنها خۆشەویستیان بەرامبەر خەڵك و شتەکان هەیە بەڵکو بەرامبەر بە ژیان هەیانە، هەمیشە دەچێتە دڵەوەو شادی بەخشە. کەسانێکیش هەن کە ژیانیان خۆش ناوێو لێی بێزارن و، لەبری ئەوە مەیلیان بەرامبەر بوونەوەری بێگیان و مەرگ هەیە.

شۆڵتز: باشە کەواتە مردوو پەرستی لای هیتلەر چۆن بووە هۆی نەفرەتیو سەر نگوم کردن" تەنانەت لای هێزی بەرهەڵستکاریش؟ ئایا نەبوونی کاردانەوەیەکی سەلبی نیشانەی ئەوە نەبوو کە مردوو پەرستی ئێخەی هەموو میللەتی گرتبووەوە، یا بەئاشکراش نەبێ؟ دەبووایە جۆرە پەیوەندیەك، یا هاوکاریەك، لە نێوان هیتلەرو دارو دەستەکەیو لایەنگرانیدا هەبووایە.

فرۆم: وەڵامی ئەم پرسیارەتان ئاڵۆزە. سەرەتا دەڵێین وێکچوونی زۆر لە نێوان کەسێتیی هیتلەرو لایەنگرە دەمار گیرەکانیدا هەبووە. لە دیدگای سۆسیۆلۆژیاو دەروونناسییەوە زۆربەی باوەڕداران بە سۆشیالیزمی نەتەوەیی سەر بە چینی

وردە بۆرژواو ئەو چینە نائومێدە بوون کە لە بارودۆخ ناڕازی بوون و دووچاری ئازاردان و ئازار چەشتنیش بوون. لەڕووی گاڵتەوگەپەوە بەم سیفەتە دەڵێن (سیفەتی پایسکیل سواری). چونکە ئازاردەرو ئازار چێژ بۆ لەکەمەری خۆی سەروتر دەچەمێتەوەو لەقە لەخوارتر لەخۆشی دەدات. لەژیاندا شتێك شك نابات شایستەی عەشق و خۆشەویستیی بێت، لەبری ئەوە توانای خۆی بۆ دەستهێنانی دەسەلأت و بەکارهێنانی ئەو دەسەلأتە بەرامبەر خەڵکانی ترو تەنانەت بۆ لەناو بردنی خۆشی تەرخان دەکات.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە هیتلەر ئەکتەرێکی لێهاتوو بوو. جوان دەورەکەی خۆی دەبینی و بەڕادەیەك کە خەڵك تەواو بڕوایان بەوە کردبوو کە ئامانجی ئەو ڕزگار کردنی ئەڵمان و ئەڵمانیەکان و دابینکردنی خۆشگوزەرانیە بۆیان، ئەمە ببووە هۆی ئەوەی کە ملیۆنەها کەس لە ئاست حەقیقەتدا کوێر بن و نەیبینن. هیتلەر توانایەکی سەیری هەبوو لە سوود وەرگرتن لە سادەیی خەڵك.ئیتر ئەو توانایە ناو دەنێیت دەسەلأتی ڕۆحی خواپێدراوانە (کاریزما) یا سیحر یا هیپنۆتیزم، یا دیماگۆگیو یا هەر ناوێکی دی. توانیبووی وا لە خەڵك بکات تەسلیمی ئەو توانایەی بن و لە کامی دڵەوە حەز بە گوێڕایەڵی بکەن(دەڵێن خەڵکی دەچوونە ژێر سیحری تەماشا کردنەکانیەوە): خەڵکی سەرەتا تەسلیمی دەبوون" ئینجا باوەڕیان بە قسەکانی دەهێنا. جارێکیان وتوویەتی پێویستە کۆبوونەوەکان لە شەودا ئەنجام بدرێن" چونکە ئەو دەمە خەڵکی شەکەت و ماندوون و زووتر باوەڕ دەهێنن و بەرەنگاریو توانای بەرهەڵستیان کەمتر دەبێتەوە.ئەم هۆکارانە دەست لە ناو دەست بوون تا هیتلەر توانی بەشاردنەوەی هەستی وێرانکاریی خۆی"کۆمەڵە هەوادارێکی بەوەفا لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو فریویان بدات. ملیۆنەها کەس سەریان لە ڕێی ئەودا دانابوو، بەبێ ئەوەی بزانن مەبەست و ئامانجی ڕاستەقینە چییەو بۆ کوێیان دەبات.

شۆڵتز: هیتلەر قەناعەت پێ کەر بوو. دەتگوت ( لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارێ) هەروەها لەریزی ئەو کەسانەبوو کە پێیان دەڵێن (مرۆڤی خاوەن قودرەت)، ئەو

گفتی چارەسەرکردنی گیروگرفت و تەنانەت ڕزگارکردنی خەڵکیشی دەدا. ئەمە لەسەرێکەوە، لەسەرێکی ترەوە خۆی (لەخوارەوە هەڵسا بوو). بەبڕوای من مرۆڤی خاوەن قودرەتی لەم جۆرە" لە ڕاستیدا مرۆڤێکی لاوازە. قودرەتی هیتلەر بۆ ئەو دەرفەتە دەگەڕایەوە کە ئەوی کردبووە نوێنەری خەڵکانێکی زۆر، دەسەلاتێك کە شێوەی بەرەنگاری لەخۆ بگرێ لە نەزمێکی ترەوە سەرچاوە دەگرێ. هیتلەر دەشێ ئەو توانای بەرەنگاریەی نەبووبێ کە ئێمە مەبەستمانە. یان لەوانەیە من بەهەڵەدا چووبم. من سەرم سوڕماوە لەو پەیوەندیەی نێوان (پێشەوا)و ئەو خەڵکەی کە لایەن ئەوەوە ڕێنمایی یا گومڕا دەکرێن.

فرۆم: قسەکەتان زۆر ڕاستە. هیتلەر لەو ڕابەرانە بوو کە دەیانەوێ عەوامی خەڵك لەدوایانەوە بێت تا هەست بە دەسەلات بکەن. ئەو کەسێك نەبوو کە بتوانێ بەبێ هاندان و پشتیوانی خەڵك بیرۆکەیەك دابهێنێو پیادەی بکات، بەڵکو بەردەوام پێویستی بە ئافەرین و جۆش و خرۆشی خەڵك بووە تا هەست بە دڵنیایی بکات. هەستی دەسەلاتی ئەو لە کاردانەوەی ئەو خەڵکەوە سەرچاوەی دەگرت کە گوێیان بۆ ئەدێرا. ئەم حاڵەتە ڕۆحیەش هەر لە سەرەتاوە تیایدا دەرکەوت، واتە وەختێك کە شانەی سەرەکەی حیزبی کرێکارانی سۆشیالیزمی نەتەوەییان لە میۆنیخ پێکهێناو بە هەموویان ٢١ بیست ویەك کەس بوون، هیتلەر وەك هەموو ئەوەندە خودی خۆی لاگەورە بوو کەوایدەزانی هەر وشەیەك کە لە دەمی دێتە دەرێ یەك پارچە حیکمەت و حەقیقەتە. ئەو بەر لەوەی باوەڕی بە خۆی بێت" پێویستی بەباوەڕهێنانی خەڵك بوو. بیروباوەڕەکانی هیتلەر لە بیروباوەڕێکی لۆژیکی (مەنتیقی)یەوە سەرچاوەیان نەدەگرت" بەڵکو ئاکامی پێویستیەیە هەڵچوونیەکان بوو لەسەر بناغەی هەست کردن بەگەورەیی و دەسەلات، بەلام هەروەکو وتم" سەلماندنی ئەو بیروباوەڕانە لەلایەن خەڵکەوە بۆ ئەو پێویست بوو. ناشلێم هیتلەر شێت بوو، بەڵکو بۆ پاراستنی خۆی لە شێتیو سەلماندنی سەلامەتی ئاوەز (عەقڵ) و دروستی بیرو ڕاکانی پێویستی بە ملیۆنەها کەس بوو. لە ڕوانگەی هیتلەرەوە شاباش و چەپڵە لێدانی خەڵك و

جەماوەر سەلمێنەری ڕاستیی بیرو ڕاکانی بوو" نەك ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ئەو بیرو ڕایانە. هیتلەر هەرگیز بایەخی بە گەوهەری حەقیقەت نەدەداو، وەکو زۆربەی فریودەرانی جەماوەر بایەخی بەوەدەدا کە جێی ورووژاندنی جەماوەرو شاباشیان بێت. چونکە شاباش جیلوەی حەقیقەت بە هەموو شتێك دەبەخشێت.

شوڵتز: قسەکانی ئێوە ڕێنماییەیە بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو سیاسەتکاران و سیاسەتی ئەوان، بەڵام بەداخەوە تا گەیشتن بە ئامانجی سیاسی ڕێگایەکی درێژمان لەبەردەمدایە، ئامانجێك کە ئێمە لە فریودان و درۆو دەلەسەو، ناڕاستی و ئەو ئەنگێزە دەروونیە بپارێزێ کە مرۆڤ بۆ ملکەچی هان دەدات" ئێستاش با بگەڕێینەوە سەر پرسیارە سەرەکیەکەمان. پرۆفیسۆر فرۆم، بەرهەڵستیو. سەرچڵی و یاخیبوون دژ بەو کەسانەی کە خسوسیەتەکانیانتان ژمارد، چۆن دەبێو هەنگاوەکانی چین؟

فرۆم: بابزانین بەرهەڵستی یانی چی؟ بەرهەڵستی بەرامبەر کەسێك یان شتێك. سەرەتا پێویستە خۆمان کەسێك بی" خەڵکی فریو نەدەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت توانای هەڵبڕینی دەنگی ناڕەزاییمان هەبێ، سەر نەوی نەکەین و تووڕە بین. بەڵام دەبێت ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە بەرامبەر (سەرکردەیەك)ی وەك هیتلەرو سیاسەتەکانی ئەو وەستاوین کە بۆچوون و بیرو باوەڕی تێکەڵەیەکە لە فەلسەفەو ئاینێکی تایبەت بە خۆی" نەك بیرو باوەڕێك لە پێناوی بەرەو پێش بردن و پەرە دان بە وڵات.

بێگومان هیتلەر دەیوت کە بەرژەوەندیی ئاڵمانی دەوێت. جا کێ هەیە حەز بەوە نەکات ؟ بەڵام نەیدەوت کە یەکێك لە ئامانجەکانیشی وێرانکردنی وڵاتانی ترە. گەر تەنها کاری ئەوە بووایە کە بەرگریی لە ئەڵمان بکردبایە" ئەوسا یان دەمانوت کارەکەی ڕاستە، یان دەمانوت هەڵەیە، ئەو شێوازەی ڕاستە یان راست نییە. پاشان بۆ گەیشتنە ئەنجام حیسابێکی وەکو ئەوەی بازرگانەکان دەیکەن بەس بوو. بەڵام هەموو گفت و بەڵێنەکان جگە لە (بیانوو) هیچی تر نەبوون و مەسەلە بەڕواڵەت لۆژیکیەکە بە هیچ جۆرێك مەبەستی ناوەوەو پەنهانی ئەوی

ئاشکرا نەدەکرد. بەرانبەر بەمە ئایدیۆلۆژیای هیتلەر بە تەنها بەیانکەری سروشتی مردووپەرستیو ئازاردەرو ئازارچێژی ئەو بوو. پێویستە بڕوانینە ئەودیوی فۆرمەلەی لۆژیکیو ئەوەندە بایەخ بەوە نەدەین کە رابەری سیاسی (چی) دەڵێت و (چۆن) دەیڵێت. دەبێ لە سیماو جووڵەکانیو رواڵەتی وردبینەوە تا بتوانین پەی بە سروشتی بەرین و بزانین ئایا کەسێکی مردووپەرستە؟ کەسێکە کە لەکامی دڵەوە حەزی پێ ناکەین؟ یا رقمان لێ دەبێتەوەو رقمان تێدا دەوروژێنێ؟ کەسێکە کە بریمنان سارێژ ناکات و هەرگیز ناتوانین لە گەڵیدا هەڵ بکەین" چونکە ئێمە تەواوی تواناکانی خۆمان خستۆتە خزمەتی پاراستنی ژیان و کەرامەت و ئازادیی مرۆڤ بە پێچەوانەوەی مردوو پەرستێکەوە کە تواناو هێزەکانی خۆی بۆ وێرانکاریو، مل پێ کەچ کردنی خەڵکی ترو، کردنی خەڵکی بە پردو، دەسەڵاتخوازی تەرخان دەکات. دەبێ بەوردی گوێ بۆ وشەکان شل بکەین و لە دووی ناسینی قسەکەرەکەو مەبەستی بین و کەسێتیو سروشتی بناسین.

هەروەها دەبێ ئەوە رەچاو بکەین کە لەگەڵ کەسانێکی وەکو هیتلەردا" بەتەنها مامەڵە لەگەڵ سیاسەتدا ناکەین لەمانا باوەکەیدا، بەڵکو لەگەڵ فەلسەفەو ئاینێکی تایبەتیشدا. هەر کەسێك پەیڕەوی لە ئاینێك دەکات" بەڵام بەمانا فراوانەکەی ئەم وشەیە. واتە کۆمەڵێك ئامانجی هەیە کە بۆ وەدیهێنانیان تەقەللا دەکات. دیدو هەستێکی هەیە کەوای لێ دەکات لە مەکینەیەك زیاتر بێت کە کاری خواردن و بەرهەم هێنانە. بەڵام ئەمڕۆکە ئەو ئەنگێزانە وەك جاران لە شێوەی ئایینی تەقلیدیدا خۆیان نابیننەوە" بەڵکو بایەخ بە فیکرو بەرنامەڕێژیی سیاسی و ئابووری ئەدەن. مەسەلەکە ئەوەیە کە ئێمە نازانین تا ئێستاش ئەنگێزەی ئایینی لە دەروونماندا هەیە. گەر بپرسین ئایا ئایینی هیتلەر چی بوو؟ وەرامەکە بەم جۆرە دەبێ: دروست کردنی خودایەك لە نەتەوایەتی. دەسەڵات، نایەکسانی، رق و کینەو دوژمنایەتی. ئایینی ئەو پەرستنی دەسەڵات و وێرانکاری بوو. ئایینێك کە لە کوفر بالاترو جیاواز لە ئایینە تەقلیدیەکانی وەکو ئایینی مەسیحیو

جوولەکەو هەر نەریتێکی هیومانیستیبە واتایەکی تر دەتوانین بڵێین کە ئایینی هیتلەر داریونیزمی کۆمەڵایەتی (Social Darwinism) بوو. ئەو گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە هەر شتێك لە خزمەتی چاك کردن و کامڵ بوونی نەژاد (رەگەز)دا بێت باشە. مرۆڤ لەو بارەدا بەپێی فەرمانەکانی خوداو بەگوێرەی دادپەروەریو خۆشەویستی کارناکات، بەڵکو هەر هەنگاوێکی بەناوی کامڵبوونەوەیە. کەم نین ئەو کەسانەی داروینیزمی کۆمەڵایەتییان کردۆتە ئایینی خۆیان.. بنەماکانی کامڵبوون لایان خودای تازەیەو داروینیش پێغەمبەرێکی نوێ. بەڕای من تاقە شتێك کە هیتلەر باوەڕی پێ بوو ئەوەبوو کە بەناوی یاساکانی کامڵبوون و بایۆلۆژییەوە کاری دەکرد.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بە تەنها لای هیتلەر نەبوو. نووسینەکانی کۆنراد لۆرانسیش دەربارەی شەڕەنگێزی رەنگدانەوەی هەمان بیروباوەڕە. بنچینەی تیۆریە فەلسەفیەکەی لۆرانس ئەوەیە کە دەبێ ملکەچی یاساکانی کامڵبوون بین. لە ساڵی ١٩٤١دا لە وتارێکیدا کە تیایدا بیروڕای خۆی دەربڕی بوو، بەشان و باڵی کۆمەڵێك یاسای هیتلەردا دێو دەربارەی (رەگەزی بەرزتر) نووسیویەتی کە ئەو یاسایانە بناغەی زانستیی خۆیان هەیە. ئێستاش ئەم پرسیارە دەکەین: (ئایا دەتوانین ئەو ئایینە فەلسەفیو هۆکارە فەلسەفییانە بناسین کە زەمینەی فۆرمەلەی سیاسیین؟ ئایا توانای بینینی ئەوەمان هەیە کە بزانین ئەنگێزەی داواکردنی باشتر لامان، ئەنگێزەیەکی فەلسەفیو دەروونیيە؟ با بەناوبانگترین نموونە بخەینە بەرچاوی خۆمان: شۆڕشی گەورەی فەرەنسا. ئازادی،یەکسانی، برایی، ئەمانە کۆمەڵێك بیروباوەڕبوون کە خەڵکیان هان دا، ئەم بیروباوەڕانە رەگ و ریشەیان لە سروشت و بوونی مرۆڤ دا هەیە. هەندێ لە دەمارناسان دەڵێن ئەو بیروباوەڕانە بەرهەمی بونیادی مێشکی مرۆڤ خۆین. بۆ ئەوەی ئۆرگانیزم بتوانێ بەباشی کاری خۆی بکات" ئازادی مەرجێکی پێویستە.

ئەو بیروباوەڕە هەم گوزارشتی لە هێڵی سیاسیی شۆڕشگێڕەکانی فەرەنسا دەکردو هەم بەرهەمی فەلسەفەی قۆناغی رۆشنگەری (مرحلە التنویر)بوو، ئەو

فەلسەفەیەی کە رەگێکی قووڵی لەناو دڵی زۆربەی خەڵکیدا هەبوو. ئەو خواستە مرۆڤایەتیانە باروذۆخ و حاڵەتی مێژوویی میللەتانیان وە ئاگا هێنابۆوە. بە هەمان شێوە خودشەیدایی هیتلەریش جۆرە ئایینێك بوو، بەڵام بە ئامانجی تەواو جیاواز، هەر بۆیە خەڵکانیشی بەلای خۆیدا راکێشا.

شۆلتز: لەوانەیە بتوانین ئەو خاڵە بە شێوەیەکی بەرچاو لە بەیانەکانی مۆڵتکە Moltkeوفرایزالەر Freislerدا ببینینەوە. بە کورتی مۆڵتکە دەیوت کە خاڵی هاوبەش لە نێوان سۆشیالیزم و مەسیحیەتدا هەیە، بەڵام هەمان خاڵی هاوبەش هۆی ناتەبایی‌و ناکۆکییانە لەگەڵ یەکتردا" هەردووکیان دەیانەوێ گوێ رایەڵ و ئەڵقە لە گوێی تەواوەتییان بیت.

فرۆم : زۆر راستە، ئەوەی مۆڵتکە لەو رووەوە لە رستەیەکدا دەریبڕیوە، من دەمویست بەوردی روونی بکەمەوە. ئەوە مەبەستی سەرەکیی ئێمە بوو.

شۆڵتز:مولتکە لەم جۆرە بەیاناتە نائاساییانەی زۆر بووە. بیروڕا سیاسیەکانی ئەو کردەیی‌و واقیعبینانە بووە. بەردەوام سەلماندویەتی کە پیاوی کارە. ئەو مرۆڤی بە گۆڕەپانی بەرژەوەندیە سیاسیەکان دەزانی. بیروڕاکانی مۆڵتکە سەبارەت بە فێرکردن لەژێر کاریگەریی بیروڕاکانی یۆگن رۆزن شتۆك هۆسی دایە، ئەو باوەڕی وابوو کە بابەتی راستەقینەی فێرکردنی سیاسی ئەوەیە کە ( ئێمە کێین؟!) نەك ئایا بیروباوەڕی سیاسیمان چی‌یەو سەر بە چ حیزبێکین. ئەم بۆچوونە لەو قۆناغەدا هێند پەسەند نەبوو. ئەمڕۆش ئەوەندە هەواداری نییە. چونکە بە جۆرە (بەخۆوە مەشغوڵ بوون)ێکی لەقەڵەم دەدەن، بەڵام ئەگەر ئەوە لە گۆشەنیگای ئێوەوە لێی بڕوانین" زۆر بەجێیە. لەو گۆشەنیگایەوە ئەو بەرەنگاریەی کە لەلایەن زۆربەوە بەرامبەر هیتلەر لە تواناداا نەبوو، نەك وەك نارەزایی سەرزاری بەڵکو دەبووە کردەوەش. ئەو ژیانە نارەزامەندەش بە تەنها تایبەت نەدەبوو بە چەند سیاسەتمەدارێك، بەڵکو بە هەمووان. ئایا دەروونناسان هۆی ئەوە بەچی لێك دەدەنەوە؟

فرۆم: ئەو کێیە، سروشت و خسوسیاتی چیە؟ ئەمە پرسیارێکی ئاکاریو دەروونناسی نییە،بەڵکو پرسیارێکی سەرەکیە لەسیاسەتدا، هەر کەسێك بەرامبەر بەم پرسیارە بێ دەربەست بێت، دیدێکی سیاسی دیاریکراوی دەبێت. لە دیدی سروشتناسی (زانستی ناسینی تەبیعەتی مرۆڤ)ەوە لایەنگیریی ئەڵمانییەکان چۆن لێکدەدرێتەوە؟ ئایا زەوییەك بوون کە دەیتوانی ئەو تۆوە بڕوێنێ کەهیتلەر دەیڕشت، یا زەوییەکی وشك و بەیار؟ ساڵی ١٩٢١ لە گەڵ چەند هاوکارێکمدا لە دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی لەو پرسیارەمان کۆڵییەوە. بەداخەوە ئەنجامی کارەکەمان بڵاونەکرایەوە ( ئەو ڕاپۆرتە دواتر لەلایەن زانکۆی هارڤاردەوە لەژێر ناونیشانی _(چینی کرێکار لە ئەڵمانیای ڤایمەردا)) بڵاوبۆتەوە).

ئەو پرسیارەی کردمان ئەوە بوو" ئایا ئەگەر هیتلەر بیەوێت دەسەڵات بگرێتە دەست، تا چەند دەشێ لەبەرەنگاربوونەوەیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنرێ؟ بەرەنگاریی زۆربەی میللەت، بە تایبەتی ئەوانەی کە بیرو باوەڕیان لەگەڵ بیروباوەڕی ئەودا جیایە، واتە چینی کرێکارو زیاتریش کارمەندان، تا چ رادەیەك دەبێ؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەستمان بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوە کردو لەوەدا پەیڕەومان لە شێوازی سروشتناسی کرد، بەڵام کارمان بە هیتلەر نەبوو، بەڵکو مەبەستمان دیاری کردنی سروشتی مرۆڤی دیکتاتۆر بوو. دیکتاتۆر لەیەك کاتدا مەیلی گوێ ڕایەڵیو فەرمانڕەواییشی هەیە. ئەم دوو خەسڵەتە بەردەوام هاوشانی یەکن و کەلێنەکانی یەکتر پڕدەکەنەوە. بەڵام کەسێتیی دیموکرات و شۆڕشگێڕی ڕاستەقینەش تەواو بە پێچەوانەوەیە، نە حەز بە گوێ ڕایەڵی دەکات و نەحەز بە فەرمانڕەوایی دەکات. مرۆڤی دیموکرات یەکسانی و پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ بەشێکی حەتمی دەزانێو تەنها لایەنی ئەو شتانە دەگرێت کە ئەو دوو پێداویستییە بۆ مرۆڤ دابین دەکەن.

گریمانەی تیۆریی ئێمە ئەوە بوو کە ئەوەی مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە گرنگیەکی ئەوتۆی نیيە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چ جۆرە دروشمێکی حیزبی یابنەماڵەیی یا کۆمەڵایەتی ئەوی وروژاندووەو بەوانی بەستۆتەوە، لەگەڵ چ جۆرە ئایدۆلۆژیایەك دا دەستەو یەخە بووە. بیری ئەو کەم تا زۆر لەبیرکردنەوەی ئەوانی دی دەچێت، کە مەیلە بۆ گەلەیی (حەز کردن بۆ بوون بە تاکێك لەگەلە؟)و لەدەستدانی سەربەستی، بەرانبەر بەمە ئەوەی کەسێك بیری لێ دەکاتەوە ناوی دەنێین (را– Opinion.

ڕا بە ئاسانی دەگۆڕێت و تەنها تا ئەو کاتە نەگۆڕە کە بارودۆخ بەنەگۆڕی بمێنێتەوە. یەکێك لە خەوشەکانی راوەرگرتن ئەوەیە بەتەنها پرسیار لە ڕادەکرێ. لەراوەرگرتن. (ریفراندۆم)دا ناکرێ بپرسین ئەگەر سبەینێ بارودۆخ گۆڕا ئەوسا راتان چی دەبێت؟ بەڵام لە سیاسەتدا ئەم پرسیارە شتێکی پێویستەو، گرنگترین پرسیار ئەوە نیيە کە لەم ساتەدا چۆن بیر دەکەیتەوە؟ بەڵکو چۆن دەژیت‌و کار دەکەیت؟ چۆنیەتیی ژیان و کارکردن بە سروشتی مرۆڤەوە بەندە. ئەگەر پرسیارەکە بەو جۆرە بکەین پێویستمان بە چەمکێکی تر دەبێت کە ئێوە پێشتر باستان کردو ئەویش (باوەڕ– conviction)ە باوەڕ رایەکە کە رەگ و ریشەی لەسروشتی ئەو کەسەدایە نەك لە مێشکیدا. لە وەڵامدانەوەی پرسیارێکی وەکو (مرۆڤ چیيە؟)دا باوەڕی کەسێکت بۆ دەردەکەوێ. بەڵام پایەو بنچینەی را ئەو شتانەیە کە ئەو کە دەیانیستێت. هەر بۆیە ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە تیرۆر نیيە بەرەنگار دەبنەوە“ نەك ئەو کەسانەی ڕایان لەگەڵ تیرۆردا نیيە. بەواتایەکی دی، تەنها ئەو خەڵکانە دەتوانن بەرهەڵستکاربن‌و بکەن و فریو نەدرێن کە تەواو لە سروشت و خەسڵەتەکانی دیکتاتۆری بەدوورن.

شۆلتز: ئەو ئەنجامەی ئێوە لەڕێی تۆژینەوەکانتانەوە پێی گەیشتوون من سەرسام دەکات، بوونی ئەو توانایە لەرا وەرگرتنی ئێستادا شتێکی دژوارە. تەنها لە هەڵسەنگاندنی بیروڕای گشتیدا نیيە کە بایەخ بەسروشت ئەدرێ، بەڵکو

زانیاریە سیاسیو راگەیاندنیەکانی ئێمەش جگە لە (ڕا) بایەخ بە شتێکی دیکە نادەن.

فرۆم: بەداخەوە ئەم بایەخ نەدانە کەمو کورتیەکی گەورەی زۆربەی لێکۆڵینەوەی مەیلە سیاسیەکان و فێرگوزاریە سیاسیەکانە. بچوکترین بایەخ نادرێ بە سروشتی فەلسەفیو ئایینی، کە بمانەوێو نەمانەوێ لە ژیانی سیاسیماندا ڕۆڵی هەیە. یەکێك لەو بیرۆکانەی کە مارکسیزم پێی لەسەر دادەگرێ ئەوەیە کە سیاسەت بەیانکەری بەرژەوەندییە ئابوریو چینایەتیەکانە. مارکسیستەکان هەمیشە ئەو بیرۆکە سیاسیە دەخەنەپێش ئامانجە تەرەفدارەبەروالەت حەقیقیەکانەوە، بە بۆچوونی من هەقیانە. بەلام بۆچوونێکی نوقسانە. ئێمە نابێ تەنها گرنگی بە هۆکارە کۆمەلایەتیو ئابووریەکان بدەین، بەڵکو پێویستە تەواوی ئەو هەڵچوون و هاندەرە دەرونیانەش کە لە مرۆڤ دا دەوروژێن و پەیوەستن بە هۆکارە ئابووریو کۆمەلایەتیەکانەوە رەچاوبکەین و گرنگیان پێ بدەین. بەمانایەکی دیکە" مرۆڤ بە تەنها لە پێناوی سوودی مادیدا هەنگاونانێت. بەڵکو پێداویستیە دەروونیەکان و، ئەو هەست و ئامانجەی کەرەگ و ریشەیان لە هەلومەرجە ئیسانیەکاندایە" ئەمانەش ئەنگێزەی مرۆڤن. دەبێ تەواو ئەو دوو هۆکارە بناسین" واتە ئەنگێزەی ئابووریو ئەنگێزە تایبەتیەکانی مرۆڤ، تا تێبگەین کە بۆچی خەڵکی فلانە ڕێی سیاسی دەگرنە بەر.

لەم زەمینەیەدا لێکترازانێکی فراوان لە نێوان ئاگاو مەعریفەت لە ئێمەدا هەیە کە هێشتا دەروونناسی لێی نەکۆڵیوەتەوە، زانستە سیاسیەکانیش هێشتا لە قۆناغی کۆپی کردنی نووسراوەکانی مێژوو نووسەکان دا وەستاوەو ڕۆڵی هەڵچوونە دەروونیەکان لە سیاسەت دا نەخراونەتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە.

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر تۆژینەوەکانی خۆمان لە فرانکفۆرت. دەمانویست کە رادەی لایەنگری لەلای کرێکاران و کارمەندان بزانین، بۆیە بیست هەزار کارتمان بەسەریاندا بلاوکردەوە کە هەر کارتەو کۆمەڵێك پرسیاری تێدا بوو.

نزیکـەی شـەش سـەد بڕگـەمان پـێ گەیشـتەوە" کـە بـە نیسـبەت کارتەکانـەوە ژمارەیـەکی کـەم بـوو. پرسـیارەکان بـەو جـۆرە نـەبوون کـە بـە بـەڵێ. یـا نـەخێر،یا لەگەڵیـدام، تـا رادەیـەك لـە گەڵیـدام، یـا لـە گەڵیدا نـیم وەڵام بدرێتـەوە. وەڵامـەکان لـەرێی کەسـێکەوە دەنووسـرانەوە کـە پرسـیارەکانی لێیـان دەکـرد. پاشـان ئـەو وەڵامانەی کە پێمان گەیشتن هێنامـان و چۆن دەروونپزیشك یا دەروونشـیکار لـە عیادەکەی خۆیدا کاردەکات" بەو جۆرە کارمان لەسەر کردن.

کاریگـەریی نائاگایانـەی وەڵامەکـە لەسـەر بیرکردنـەوەی بـە ئاگـای نەخۆشـەکە چیە" سـەرنجمان دا: گـەر بێتـو بـەو جـۆرە وەڵامـەکان شـی بکەینـەوە، ئـەوا چـەن سـەد وەڵام نـەك بـە تـەنها بیروڕاکـانی بـە ئاگـای کەسـەکەمان بـۆ روون دەکاتـەوە، بەڵکو پەی بەوەش دەبەین کە سروشـتی چۆنە، حـەزی لـە چییە هـۆگری چییەو رقی لە چییە، چی مـەحکوم دەکات، ئـەو شـتەی گـوێی پـێ نـادات، یـان دەیـەوێ گوێی پێ نەدات.

بـۆ نموونـە تەماشـای ئـەم پرسـیارە بکـەن:(ئایـا لـە پـەروەردەکردنی منـاڵان دا لێدان شتێکی پێویستە؟) یـەکێك بـە ئـەرێ و یـەکێك بـە نـەرێ وەڵام دەداتـەوە، ئـەم دوو وەڵامـە شـتێکی ئـەوتۆمان دەربـارەی سروشـتی ئـەو کەسـە پـێ ناڵێـت. بـەڵام ئەگەر کەسێك بڵێت:( نـەخێر لێدان شتێکی چاك نییـە، چونکە لـە ئازادیی منـاڵ کەم دەکاتەوەو نابێ ترس بخەینە دڵی منداڵەوە.) ئـەوا ئێمـە ئـەو کەسـە بـە خـاوەن سروشتێکی دژ بە دیکتاتۆری لە قەڵەم دەدەین و هەروەها بە پێچەوانەوە. لـە تاقـە وەڵامێکیشەوە ئەنجامی کۆتایی بـە دەسـت نـاهێنرێ. کارتـەکانمان نزیکـەی چـەند سـەد پرسـیارێکی گرنگیـان گرتبـووە خـۆ، کـە هـەموویان پرسـیاری راشـکاوو مـەنتیقی بـوون. دوای خوێندنـەوەی دە وەڵام دەمـانتوانی بـە مەزەنـە جـۆری وەڵامەکانی تریش بزانین. ئەنجامی کۆتاییمان کە بە دەست هێنا بەم جۆرەبوو: لـە سەدا دە کەس خاوەنی سروشـتێکی دیکتاتۆریانـە بـوون کـە حـەزیان بـە دەسـەڵات دەکـرد. دڵنیـا بـووین لـەوەی کـە ئەوانـە پـێش یـا پـاش ئـەوەی هیتلـەر دەسـەڵات دەگرێتە دەست دەچنە ریزی نازییەکانەوە. لـە سـەدا پانزدەیان دژ بە سروشتی

دیکتاتۆریانە بوون، کە بەڕای ئێمە هەرگیز ئەمانە ناچنە ریزی نازی‌یەکانەوە، ئیتر ئایا ژیان و ئازادیی خۆیان دەخەنە مەترسی‌یەوە، ئەمە پرسیارێکی تربوو، بەلام هەمیشە دژ بە دیسپلینی پۆلیسی‌و ئایدیۆلۆژی بوون. لە سەدا حەفتاو پێنجی وەلامەکانیش، واتە ئەوەی کە مایەوەو زۆربە بوو، وەکو زۆربەی خەڵکانی وا بەستە بە چینی بۆرژواوە سروشتێکی ئاوێتەیان هەبوو. نەتەواو حەزیان بە دەسەلات دەکردو نە تەواویش دژی بوون، بەڵکو دوو مەیلە بوون. بەڕای ئێمە ئەمانە نەدەبوون بە نازی‌ی دەمارگیرو نەدەبوون بە هێزی بەرەنگاری نازیزم، بەڵکو تێکەڵ بە تەوژمی کۆمەڵ دەبوون و بە پلەی جیاجیا، جۆش و خرۆش یا ناڕەزایی‌و دژایەتیی خۆیان دەردەبڕی. گەرچی ئامارێکی وردمان لادێیە تا بزانین لە سەدا چەند کرێکارو کارمەند چووە ریزی نازی‌یەکانەوە، یا چووە ریزی بەرەنگارانەوە، بەلام بەڕای من ئەوەی رووی‌دا نزیك بوو لەو ئەنجامانەی ئێمە بە دەستمان هێنان. تەنها ژمارەیەکی کەم لە کرێکارانی ئەڵمان پەیوەندییان بە گروپەکانی ئۆپۆزیسیۆنەوە کردو ژمارەیەکی کەمتریش ئیلتزامیان بە نازیزمەوە کرد. زۆربەی بەلای هیچ یەکێك لەو بالانەدا نەچوون. ئەوەبوو ئۆپۆزیسیۆن بێ ئاکام بوو. بێگومان پێشبینی‌یە تیۆریەکەی ئێمە" هۆکارێکی گرنگ بوو لە هەڵسەنگاندنی حەقیقەتی سیاسی‌و ئاسۆی سەرکەوتنی هیتلەردا. هەمان کار دەکرێ لە هەر ولات و هەر کۆمەڵێکدا ئەنجام بدرێ بەو مەرجەی بپرسین (هەست بەچی دەکەیت؟) و (چیت؟) نەك ( چۆن بیر دەکەیتەوە؟).

هەر ئەوەندەی جیاوازیی نێوان باوەڕو رامان زانی" ئیدی دەتوانین لەڕێی تۆژینەوەو شیکردنەوەی کۆمەلایەتیەوە پەی بە راستی‌یەکان بەرین.

شۆڵتز: وتتان کە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەتان بلاوبۆوە. بۆچی؟

فرۆم: چونکە بەڕێوەبەری دەزگا زانستیەکە نەیدەویست ئەو توێژینەوەیە بکەویتە بەردەستی خەڵك. زانیاری تەواوەتیم دەربارەی بلاونەکردنەوەی لادێیەو ئەگەر باسی بکەم، باسەکە درێژە دەکێشێ و لەبابەتەکەی خۆمان دوورمان دەخاتەوە.

شـۆڵتز: لەوانەیـە تـرس و سـڵ كردنـەوە یـەكێك بووبێـت لـە هۆیـەكانی بڵاونەكردنەوەی ئەو راپۆرتە، چونكە دەبووە هۆی وروژاندنی خەڵك.

فرۆم: ئـەنجامی تۆژینەوەكـە ئاشـكرا نـەكرا، لەهەنـدێ لەراپۆرتـە تایبەتـەكان بەمێـژووی دەزگاكـە نووسراوە كـە توێژینـەوەی وا ئەسـڵ و ئەساسـی نیـیە، بـەڵام ئەمە راست نیـیە توێژینەوەكە ئەنجام دراو بەڵگەنامەكانی لە ژێر دەستدان.

شۆڵتز: ئایا ئێستاش لەو جۆرە لێكۆڵینەوانە ئەنجام دەدرێ؟

فرۆم: هەشـبێ مـن نـازانم. مـن و هاوكـارم مایكل كـوبی لـە لێكۆڵینەوەیەكدا دەربـارەی دێیـەكی بچـووكی مەكسـیك هـەمان تـەرزی لێكۆڵینـەوەمان بـەكارهێنا. تۆژینەوەكە سەبارەت مـەیلی دەسـەڵاتخوازیو دژی دەسـەڵاتخوازیو خسوسیاتی تری خەڵك بوو. مایكل كوبی لەتوێژینەوەیـەكی تریـدا هـەمان شێوازی پـەیرەوی كـردووە بـۆ زانینـی جیـاوازیی نێـوان مردووپەرسـتیو زیندووپەرسـتی لـە چینە جیاجیاكانی كۆمەڵگای ئەمریكاییدا.

شۆڵتز: پرۆفیسـۆر فـرۆم، چـۆن دەتـوانین ببینـە داوەرێكـی بـاش سـەبارەت بـە سروشـتی مـرۆڤ لـە مەیـدانی سیاسـیدا؟ زۆربـەی سیاسـەتمەدارانی ئێمـە هێنـد ئارەزوویـان لـە سـەلامەتیی ئـەو خەتـە نیـیە بـەڵام بەبۆچـوونی مـن لـەپێناوی سـەلامەتیی دیموكراسـیدا دەبـێ لـە ئاسـت ئـەو كەسـانەدا كـە دێنـە گۆڕەپـانی سیاسـەتەوە وردبـین. تەلـەفزیۆن ئـەو بوارەمـان بـۆ دەڕەخسـێنێ كـە لـە نزیكـەوە سـیمایان ببیـنین، لـە جووڵـەكانیان وردبینـەوە. زۆر بچـینە نـاو قـووڵایی قسەكانیانەوە. دەبـێ پـەی بـەو ئەنگێزانـە بـەرین كـە لـە پشـتی وشـەكانەوە خۆیـان شاردۆتەوە. چۆن دەتوانین ئەم كارە ئەنجام بدەین؟

فـرۆم: ئەمـە مەسـەلەیەكی بنەڕەتییـە لـە دیموكراسـیدا. چـۆن دەتـوانین دیموكراسی لە كەوتنە داوی دیماگۆگیو فریـودانی خـەڵكانی سادە بپارێزین؟ لە دیموكراسـیدا هـەر كەسـەو بەسەرپەرشـتیو بـە گـوێرەی بۆچـوونی خـۆی بڕیـاردەدات و داوەری دەكـات. بـەڵام ئەگـەر خـەڵك تـەواو پـەیڕەویی قسـەو فەرمانـەكانی سیاسـەتمەدارێك بكـەن" چـۆن دەتـوانن خـاوەن رای خۆیـان بـن و

دەتوانن داوەری بکەن، بێگومان توانایەکی دیکەیان بۆ بڕیاردان هەیە. رادەران هەستێکی نائاگایانەیان هەیەو هەر لە ڕێی ئەوەوە دەربارەی دروستی، درۆزنی، راستگۆیی، شایستەیی‌و هەڵبژاردنی پاڵێوراو بۆ هەڵبژاردنەکان بڕیاردەدەن. لە ئەمریکاو،تەنانەت لە ئەڵمانیش بەم جۆرەیە. بەڵام کارامەیی پێویست تا ئێستا لە هیچ شوێنێك نەگەیشتۆتە پلەی کامڵبوون.

گەلێ هەل ومەرج پێویستن بۆ پرۆسەی دیموکراسی کە لێرەدا ناتوانم باسیان لێوە بکەم. تەنها ئەو خاڵە دەسنیشان دەکەم کە دیموکراسی لە شێوەیەکی دروست دا بەرقەرار نابێ ئەو دەمەنەبێت کە خەڵکی ئاگاداری ئەو مەیل و هەڵچوونانە بن کە بەسەر سیاسەتمەدارەکاندا زاڵن و، بزانن کە ئەنگێزەی فەلسەفی و نیمچە ئایینیان کە لە پشت هەڵوێست و بیرو باوەڕی سیاسیانەوەیە سەقامگیرە چییە؟ ئەمە بەو مانایەی کە نابێ تەنها پشت بە قسەکانی ببەستین" بەڵکو دەبێ لە هەموو لایەنێکەوە هەڵیسەنگێنین.

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئێمە لە ژیانی تایبەتی‌و رۆژانەی خۆماندا لەو جۆرە هەڵسەنگاندنەدا تەواو لێهاتووین. گەر کارمان بە کەسێك بێت یا ببینە هاوکار لەگەڵ یەکێك دا، ئەوەندە سادەو خۆشباوەڕنین کە تەنها باوەڕ بەو قسانە بکەین کە دەربارەی خۆی دەیانکات. لە زەینی خۆماندا وێنەیەك دەربارەی ئەو کەسە دەخولقێنین. چەند سوودو قازانجی ئێمە لەگەڵ ئەو کەسەدا زیاتر لە ئارادا بێ" ئەوەندە زیاتر ورد دەبین لە هەڵسەنگاندنی سروشتی ئەو کەسە دا. بەڵام دەربارەی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکانمان ئەوەندە خۆمان ماندوو ناکەین. دەمانەوێ ڕێنومایمان بکەن، دەمانەوێ بکشێینە دواوە، دەمانەوێ شتێك ببیستین کە حەز بە بیستنی دەکەین، دەمانەوێ کەسێکی تر لە جیاتی ئێمە بیر بکاتەوەو بەرانبەر بەوە پاداشتی بدەینێ. ئەو کەسەش کە ئەو کارانەمان بۆ ئەنجام دەدات" لە نزیکەوە لێی ورد نابینەوەو بە پێویستیشی نازانین بیناسین، بەڵام دەکرێ مرۆڤ لەنزیکەوە فێری وردبوونەوە بێت. دەکرێ ئەم هونەرە لە تاقیگەی سروشتیدا فێربین. ئەو تاقیگەیەی لە هەموو قۆناغەکانی

ژیان دا هەیە. هەر لە منالّیەوە تا تەمەنی بالّق بوون، واتە تاقیگەی ئەزموونی ڕۆژانە. مرۆڤ هەموو شتێك لەوێدا فێر دەبێت" بەمەرجێك بیەوێت ببینێت. خوێندنەوەش یاریدەرێکی باشە، گەرچی بەداخەوە دەروونناسی، بە تایبەتیش دەروونناسیی ئەکادیمی کە سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێناوە، لەبواری کۆمەڵگاو سیاسەت دا ئەوەندە سوود بەخش نەبووە. سروشتناسی، کەلە سیاسەت و، ژن و مێردایەتیو، هاوڕێیەتیو فێرکردندا ڕۆڵێکی زۆر دیاری هەیە، لە دەروونناسیدا بایەخێکی کەمتری پێ دراوە. گەرچی لە زۆربەی بەشەکانی تری دەروونناسیی ئەکادیمی بۆ ژیان پێویست ترە. ئەو بەشانەی تر کە هەندێ جار پێشکەوتنی تیۆریی فرە بە خۆیانەوە دەبینن" بەلاّم لەمەسەلە کردەییەکانی ژیان و ژیانی ڕۆژانەدا ئەوەندە سوود بەخش نین.

شۆڵتز: ببوورن کە لەم گفتوگۆیەدا دەربارەی پیشەکەی خۆم دەدوێم.(لەوانەیە پەیوەندیی بەبابەتی باسەکەمانەوەزیاد لەپێویست بە گرنگ بزانم) ئایا نابێ ڕۆژنامەنووسان شیاوی سروشتناسی بن، تا بەلایەنی کەمەوە یەکێکیان شایانی زانینی پێوەرو هەل و مەرجی پێویست بێت تا لە کاتی هەڵسەنگاندنی باری سیاسیمان و پرۆسە سەر ئەنجامە هەڵقوڵاوەکانیدا فریامان بکەوێت؟

فرۆم: بەڵێ، بێگومان، ئەمە بۆچوونێکی بەجێیە، بەلاّم نابێ شتێکمان لەبیر بچێت. سەرگەرم بوون بە سروشتناسییەوە پێویستی بە پرکێشیە. ئەوە ئاسانە بڵێین فلاّنە ڕابەری سیاسی باشەو لەڕێی خزمەتکردنی ئێمەدا هەنگاو دەنێت،ئەمە کارێکی بێ سەر ئێشەیە. بەلاّم گەر بمانەوێ بڵێین فلاّنە ڕابەری سیاسی فێڵبازەو، سیاسەتەکەی بەرەو وێرانکاریمان دەبات و، ئامانجەکانی شتێکن و قسەکانی شتێکی ترو، لایەنگیری جۆرە فەلسەفەو ئایینێکە کە دژ بە بیروباوەڕی ئێمەیە، دەبێ بۆ وتنی ئەمانە پرکێش و ئازابین، چونکە سەلماندنی ئەوانەش هێند ئاسان نییەو، هەروەها چونکە ماهیەتی سروشتی مرۆڤیش ئاڵۆزە.جگە لەوە ئێمە ئەم حوکمانە بە نازانستی لە قەڵەم دەدەین تا بەبەڵگە نەسەلمێنرێن.

شـۆڵتز: دوا پرســیارم کـە دووبارەکردنــەوەی قســەکانی پێشــووە بــەڵام بــە شێوەیەکی چڕتر. بەرەنگاری یا بەرهەڵستی ناوێکی ترە بۆ چالاکیی چڕکراوە. چالاکییەك کە دەبێ وەك وانە بوترێتەوە. کەچی هەر ئەوەندە مەسەلەی سیاسیو کۆمەڵایــەتی هاتــە گــۆڕێ ئــیتر بەهــەر هۆیــەك بێــت دوچــاری ناکــارایی‌و بــێ دەربەســتیو، قــەدەر پەرســتیو، هەســت بــەلاوازیو، کەمتەرخــەمیو، هەســتکردن بەبێدەسەڵاتی لەبڕیاردانو، بەڵکو هەست کردن بە (گوناه)یش دەبین. بە داخەوە بواری باسکردنی ئەو هۆیانەمان نییە. بەڵام سوپاسگوزار دەبم ئەگەر بە کورتی ئەوەمان بۆ روون بکەنەوە کە بەرەنگاری کەیو لە کوێ دەبێ دەست پێ بکات، واتە بەر لەوەی پیاو کوژیو رەشەکوژی بێتە گۆڕێو، کاریگەر بێت؟

فرۆم: ئەگەر پاش سەرکەوتنی هیتلەر بتەوێ بەرەنگاری دەست پێ بکەیت" ئەوا هەر لە سەرەتاوە دۆڕاویت.چونکە بۆ بەرەنگاربوونەوە مرۆڤ پێویستی بە هاندەرێکی دەروونیو باوەڕە. دەبێ باوەڕتان بە خۆتان هەبێ، لادەبێ فیکرێکی رەخنەگرانەتان هەبێ، دەبێ مرۆڤێکی ئازادو سەربەخۆبن نەك مەڕێکی ناو مێگەل، گەیشتن بەم ئاستەو فێربوونی (هونەری ژیانو هونەری مردن) پێویستی بە کۆششێکی زۆرو مەشقی زۆرە. ئەو هونەرەی وتم وەکو هەر هونەرێکی تر پێویستی بە فێربوون هەیە. هەر کەسێك بەو جۆرە نەشونما بکات" توانای جیاکردنەوەی باش و خراپی دەبێت" چ بۆ خۆی و چ بۆ خەڵکانی دی. باش و خراپ بە نیسبەت خۆیەوە وەك مرۆڤێك، نەك لە دیدی سەرکەوتن و بەدەست هێنانی دەسەڵات و سوودی ماددییەوە.

بونیادی مێشك بە جۆرێکە کە دەتوانین کاری نائاساییش بکەین. ئێمە دەتوانین باشترین ئامانجەکانی خۆمان هەڵبژێرین و هەڵچوونەکانی خۆمان بخەینە خزمەت ئەو ئامانجانە. هەر کەسێك پەی بەم رێگایە بەرێت" فێر دەبێت چۆن بەرامبەر دیکتاتۆرانی وەکو هیتلەرو دیکتاتۆرانی بچووك و، نامۆبوون لە ژیانی رۆژانەدا بوەستێتەوە، ئەم جۆرە بەرەنگارییە ئەمڕۆکە لە هەموو رۆژگارێکی تر سەختترە، چونکە بونیادی گشتیی کۆمەڵیش ئێستا تووی ئەو جۆرە

دیکتاتۆریەتانە بڵاودەکاتەوە. لەم بونیادەدا مرۆڤ بووەتە موورویەکی بچووك، بووەتە سفرێكو لەئەکتەرێکی بچووکی ناو سیناریۆیەکی باڵادەست دەچێت، نەدەتوانێ بڕیارێك بداتو نەئەرکێك بگرێتە ئەستۆی خۆی. تەنها ئەو کارە تەواو ئەنجام دەدات، کەمەکینە باڵادەستەکە بۆی دیاری کردووە. بواری بیرکردنەوە، هەست کردنو هەڵبژاردنێکی سەربەستانە بۆ ژیانێکی تایبەتی تەواو تەسك بۆتەوە. تاقە شتێك کە بیری مەشغوڵ دەکات ئەو ئەنجامانەیە کە لەخۆپەرستیی ئەوەوە هاتوونەتە گۆڕێ، وەکو: چۆن دەتوانم پایەیەکی باشترم دەست بکەوێ؟ چۆن دەتوانم پارەی زیاتر کۆبکەمەوە؟ چۆن دەتوانم لەش ساغ بم؟ بەڵام هەرگیز ئەم جۆرە پرسیارانە ناکات. چ شتێك بۆ من وەکو مرۆڤێك شایانو بەجێیە؟ چ شتێك بۆ شارەکەمان باشە؟ ئەم پرسیارانە لەدیدی یۆنانیەکانو لەرێبازی کلاسیکەکاندا پرسیاری گەورەو گرنگ بوون کە تەواوی فیکریان سەرگەمی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بووە، فیکرێك کە لەڕێی کۆنترۆڵ کردنی سروشتدا، لەکار نەکەوێت. بەڵکو بتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە: باشترین رێگای ژیان کامەیە؟ چ شتێك دەبێتە هۆی گەشەدان بەمرۆڤو باشترین تواناکانی دەخاتە گەڕ؟ ناکارابیە فراوانەکانی ئێمەو هاوبەشی نەکردنمان لەو بڕیارانەی کە رۆڵیان لەژیانی تایبەتیو کۆمەڵایەتیی ئێمەدا هەیە: دەبێتە زەمینەیەك کە فاشیزم یاهەر بزوتنەوەیەکی لەو جۆرە (کەوەختێ پەیدابوون ناویان لێ دەنێن) دەتوانێ تیایدا بڕوێتو گەشە بکات.

## پەیوەندیی کتێبی پێغەمبەران[١]
## بەباری هەنووکەیی ئێمەوە

بۆ قسەکردن لە سەر پەیوەندیی کتێبی پێغەمبەران بە ئێمەوە سەرەتا دەبێ وەڵامی چەند پرسیارێك بدەینەوە. ئایا هێشتا کتێبی پێغەمبەران جگە لە مەسیحی و جوولەکە باوەڕدارەکان بۆ کەسانێکی دیکە مانایەکی هەیە ؟ یان با پرسیارەکە واڵێ بکەین : ئایا ناشێ‌ئەو کتێبە ئەمڕۆش بەلای هەر کەسێکەوە مانای هەبێ ؟ یان کەمێك ئەولاتر بڕۆین و بپرسین: ئایا نابێ دووبارە پەیوەندیان لەگەڵدا دروست بکەینەوە، چونکە پەیوەندی لە گەڵیاندا پچڕاوە ؟ ئایا لە ڕۆژگارێکدا دەژین کەچیدی پێویستمان بە پێغەمبەران نی‌یە؟ بەڵام مادامەکی یەك ڕامان نی‌یە سەبارەت بەو پێناسەیەی پێغەمبەر وەك لە چاخی کۆندا هاتووە. ناتوانین وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە . ئایا پێغەمبەر کەسێکە کە پێشبینی‌ی ئاینده دەکات ؟ ئایا تەنها هەڵگری هەواڵی خراپە نەك هی باش و هیوا بەخش ؟ یان کەسێکە وەکو هەواڵدەرەکەی پەرستگای دۆلفی پەیامی پێویستمان پێ دەگەیەنێ گەرچی قسەکانی ئاڵۆزیش بن؟

پێش هەموو شتێك پێغەمبەران جەبرگەرا (ئەو کەسەی باوەڕی وایە کە خوا هەموو شتێکی لەناوچەوانی نووسیوە-و-)نین و، نکووڵی لەرۆڵی ئیرادەی مرۆڤ لەشێوەی ژیان و مێژوویاندا ناکەن.

هەروەها ئەوان توانای بینینیان هەیە نەك ئایندەبینی، یان بەواتایەکی دی پێشگۆییکارن، بەڵام نەك بەمانا حەرفیەکەی کە بەختبێن دەگەیەنێ بەڵکو بەو

---

[١] The prophets ، لەئاینی جوولەکەدا بریتی‌یە لە بەشی دووەمی ((چاخی کۆن )).

مانایەی ئەوەی کە دەیلێن هەق و حەقیقەتە، رێك وەك مانای زمانەوانیی وشەکە (Sooth sayer = پێشگۆ) ئەوەی هەق و حەقیقەت دەڵێ). ئەو حەقیقەتەی ئەوان دەیلێن ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێ لەنێو رێگا جیاوازەکانی ژیانیدا یەکێکیان هەڵبژێرێ و دەشبێ هەڵیبژێرێ، بەواتایەکی دی کارەکانی مرۆڤ لەناوچەوانی نەنووسراوە، بەڵکو ئەوەی لە ناوچەوان نووسراوە کە دەبێ یەکێکیان هەڵبژێرێ، لەزەمانی کتێبی پیرۆزدا، ئەو کاتانەی پێغەمبەران ئامۆژگارییان دەکرد، بەتەنها دووڕێ بۆ هەڵبژاردن لەبەردەم مرۆڤدا هەبوو، یەکێکیان پەرستنی ولات، خاك، بتەکان، ئەوی تریشیان وێرانکردنی ولاتان و دەربەدەرکردنی خەڵك، خەڵك ناچاری هەڵبژاردنی یەکێك لەم دوو رێیە بوون و پێغەمبەران بۆیان شی دەکردنەوە، بەلام جەخت لەسەر ئەوە دەکەم کە ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەران بەپێئەوانەی ئەوەی ئێمە ئەمڕۆ تەسەوری دەکەین، بەتەنها بریتی نەبوو لەئامۆژگاریی ئاکاری و ئایینی، بەڵکو دەربارەی (سیاسەتی واقیعی)یش، ئەدوان، ئەوان سەرنجیان دابوو ولاتێکی بچووکی خۆرهەلاتی نزیك خەسڵەتە رۆحیەکانی خۆی لەدەست داوەو وەکو ئەو ولاتانەی دوچاری داڕمانی ئاکاری بوون، خەریکە دەکەوێ، هەر بۆیە کاتی هەڵبژاردن هاتبوو، خەڵکی یان دەبووایە بەچاوی خۆیان فەوتانی ولاتەکەی خۆیان بدیبایە، یان دەسبەرداری دروستکردنی بتەکان بوونایە، لەهەڵبژاردنی یەکێك لەو دوو رێیە ئازاد بوون، بەلام پێغەمبەران دەیانویست ئەو وەهم و خەتایەی کە ماوەیەکی درێژ دەستەویەخەی خەڵك بووە، لێیان دوور بخەنەوەو قەناعەتیان پێ بکەن کە دەتوانن ولاتە بچووکەکەی خۆیان بپارێزن و وەکو میللەتێك درێژە بەژیان و بوونی خۆیان بدەن.

نموونەی دیاری ئەمەش رەفتاری شمۆئێل پێغەمبەرە لەگەڵ جوولەکەکاندا، جوولەکەکان دەیانوت شامان دەوێ تا وەکو میللەتەکانی دیکەمان لێ بێ، شمۆئێلیش رێگە چارەی جیاوازی پیشان دان و وتی: دەتوانن یاجەورو ستەمی ستەمکارێکی خۆرهەلاتی قبوول بکەن، ویان ئازادی هەڵبژێرن، هەڵبژاردنی یەکێك لەو دوو رێیە درایە دەست خەڵك، خەڵکی دەیانویست وەکو میللەتانی دی بن و

شایان هەبێ، خواوەند بەشموئێلی وت: بایەخ بەداواکەیان بدە بەڵام ئاگاداریان بکەرەوە ئەو شایەی کە دەیانەوێ چۆن کەسێك دەبێ.

ئەم مەسەلەیە رۆڵێکی تری سێیەمی پێغەمبەرانمان پێ دەڵێ:

پێغەمبەرەکان لەمەترسیی هەڵبژاردنی ئەو رێگایەی دەبێتە هۆی وێرانی‌و خراپە خەڵك ئاگادار دەکەنەوەو رێگای تریان پیشان دەدەن‌و دژی هەڵبژاردنی هەڵە رادەوەستن.

بەڵام دوای ئەوەی پەیامی خۆیان گەیاندو خەڵکیان ئاگادار کردەوە وازیان لێ دەهێنن تابەئارەزووی خۆیان بجوڵێنەوە، تەنانەت خواوەندیش دەست لەکاریانەوە وەرناداو پەرچوو (موعجیزە) ناخولقێنێ، بەرپرسیاریەکە ئەداتە دەست خودی ئادەمیزادەکان خۆیان، کە دەبێ ئامانج‌و مەبەستی خۆیان هەڵبژێرن، یاریدەی پێغەمبەر لەو سنوورەدایە کە رێگا جیاوازەکان روونەدەکاتەوەو خەڵکی لەو رێیە ئاگادار دەکاتەوە کە بەکارەسات کۆتایی دێ.

ئەمڕۆکە ئێمە لەبارێکی وەهادابین، لەبەردەمی دوو ریانێکداین:

رێیەك بەرەو کۆمەڵگەیەکی مرۆیی‌و داماڵینی چەکی ئەتۆمی، ئەوی تریشیان بەرەو وەحشیگەریی‌و وێرانکردنی جیهانمان دەبات، لەم رۆژگارەشدا ئەرکی پێغەمبەرە رێگە جیاوازەکان روون بکاتەوەو سەبارەت بەو رێیە ئاگادارمان بکاتەوە کە بەرەو فەوتانمان دەبات.

ئاینی پێغەمبەران چی بوو؟ پێغەمبەران باوەڕیان بەخوای تاك‌و تەنیا بڵاوکردەوە کە حەقیقەت‌و دادپەروەری بەشێکە لەو، بەڵام بەپلەی یەکەم گرنگییان بە باوەڕەکە نەئەدا بەڵکو ئامانجیان رابەری بوو، رێی پراکتیك کردنی پرەنسیپەکانی خواوەندیان لەم دونیایەدا پیشان ئەداو پشتیان پێ دەبەست: پەروەردگاری بالاّ، تاقە خودای یەکتاو راستە، ئەمە مانای چی‌یە؟ ئایا مەسەلەیەکی ماتماتیکیە، یەکێتی بەرامبەر بەفرەیی؟ نەخێر، مانای ئەمە ئەوەیە کە لەپشت هەر فرەیی‌و پەرتیەکی هەست‌و سۆزو مۆتیڤەکانمانەوە یەکێتیەك هەیە: یەکتاییەك کە بەرزترین ئەسڵە، کاتێ دەتوانین پەی بەو یەکتاییەش بەرین

لەبیرو بۆچوونی پێغەمبەرەکانا کە فاکتەرێکی تریش لەبەرچاو بگرین: جیاوازی لەنێوان خواوەندەکانو بتەکان یاخواوەندە درۆزنەکاندا، بتەکان دروستکراوی دەستی ئادەمیزادن، ئەگەر خوداش وەکو بت بپەرسترێ ئەگۆڕێ بەبتو دروستکراوی دەستی ئادەمیزاد، خوا زیندووەو زۆر جار گوێمان لێ بووە وتراوە (خوای زیندوو) بەڵام بتەکان شتن، یان بابڵێین مردوون، یەکێك لەپێغەمبەران لەپێناسەی بتەکاندا وتوویەتی: چاویان هەیە بەڵام نابینن، گوێیان هەیە بەڵام نابیستن.

پێغەمبەران دەیانزانی کە بت پەرستی مرۆڤ بەرەو کۆیلایەتی دەباتو خەڵکیان لەوە ئاگادار دەکردەوە کە بتپەرست لەپارچە دارێکەوە دەست پێ دەکات، بەنیوەی دارەکە ئاگرێك دەکاتەوەو نانی پێ دەبرژێنێ، بەنیوەکەی تریشی بتێك دروست دەکاو کڕنووشی بۆ دەباتو بەبەرزترو بالاتر لەخۆی دەزانێ، بۆچی ئەو پارچە دارە لەو بالاتر ئەبێ؟ لەبەر ئەوەی بتپەرست تەواوی هێزەکانی خۆی بۆ ئەو دارە دەگوێزێتەوە، بتەکەش لەدەسەلات سەرشار دەبێ، بتەکە چەند دەسەلاتی زیاتر بێ بتپەرست لاوازترو بێ هێزتر دەبێ، بتپەرست بۆ رزگاربوون لەو بێتواناییەی، زیاتر تەسلیمی بتەکە دەبێ، تا لەرێی بوون بەکۆیلەوە بەشێك لەو دەسەلاتە دەروونیەی کە خۆی بەوی سپاردووە لێی وەربگرێتەوە، ئەم دیاردەیە بەزمانی فەلسەفەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن (لەخۆ بێگانەبوون – نامۆبوون– Alienation) لەخۆ بێگانەبوون (الاغتراب) کە مارکسو هیگل باسی لێوە دەکەن هەمان ئەو بتپەرستیەیە کە پێغەمبەرەکان لێی دواون: بوون بەکۆیلەی شتێك، لەدەستدانی (خود)و ئازادیو بەخۆداهاتنەوە لەئەنجامی ملکەچیەوە. ئێمە بەخەیاڵی خۆمان وادەزانین لەبەر ئەوەی وەکو بابلیەکانو فینیقیەکان (بەعل)و (عەشتار)مان نیە، کەواتە نەبتمان هەیەو نەبتپەرستیشین، بەلام واذیە، بتمان هەیە وەلێ بەناوی ترەوە، ناویان بەعلو عەشتار نیە، بەڵکو ناویان: دارایی، دەسەلات، بەرهەمهێنانی کالا، کالای

مەسرەفی، پلەو پایە، ناوبانگو هەر شتێکی تر کە خەڵکی لەبەردەمیدا چۆك دائەدەنو دەبن بەکۆیلەو لەئاستیدا، هەموو ئەمانە ناوی بتەکانی ئێمەن.

رەنگە گرنگترین شتی پێغەمبەران لەمێژوودا تێڕوانینیان بۆ سەبارەت بەدەرکەوتنی (_یان پەیدابوونی) رزگارکەر[٢]. ئەم تێڕوانینە تازەو بۆ وێنەیە سوودمەندیی مێژوویی خۆی سەلماندووە. بینینو داناییەکە سەبارەت بە(رزگاربوون)! رزگاربوونی مرۆڤ لەرێی وەدیهێنانی خودەوە، پێغەمبەران بەبەڵێنی دەرکەوتنی رزگارکەر مژدەی ئەوەیان ئەدا کە ئەو بەدبەختیو بەلەنگازیەی لەبەهەشتدا دوچاری ئادەم بوو، کۆتایی دێ، بەدبەختیی مرۆڤ تارادەیەك ئەنجامی لەدەستدانی ئارامیی ناوەوەو، زۆربوونی تەماو خۆزگەو هێنانە ئاراوەی پێداویستی بۆ هەبوونو خاوەندارێتیی زیاتر بوو، پەیوەندیی نێوان ژنو پیاویش هەر بەرەنجامێکی ئەوەیە، زاڵبوونی پیاو بەسەر ژندا ئەمڕۆ بۆتە مەسەلەیەکی ئاساییو بەڵگەنەویست، بەڵام لەکتێبی پیرۆزدا ئەو باڵادەستیە وەکو بەدبەختیەكو تەمێ کردنێك لەقەڵەم دراوە، بەواتایەکی دی زەمانێك کە هێشتا مرۆڤ لەبەهەشت دەرنەکرابوو پیاو بەسەر ژندا زاڵ نەبوو، بەڵگە مێژوویەکانیش گەواهیی ئەوە ئەدەن کە بەر لەمێژوو پەیوەندیی نێوان پیاوو ئافرەت بەو جۆرە نەبووە.

دوائەنجامی ئەو بەدبەختییە دوژمنایەتیی نێوان مرۆڤو سروشتە. بەو مانایەی کە مرۆڤ بەناچاری دەبێ بەئارەقی ناوچەوانی نان پەیدا بکاو ئیش چێژ بەخش نییە، بەڵکو جۆرێکە لەتەمێ کردن، ئەم بیروڕایە تائێستاش وەکو راستییەکی سەقامگیر تەماشا دەکرێ، هەمان ئەو بەدبەختییەی کە مرۆڤی مەحکوم بەدوژمنایەتی لەگەڵ سروشتدا کردووە، ئازاری منداڵبوونی ئافرەتانیش دەگرێتەوە، ئارەقی ناوچەوانی پیاوانو ئازاری منداڵبوونی ژنان دوو سیمبوڵی

---

[٢] Missianic period (قۆناغی چاوەڕوانیکردنی مەسیح لەئایینی جوولەکەداو گەڕانەوەی حەزرەتی عیسا لەلای مەسیحیەکان).

سووكایەتی پێكردنو تەمێكردنی ئادەمیزادن لەزمانی نەفرینی كتێبی پیرۆزدا، هەروەكو وتمان ئەمڕۆ ئەو دووبارەبە سروشتیو ئاسایی دەزانین، بەڵام لەڕۆژگاری نووسەرانی كتێبی پیرۆزدا وانەبوون.

مەبەستی پێغەمبەران لەپەیدابوونی رزگاركەر چی بوو؟ ئەوان خوازیاری ئاشتیەكی بالاتر لەنەبوونی جەنگو یەكریزیو هاوتەبایی نێوان كەسەكانی میللەتو نێوان ئافرەتو پیاوو هەروەها نێوان مرۆڤو سروشت بوونو، دەیانویست بارێك بهێننە ئاراوە كە تیایدا چیدی مرۆڤ فێری ترس نەبێت، ئێمە لەوە بێ ئاگاین كە شەڕەنگێزیو توندو تیژی لەدەرەنجامی ترسەوە دروست دەبن، پێغەمبەران فێرمان دەكەن گەر هەر هەنگاوێ بەترسو لەرزەوە بنێین، بەرامبەر بەكەسانی دی بەدگومان دەبینو دەبێ چاوەڕوانی خراپترین رووداوبین، پێغەمبەران تائەو رادەیە رادیكال بوون كە دەیانووت شەڕەنگێزی وەختێ لەنێو دەچێت كە ترس ریشەكێش بكەین، ئەم بڕوایەش لەقۆناغی دەركەوتنی رزگاركەردا دێتە دی، بەڕای ئەوان ئەو رۆژگارە رۆژگاری فراوانی دەبێ نەك هی كەمالیات، بەو مانایەی كە سفرە بۆ هەمووان والا دەكرێ تاهەر كەسێك كە دەیەوێ بخوات وەكو مرۆڤێك مافی خۆیەتی لەسەر ئەو سفرەیە دابنیشێو لەگەڵ ئادەمیزادەكانی تردا لەخواردندا بەشدار بێ، تایبەتمەندیەكی تری قۆناغی دەركەوتنی رزگاركەر ئەوەیە كە خەڵكی بەئاشتیو سەفا پێكەوە دەژین، چاوچنۆكیو حەسوودی نامێنێ، چیدی ئادەمیزاد لەگەڵ ئادەمیزادو لەگەڵ سروشتدا لەململانێو ناكۆكیدا نابێو ژیان ئامانجێكی دیكەی دەبێ، ئەو ئامانجەش دابینكردنی پێداویستیە جەستەییەكان نابێ، گەرچی دابینكردنیان گرفتێكە لەژیاندا، بەلام بێ چارەسەر نامێنێتەوە، پێغەمبەران خوازیاری ناسینی تەواوەتیی خواوەند بوون، یان بەزمانێكی جیا لەزمانی ئایینی دەیانویست مرۆڤ تادواسنوور پەرە بەهێزە روحیەكانو ئەقڵو ژیانی خۆی بدات، دەیانووت كەمرۆڤ دەبێ ئازادبێو سەنتەری خۆی بێو ئەبێ ببێ بەوەی كە هەر كەسێك تواناو ئیمكانیەتی بوونی هەیە.

بەکورتی رۆژگاری پەیدابوونی رزگارکەر، دووبارە خولقاندنەوەی رۆژگارێکە کە هێشتا مرۆڤ لەبەهەشتدا دەیبردە سەر، قۆناغی سەرەتای مێژوو یاسەرەتای بەر لەمێژوو بەمجۆرە بوو، بەر لەوەی ئادەمیزاد خۆی بەکەسێکی جیا لەهاورەگەزەکانی تری بزانێ تەبایی بەهەشتیی لەبەرچاو بوو، ئەو تەباییە هەمان تەبایی ئادەمیزادە سەرەتاییەکانی بەر لەمێژوو بوو، قۆناغی پەیدابوونی رزگارکەر گەڕانەوەی ئەو تەباییەیە، بەکورتی مرۆڤ ئەم جارە خۆی لەناو مێژوودا دەبینێتەوە، چاخی پەیدابوونی رزگارکەر کۆتایی مێژوو نییە بەڵکو دەبێتە نوێنەری سەرەتای راستەقینەی مێژووی مرۆڤ، لەبەر ئەوەی لەو چاخەدا ئادەمیزاد بەسەر هەموو ئەو کۆسپانەدا زاڵ دەبێ کەڕێی لێ دەگرن ببێتە مرۆڤێکی کامڵ.

پێشتر دەربارەی دەسەڵاتی سەرەکیی بیروباوەڕ لەسەر چاخی پەیدابوونی رزگارکەر لەکامڵبوونی ئادەمیزاددا قسەم کرد، لەوانەیە هیچ بیروباوەڕێك هێندەی ئەوە لەبالآبوونی ئێمەدا کاریگەر نەبووبێت. بەبێ ئەوەی بچمە وردەکارییەوە دەمەوێ بڵێم کە مەسیحیەت و سۆشیالیزم بەقووڵی کەوتبوونە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی پەیدابوونی رزگارکەرەوە. گەرچی هەریەکێك لەمانە شێوەیەکی جیاوازی پێ داوەو تارادەیەکیش لەو رەوتە لایان داوە کە باسم کرد، باوەڕ بەپەیدابوونی رزگارکەر بەدرێژایی مێژوو بەزیندوویێتی ماوەتەوە، گەرچی ئەمیش وەکو مەسیحیەت خۆی هەندێ جار دووچاری فەوتان و تەنانەت خراپەکاری بووە، بەڵام هەرگیز نەمردووەو وەکو تۆوێك بەزیندوویێتی ماوەتەوە، ئەو باوەڕە ئەمڕۆش بەشێوەی جۆراوجۆر دەبینرێ، کە سۆشیالیزم نموونەکەیەتی، سۆشیالیزمی مرۆڤدۆستانەی مارکس لەرێی هەندێ وڵاتی بەناو سۆشیالیستەوە زۆر خێرا بەرەو خراپەکاری رۆی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتەواوەتی تۆوەکەی نەمردووە، دەتوانین دووبارە زیندوو بوونەوەی جۆرە باوەڕێکی نائاییینی سەبارەت بەپەیدابوونی رزگارکەر لەسۆشیالیزمی مارکسیدا (نەك لەلای سۆشیال دیموکراتەکان یاسۆشیالیزمی کۆمۆنیستی) ببینینەوە، زیادەڕەوی نییە گەر

بڵێین کۆمەڵگای نوێ بەبێ باوەڕ بەپەیدابوونی رزگارکەر شتێکە قابیلی تەسەور نییەو هەروەها ناکرێ بەبێ ئەو باوەڕە دەرکی مێژووی نوێش بکەین، مەگەر ئەوەی بزانین لەکوێ‌و چۆن ئەو بیروباوەڕە سەرکەوتنی بەچنگ هێناوە یابەرەو خراپەکاری چووە، هەر لەبەر هەمان هۆ دەتوانین بڵێین ئەمڕۆش پێغەمبەران پەیوەندیان بەئێمەوە هەیە، چونکە ئێستاش ئێمە دەکەوینە بەردەم هەندێ هەڵبژاردن کە زۆر لەوانەی رۆژگاری پێغەمبەران دەچێ، دەبێ رێگا ئالتەرناتیڤە جیاوازەکان بناسین تایەکێکیان بگرینە بەر، بۆ پەیبردن بەپەیوەندیی کتێبی پێغەمبەران بەئێمەوە نابێ تەنها سەرگەرمی رووداوەکانی ئێستای خۆمان بین، بەڵکو دەبێ ئەو کتێبە بخوێنینەوە کە کارێکی وروژێنەرو رۆشنگەر بووەو لەهەر هەواڵێکی تازە تازەترو رۆژانەتر بووەو ئێمە لەجیهانی ئێستا ئاگادار دەکاتەوە، هەواڵەکانی رۆژانە ئەو بارە دەخەنە روو کە هەیە بەڵام رۆشناییەك ناخەنە سەری تارۆشن بێتەوە.

## مرۆڤ کێیە ؟

مرۆڤ کێ یە؟ ئە م پرسیارە ئێمە دە خاتە دڵی مەسەلەیەکەوە ئەگەر مرۆڤ شت بوایە ،دەمانپرسی : ((مرۆڤ چییە؟)) ولە وەرام دا وەك و شتێکی نێو سروشت یا بەرهەمێکی پیشە سازی پێناسەمان دەکرد ، بەڵام مرۆڤ شت نییە و ناخرێتە ریزی پێناسەی بوونەوەرە بێ گیانە کانەوە، وێرای ئەم راستیەیەش هەندێ جار بەچاوی (( شت ))ەوە، تەماشای مرۆڤ دەکەن، لەژێر ناونیشانی، کرێکار، فەرمانبەر، بەرێوەبەری کارگە، دکتۆر.... هتددا وەسفی دەکەن ، بەڵام کارو پلەو پایە تەنها رۆڵی کۆمەڵایەتلی مرۆڤ دیاری دەکەن . بەواتایەکی دی مرۆڤ بەپێ ی پلەو پایە لە ناو کۆمەڵ دا پێناسە دەکەن .

مرۆڤ جەستەیەکی بێ گیان نی‌یە ، بوونەوەرێکی زیندووە کە لە بزافی بەردەوا می گەشەسەندن و کامڵبووندایە، لەهەر ساتێكو هەر قۆناغێکی ژیانیدا هەمان کەس نییە .ئەگەر چی ناتوانین بەهەمان پێوەر کە بۆ نموونە مێز یا کاژێری پێ هە ڵدەسەنگێنین مرۆڤیش هە ڵبسەنگێنین ، بەڵام پێناسەکردنی مرۆڤیش لەو پێناسەکردنە زۆر دوورناکەوێتە، وەبەوەی کە دەتوانین لەرێی بەراوردکردنەوە لەنێوان شت و بوونەوە ری زیندوودا دەربارەی مرۆڤ بدوێین، گرنترین پێناسەی مرۆڤ ئەوە یەکە بیرکردنەوەی بەتەنها لەسنووری دابین کردنی پێداویستی‌یە فیسیۆلۆژیەکاندا نەبووە ، بە ڵکو لەوە بالاتر رۆیشتووە، فیکر لای مرۆڤ – بە پێچەوانەی گیانەوەر (ئاژە ڵ ) –ەوە بەتەنها هۆیەك نییە بۆ بەدە ستهێنانی پێداویستییەکان ، بەڵکو هەروەها هۆیەکە بۆ دۆزینەوەو پەی بردن بەحەقیقەتی خۆی‌و بەجوانی و دزێوی یەکانی ئەو جیهانەی کەتیایدا دەژی ، یان دەکرێ بگوترێ کەمرۆڤ بەتەنها هۆشی نی‌یە ، کە گیانەوەرانیش هەیانە بەڵکو ئاوەز

(ئەقلْ )یشی هەیە ، كەبەهۆی ئەوەوە پەی بەحەقیقەت دەبات، ئەگەر مرۆڤ جڵەوی خۆی بدات دە ست ئاوەزی : لەرووی فیكری‌و جەستەییەوە باشترین كار لەبەرژەوەندیی خۆی دا ئەنجام دەدات .

بەڵام ئەزموون ئەوەی سەلماندووە كەچاوچنۆكی و خۆپەرستی بەرچاوی خەڵكانێكی زۆری گرتووەو، لەژیانی تایبەتییان دا پەیرەوی ئاوەزی خۆیان ناكەن، لە وەش خراپتر گەلانیش بەفەرمانی ئاوەزی خۆیان كار ناكەن، چونكە دیاگۆگەكان (فریودەرانی خەڵكانی عەوام ) ناهێڵن، تاخەڵكی باوەر بە قسەو درۆكانیان بكەن و ،شارو گیانی خۆیان بەرەو وێرانی راپێچ دەكەن ، جا هەیدیْ ئە وگەلانەی كە چوونكە نەیان توانیوە خۆیان لە هە ڵچوونی نائاوەزی (نائەقلانی ) كە دیاری كەری رەفتاریان بووە ئازاد بكەن و، رێی پەیرەوكردنی ئەقلْ فێرنەبوون , تیاچوون . رۆڵی سەرەكیی پەیامبەرانی (چاخی كۆن)، بەپێچەوانەی باوەری باوی خەڵكەوە پێشبینی ئایندە نەبووە، بە ڵكو حەقیقەتیان رادەگەیاندو ئاكامەكانی كاری ئێستاو ئایندەیان پیشانی خە ڵك دەدا.

لەبەرئەوەی مرۆڤ شت نی یە تابەپێی رواڵەتی پێناسەی بكەین، بۆیە ناچار بۆ وەسف كردنی یاپێناسەكردنی پەنا دەبەینە بەر ئەزموونی كەسی‌ی خۆی وەكو مرۆڤ، پرسیاری ((مرۆڤ كیْ یە؟)) ئێمە رادەكێشێت بپرسین ((من كێم؟)) ئەگەر مرۆڤ بەشت بژمێرسن ، وەڵامی من كێم ئەمە دەبێت :

((ئادەمیزادێك ))

زۆرن ئەو خەڵكانەی كە ناسنامەی ئادە می بەخۆیان رەوا نابینن و، لە كەسی خۆیان و ماهیەتی خۆیان و گەوهەری خۆیان، وێنەی وەهمی دەخوڵقێنن. ئەو جۆرە كەسانە لەوەڵامی پرسسیارەكەی ئێمەدا دەڵێن: ((من مامۆستام)) ((من كرێكارم)) یا ((من دكتۆرم)) بەڵام ئەوزانیاریانەی تایبەتن بەكارو وەزیفە هیچ شتێك دەربارەی خودی ئەو كەسە بەدەستەوە نادەن و، وەڵامی ئەم پرسیارە نادەنەوە : ((ئەو كێیە؟)) یا ((من كێم؟))

لێرەدا رووبەرووی مەسەلەیە کیدی دەبینەوە، هەریە کێك لەئێمە ئەدگاری کۆمەڵایەتی، ئاکاریو سایکۆلۆژیی خۆی هەیە. کەی و چۆن دەتوانین بزانین کە ئەدکاری فلانە کەس هەتا هەتایە وەکوخۆی دەمێنێتەوەو ئەزموونێکی بەهێزنایگۆرێت؟ ئایا خەڵکی دەگەنە ئاستێك کەتیایدا وەها نەگۆر سەقامگیربن، کە بکرێ بوترێ ئەوەن کەهەن و هەرگیز ناگۆرێن ؟ لەدیدێکی ئامارییەوە ئەم مەسەلەیە شتێکی ئەستەم نییە، بەڵام ئایا دەکرێ ئەمە سەبارەت بەتاکە کەسیش وابێت تائەو رۆژەی کەتیایدا دەمرێت؟ ئایا ناشێ ئەو مرۆڤە کەدەمرێت ، ئەگەر لەژیاندا بمێنێتەوە بگۆرێت .

دەکرێ مرۆڤ لەرێ ی چەند ئەدگارێکی تریشەوە پێناسەبکرێ، لەملرۆڤ دا دوو جۆر مۆتیڤ هەن، یەکێکیان بایۆلۆژییەو کەلەهەمواندا یەکسانەو ئەو پێداویستییانە دەگرێتەوە کەپێی دەڵێن پێداویستیەکانی مانەوە: پێداویستی بۆ لابردنی برسێتی و تینوێتی، پێداویستی بەئاسایش و پارێزگاری، پێداویستی بۆ جۆرە قە وارەیەکی کۆمەڵایەتیو، بەپلەی دووەمیش پێداویسی بەتێر کردنی مەیلی سێکسی، بەڵام وروژانەکانی جۆری دووەم ریشەیەکی بایۆلۆژیان نییە لە هەموان دا وەکو یەك نییە. ئەو وروژانانە –وەکو خۆشەویستی، هاوپەیوەندی، ئێرەیی، رق لێ بوونەوە، غیرەو چاوچنۆکی و هتد.... لە بونیادی کۆمەڵایەتیەوە سەرچاوە دەگرن. جێی وەبیرهێنانەوەیە کەرق لێ بوونەوە دوو جۆرە: کاردانەوەیەکی ناوەوەیی، کەپێویستە لەیەکدی جیابکرێتەوە ، رقی کاردانەوەیی وەڵامە بۆ هێرشێك یان هەرەشەکردن لەخودی کەسێك یان گروپێك کە ئەو ئەندامە تیایداو، پاش نەمانی مەترسی یە کەئەویش لە ناو دەچێت، بەڵام رقی ناوەوەیی لە خەسڵەتەکانی سروشتی کەسانێکن . ئەو کەسەی کە ئەم جۆرە رقە لەناخیدا هەبێت، بەردەوام دەیەوێت لەرێگای جیاجیاوە ئەو رقەی خاڵی بکاتەوە .

وروژانە کۆمەڵایەتیەکان ، بەپێچەوانەی وروژانە بایۆلۆژیەکان، دەرئەنجامی بونیادێکی کۆمەڵایەتی تایبەتن. لە کۆمە ڵگایەکدا کە کەمینەیە کی زەوتکەر بەسەر زۆرینەیەکی زەوتلێکراو وهەژاردا حوکمران بن ، هەردوو لایەن پر رقو

بێزار دەبن، رقی کەمینەی حوکمران بەترس لەتۆڵە سەندنەوەی چینی هەژار بەهێز دەبێت ، جگە لەوە دەبێ کەمینە رقی لەعەوام بێتەوە تاهەست کردن بەگوناه لەناخی خۆیدا خەفە بکات وریٚ بۆ زەوت کردنی خۆی خۆش بکات. تادادو یەکسانی بەرقەرار نەبێ، رك و کینە لەناو ناچێت. هەروەها تاخەڵك ناچاری درۆ کردن بن بۆ ئەوەی پاساوی نەزانینی خۆیان بۆ دادو یەکسانی بهێننەوە ، ئەوا راستی و دروستی لە گۆرێ دا نابێت. هەندێك هەن دەڵێن گوایە مەسەلەی لەم جۆرانە: واتە دادویەکسانی بریتین لە کۆمەڵێك ئایدۆلۆژیا کە لەرەوتی مێژوودا دروست کراون وبەسەرەتایەکی بنچینەیی وسروشتی پەیوەندیەکانی ژیان نازمێردرێن . من لێرەدا نامەوێ بکەومە وردو درشتی پووچەڵ کردنەوەی ئەو جۆرە بیروباوەرە، بەڵام تەنها لە سەر خاڵێکی هەڵوەستە دەکەم: ئەو کاردانەوەیەی کە خەڵکی بەرامبەر پێشێل کردنی دادوو یە کسانی پیشانی دەدەن ، خۆی لە خۆی دا ئەوە بەدەردەخات کە لەو کاردانەوەیەدا هەست بەکۆمەڵێك بەها دەکەن، هیچ هەستێکی ویژدانی بەشەری لەهیچ بوارێکدا هێندەی کاردانەوەی بەرامبەر بەپێشێل کردنی مافی دادو یەکسانی روون و ئاشکرا نیە . هەڵبەتە بەو مەرجەی کەخودی ئەو کەسە خۆی بەوپێشێلکردنە تاوانبار نەبێت. ویژدانی نیشتمان و گەلیش بەرامبەر دوژمن هەمان کاردانەوەی هەیە، ئەگەر خەڵکی خۆیان هەستێکی ئەخلاقی سروشتیان نەبوایە چۆن دەکرا لەرێی روونکردنەوەی ستەم و کوشتارەکانی دوژمنەوە بوروژێنرایە.

لە پێناسەیەکی تردا دەوترێ کەمرۆڤ گیاندارێکە کەئاکارو رەفتاری غەریزەی لەکەمترین ئاستدایە. شتێکی بەڵگە نەویستە کە مرۆڤ توخمەکانی وروژاندنی غەریزی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە، وەکو تێرکردنی برسێتیو مەیلی سێکسی. بەڵام زۆربەی وروژانەکانی مرۆڤ –پلەو پایەخوازی ، غیرە. ئێرەییو تۆڵە سەندنەوە– لە بونیادی نێو کۆمەڵەوە سەرچاوە دەگرن. ئەوراستییەی کە ئەم مۆتیڤانە دەتوانن بەسەر غەریزەشدا زاڵ بن بەڵگە ی بەهێزیی ئەمانەیە. خەڵکی لەپێناوی ناکۆکیو

پلـەو پایەپەرسـتیو خۆشەویسـتی و ئەمەکداریـدا دەسـت لـە گیـانی خۆشـیان دەشۆن .

دزێـوترین مـۆتیڤ (دافع ) لەبەشـەردا چەوساندنەوەو زەوت کردنـی خـەڵکانی تـرە لـە ڕێـی بـە کارهێنـانی هێـزەوە، کەهـەمان مرۆڤخۆرییەکـەی جارانـە، بـەڵام لـە بـەرگێکی ناسـکدا، ئـەم جـۆرە مـەیل ورووژانـە لەچـاخی بـەردینی نوێـدا لـەئارادا نـەبووە، خـەڵکانی ئـەم ڕۆژگـارە نـاتوانن بـاوەر بکـەن بـەوەی کـەرۆژگارێك هـەبووە تیایدا نەچەوسێنەرو نەچەوساوە هەبووە. بەڵام مێژووی مرۆڤایەتی ئەم دەورانەی دیـوە. لەکۆمــەڵگا سـەرەتاییەکانی مرۆڤایەتیـدا. جوتیـارو ڕاوچـی، هەرکەسـە هۆیـەکی وەهـای هـەبووە کـەپێی بژیو گـوزەرانی پـیٚ بکـاتو. داگیرکردنـی سـەرو سامانی خەڵکانیـدی و کەڵـە کـەکردنی شمـەك و کەلوپـەل کارێکی بێهوودەبووە. هێشتا سەرمایە پێکەوەنان و بەکارهێنانی سەرمایە وەك وەسیلەو سەرچاوەیەکی هێز نەهاتبووە گـۆرێ. ئـەو قۆناغـەی بیرو ژیـانی مرۆڤایـەتی بەشـێوەیەکی رەمـزی لەکتێبی چاخی کۆن دا رەنگی داوەتەوە :

(لەبیاباندا رۆلە کانی ئیسرائیل گەزۆیان دەدرایە) هەرکەسە چەندی بویستایە ئەیخوارد، بـەڵام خستنەلاوەو کۆکرنـەوەی شـتێکی ستەم بوو،. ئـەوەی نەدەخورا هەمان رۆژ خراپ دەبوو لەناو دەچوو، نیگە رانـی لـە ئارادانـەبوو بـۆ ئـەوەی رۆژی دوایی چی بخۆن. بـەڵام شـتێکی وەك گـەنم یـاتۆو لـەناو نـابریۆ دەتـوانریٚ کەڵەکە بکریٚ و وەکو وەسیلەیەك بۆ بەدەستهێنانی هێزو بەکارهێنانی دژ بەخەڵکانی دی سـوودی لـیٚ ببینـریٚ. رۆژگارێـك کەبـەروبووم زیـاد لـە پێویسـت بەرهـەم هێنـرا، بەسـوودی چینـی فـەرمانرەوادا شـکایەوە. ئـەو کەسـانەی سـەر بـەو چینە بـوون توانیـان ئـەوانی دی بخەنـە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیانـەوەو ناچـاریان بکـەن کـە بـۆ فـەرمانرە وایـان کـار بکـەن و بـە ئاسـتێکی کـەمی گـوزەران قایـل بـن، کۆیلـە کـان، کرێکـاران و مێیینـە بوونـە قوربـانی سـەرەکیی ئـەم چەوسـاندنەوەیە لـە رژێمـی باوکسالاریدا.

رۆژێـك دێ کۆتـايی بەســەردەمی مرۆڤخـۆریی بەرلـە مێـژووبێت و مێـژووی راسـتەقینەی مـرۆڤ دەسـت پـێ بکـات، کـە تیایـدا مـرۆڤ وەك شمـەکێك نەکەوێتـە ژێردەسـتی هێزدارانـەوە. ئاسـۆی ئـەو رۆژەوەختێـك بـەدەر دەکـەوێت کـە بـزانین مرۆڤخـۆری و خـوو و رەوشـتەکانمان چەند تاوانیـان لەگـەڵ خۆیان دا هـەڵگرتوە. بــەڵام ئــەو زانینــەش ئەگــەر لــە ناخــەوە پەشــێمانیی لەگەڵــدا نــەبێت هــیچ کاریگەریەکی‌نابێت .

پەشـیمانی هەسـتێکی بـەرزترە لەئەفسـوس و ورووژانێکـی بـەهێزە. مرۆڤـی پەشـێمان هەسـت بەبێزاریـەکی راسـتەقینە دەکـات لـەخۆیو لـەکارەکانی خـۆی. پەشـیمانیی راسـتەقینەو شـەرمەزاری والـە مـرۆڤ دەکـەن ئـەو تـاوان و گوناهانـە دووپـات نەکاتـەوە کەلـەرابوردوودا کردوونـی. ئـە گـەر پەشـیمانی نـەبێت مـرۆڤ کـردەوەو رەفتـاری ناشایسـتەی خـۆی بـەتاوان و گونـاه نازانێـت. بـەڵام ئایـا مـرۆڤ چۆن دەتوانێت پەشیمانیی راستەقینەو هـەڵقوڵاو لـە نـاخی دەروونـەوە بەدەسـت بهێنێت؟ ئایا ئیسرائیلیەکان لەکوشتنی کەنعانیـەکان هەستیان بەپەشیمانی کـرد؟ ئایـا ئەمریکاییـەکان لەقـەتڵوعامی خـەڵکانی رەسـەنی ئـەو کیشـوەرە پەشـیمان بوونـەوە؟ هـەزاران سـاڵە سیسـتەمی ژیـانی مرۆڤایـەتی بەردەوامـە لـە دامـاڵینی کاریگـەریی پەشـیمانی، چـونکە هێـزو دەسـەڵات وەکـو هـەق تەماشـا دەکـرێ. پێویسـتە هـەموومان دان بـەگوناه و تاوانـەکانی پێشـینانمان و هاوچـەرخانمانو خۆمان دابنێین، ئیدی راستەوخۆ ئەو گوناهانەمان کردبێت یان لەئاستیدا بێدەنگ بـووبین پێویسـتە بەوپـەڕی راشـکاوییەوەو بەشـێوەیەکی ئاشـکرا، هـەروەکو رێو رەسمـە ئایینیـیە کاسـۆلیکیەکان، دان بەگوناهەکانمانـدابنێین، تـادەنگی ویـژدانی خۆمان ببیستین، بەڵام بەتەنها دانپێدانان بەگوناهەکانی تاکەکـەس دا بـەس نیـیە، چـونکە خـەتاکانی گـزوە و چـین و میللـەت وحکومـەت ناگرێتـەوە کەپەیوەنـدییان بەویـژدانی تاکـە کەسێکەوە نیـیە، تـادان بە((تـاوانی میللـی ))مان دا نـەنێین هـەر لەرۆیشــتن بەســەرهەمان رێــی رابووردومــان دا بــەردەوام دەبــین، چـاومان لــە تاوانـەکانی دوژمنانمـان دەبـێ، بـەڵام گوناهـەکانی خۆمـان نـابینین. چۆن دەکـرێ

کەسانێك بەشێوەیە کی جیددی پەیرەوی دەنگی ویژدانیان بکەن لە کاتێك دا میللەتان، کەخۆ یان بەپاسەوانی ئەخلاقیان دەزانن، بێ گوێدانە ویژدانیان سەرگەرمی کاری خۆیانن، ئەمەش ئەنجامەکەی بەوە دەشکێتەوە کەدەنگی ویژدان لەهاوولاتیان دا خەفەدەبێت . چونکە ویژدانیش وەکو حەقیقەت شتێك نییە بەش بەش بکرێ، ئەگەر ئەقڵ بەسەر تەواوی کارەکانماندا فەرمانڕەوا بێ، کەواتە ناکەوێتەژێر دەسەلاتی هەڵچوونە نامەنتیقیەکانەوەو هۆش هەر هۆشە تەنانەت گەر دەستەو یەخەی خراپەش بێ. بەلام ئەقڵ کە ئاگابوونمانە لەحەقیقەت، نەك ئەوەی کەمەیلمان لێیەتی، تەنها وەختێك کاریگەر دەبێت کە هەڵچوونە نائەقلانیەکان لەخۆمان دوور بخەینەوە، واتە بەمانای ڕاستەقینە ببینە مرۆڤ و ئەنگێزە نائەقلانیەکان جڵەوی کارەکانمان نەگرنە دەست.

بەقبوولکردنی ئەم مەرجە بزانین کام ئەنگێزانە بۆ مانەوەی مرۆڤایەتیی پێویستە، دەکرێ تیرۆرو وێرانکاری ببنە وەسیلەیەك لای گروهێك بۆ لەناوبردنی گروهێکی دی. بەلام گەر هەمان ئەم ئەنگێزانە لەزەمینەیەکی گشتی مرۆڤانەدا تەماشا بکەین، ئەوا مانایەکی دی دەدات، گەر زەبرو زەنگ لەهەموو مرۆڤیکدا هەبێت" نەك بەتەنها گروهێك" بەلکو تەواوی مرۆڤایەتی تیا دەچێت. لە ڕابوردوودا" ئەمە تەسەور نەدەکرا، بەلام ئەمڕۆ خۆشەویستیی ژیان بێ ڕەنگ بووەو فەوتاندنی مرۆڤایەتی شتێکیدوور نییە. چونکەئەو وەسیلەی فەوتاندنە لە دەست خۆماندایەو، لە بیری خۆماندا بەکارهێنانی تاوتوێ دەکەین. ئێستا پێویستە ئەوە بزانین کە پرەنسیپی (مانەوە بۆ باشتر) کە ولاتانی زلهێز بەلای خۆیاندا دەیشکێننەوە" دەشێ بگاتە فەوتاندنی ئەسڵی مرۆڤ.

لە سەدەی نۆزدەهەم دا ( ئیمرسۆن)ی شاعیر وتویەتی: ((شتەکان بەسەر مرۆڤ دا زاڵن و بۆ کوێیان بوێت دەیبەن)) ئیمرۆش دەکرێ بوترێ کە((مرۆڤ شتەکانی کردووە بەبتیخۆی و کۆمەڵێك بت دەپەرستێ کە لەتوانایاندایە لە ناوی بەرن)).

بەردەوام ئەوەمان بەر گوێ دەکەوێت کە خۆ گونجاندنی مرۆڤ بێ سنوورە. ئەم قسەیە لە سەرەتاوە خۆی ڕاست دەنوێنێت. بەدرێژایی سەدەو چاخەکان بە

دەردەکەویت کە هەر لە باشترین کارەوە تا خراپترینیان کاریك نەبووە مرۆڤ نەیتوانیبیت ئەنجامی بدات. بەلام تیژی خۆگونجاندنی مرۆڤ سنووری هەیە، هەر رەفتاریك لە خزمەتی گەشەسەندنی خودی یا بەرەو کاملبوونی دا نەبیت" زیانبەخش دەبیت.

چەوسینەر لەچەوساوە دەترسیت ، تاوانکار لەو گۆشەگیرییەی کە لەئەنجامی کارەکەیەوە دوچاری بووە دەترسیت " ویرانکەر لەویژدانی خۆی دەترسیت، فرۆشیاری کەل و پەلی بیهودەو بیتام لەنەزانینی نهیذیی ژیان دەترسیت .

کەواتە خۆگونجانی بیٚ سنووری مرۆڤ لەمانا فراوانەکەیدا ئەوە دەگەیەنیت کەمرۆڤ لە رووی جەستەییەوە زیندووەبەلام لەرووی مرۆڤایەتی یەوە ئیفلیجە. ئەم جۆرە مرۆڤە بەختەوەر نییەو لەزەت لە ژیانی نابینیت، بەدبەخت و بەلەنگازەو بەلەنگازی بەرەو ویرانکاری پەلکیشی دەکات. بەلام ئەگەر بتوانیت ئەوبەرگە لە خۆی دابمالیت دووبارە پەی بەلەزەت و شادی دەباتەوە. مرۆڤ کاتیك لەدایك دەبیت لە رووی روحیەوە ساغە. بەلام لەسەر دەستی خەلکانی دیکە دەیانەویت بەسەریدا زالبن. ئەو خەلکانەی کە لە ژیان بیزارن و رقیان لە ژیان دەبیتەوەو بەرگەناگرن گوییان لەدەنگی تریقەی پیکەنینی پر لە شادی بیت، تیکدەشیویت و ئیفلیج دەبیت. ئەوانە ئەنجامی دوژمنایەتی یەکانی خۆیان بەرامبەر بەمنالٚ بۆ رەفتاری ناشایستەی منالٚ دەگەرینەوە نەك بۆ هۆو سەرچاوەکانی ئەو دوژمنایەتییە.

بۆچی کەسیك حەز بەخراپەی کەسیکی دیکە دەکات و دەیەویت پەکی بخات؟ وەلامی ئەم پرسیارە لەخووی مرۆڤخۆریدا خۆی حەشارداوە. کەتا ئیستاش لە کۆمەلگای ئیمەدا ( دونیای خۆرئاوا ) هەرماوە، کەسیك کەپەکی بخریت و دوچاری ئیفلیجیی روحی بیت، ئاسان تر لە کەسیکی بەهیز دەچەوسینریتەوە. مرۆڤی بەهیز بەرەنگار دەبیتەوە، بەلام مرۆڤی لاواز ئەو توانایەی نییەو دەبیتە بەندەی دەسەلاتدارانی خراپەخواز. دەستەی دەسەلاتدار چەند بتوانن خەلکانی ژیر دەسەلاتی خۆیان لە رووی روحیەوە ئیفلیج بکەن ئەوەندە ئاسانتر دەتوانن

زەوتیـان بکـەن و بیانچەوسـێننەوەو پەیـڕەی سـەرکەوتنی خۆیـان قـایمتر بکـەن. لەبەرئەوەی مرۆڤ خاوەنی ئاوەزە، دەتوانێت ئەزمونەکانی خۆی هەڵبوەشێنێتەوەو شـی بکاتـەوەو ببینێـت کامیـان هۆیەکـە بـۆ کـامڵبوون یـان دواکـەوتنی، مـرۆڤ تـا گەیشـتن بەئـەنجامی خـۆی کـە خۆشـگوزەرانی و ئاسـودەییە هێـزە فیکری‌ـو جەسـتەییەکانی خـۆی پـەروەردە دەکـات. هـەروەکو سـپینۆزای فەیلەسـوفیش وتوویەتی" بەرامبەری خۆشگوزەرانیو ئاسودەیی" غەمگینی و مەلوولیە.

ئەمـەش بـەو مانایەیـە کەشـادی بەرئـەنجامی ئەقڵـەو غـەمگینی و مـەلوولیش بەرئـەنجامی گرتنـە بـەری ڕێگـای هەڵـەی ژیانـە. ئـەم مەسـەلەیە لـەکتێبی چـاخی کۆنـدا بـاس کـراوە" لـەو جێیـەدا کـەدەڵێت ئیسـرائیلییەکان ژیـانێکی خـاڵی لـە شادییان هەیە گەرچی نوقمی نازو نیعمـەتێکی زۆرن. ئەمـەش گونـاهێکی گەورەیـە بۆ ئەو نەتەوەیە.

ئەرکـە سـەرەکیەکانی کۆمـەڵگای پیشەسـازی لەگـەڵ خۆشـگوزەرانی مرۆڤدا کۆك نییە ، ئەو ئەرکانە چین ؟

یەکەمین ئەرکی سەرەکی ئەوەیە کەدەبێ سروشت کۆنترۆڵ بکرێ، بـەڵام ئـاخۆ کۆمــەڵگا پــێش – پیشەسـازیەکان سروشـتیان کـۆنترۆڵ نـەدەکرد ؟ هەڵبەتـە کەدەیانکرد، ئەگینا دەبووایە مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە لەبرسانا بمردنایە. بەڵام شـێوازی کـۆنترۆڵکردنی سروشـت لەکۆمـەڵگای پیشەسـازیدا تـەواو جیایـە لـەو شــێوازە لەکۆمــەڵگا کشــتوکاڵیەکاندا. بەتایبــەتیش لــەو ڕۆژگــارەوە کــە بــۆ کۆنترۆڵکردنی سروشت سود لەتەکنەلۆژیا دەبینرێ. تەکنەلۆژیا چۆنێتیی فیکـری مرۆڤ بۆ بەرهەمهێنانی شمەك رادەهێنێت.

ئـەم کـارەش وەکـو ئـەوە وەهایـە پیـاو جێـی رەحـم (منالـدان )ی ژن بگرێتـەوە، لەئەفسانە بابلیەکاندا دەربارەی خوڵقاندنی مرۆڤ هاتووە کە ((دایە گەورە)) جیهان دەخاتەوە.

ئەركی دووەم" یان پێداویستیی دووەم لە كۆمەڵگای پیشەسازیدا ئەوەیە كە دەڵێن" دەكرێ مرۆڤ لەرێی زەبرەوە یان پاداشتەوە. یان ئامێتەیەك لەو دووانە زەوت بكرێو بەكار بهێنرێت .

پێداویستیی سێیەم لەو باوەرەوە سەرچاوە دەگرێ كەدەبێ چالاكیی ئابووری قازانجبەخش بێت. لەكۆمەڵگای پیشەسازیدا هەڵپەكردن وراكردن بەدوای قازانج دا نیشانەی چاوچنۆكی نییە، بەڵكو پێوەرێكە بۆ هەڵسەنگاندنی راست و رێكیی چالاكیی ئابوری، شمەك (سلعه) بۆ سوود لێ وەرگرتن بەرهەم ناهێنرێ، گەرچی زۆربەی بەرهەمهێنراوەكان دەبێ بەهای بەكارهێنانیان هەبێ تابفرۆشرێن. ئامانجی بەرهەمهێنان قازانجە. دوائاكامی چالاكیی ئابوریی دەبێ ئەوەبێت كەبەرهەمهێنەر پتر لە بوودجەی ئەنجامدراو بەدەست بهێنێت. هەموو بەهەڵە ئەنگێزەی قازانج بەنیشانەی خەڵكانی چاوچنۆك لەقەلەم دەدەن, هەڵبەتە دەشێ كە قازانج كردن لەو ئەنگێزەیەوە سەرچاوە بگرێ. بەلاّم ئەمە سەلمێنەری رێكوو‌پێكی كۆمەڵگای پیشەسازیی ئێستا نییە. قازانج بەتەنها بەڵگەی دروستیی جموجۆڵی ئابووریو پێوەری ركابەرایەتییە لە سەوداو مامەڵەدا.

پێداویستیی چوارەم " كە لە تایبەتمەندێتییە كلاسیكیەكانی كۆمەڵگای پیشەسازییە. ركابەرایەتی (منافسە)یە. مێژوو ئەوەمان پیشان دەدات كەلە ئەنجامی كۆبوونەوەو فراوانبوونی هەندێ دام و دەزگاو بە هۆی نرخ دانانی ناقانونی كە لە ئارادایە ركابەرایەتی لە نێوان دام و دەزگا ئابووریە گەورەكاندا رێی هاوكاریی لە نێوانیاندا خۆش كردووە. ركابەرایەتی زیاتر لە نێوان دوكاندارە بچوكەكاندا هەیە، نەك لەنێوان دوو رێكخراوی ئابووری یا پیشەسازیدا . لە سیستەمی ئابووریی نوێدا پەیوەندیی عاتیفی لەنێوان فرۆشیارو كریاردا نەماوە. لەرا بردوودا پەیوەندی یەكی تایبەتی لە نیوان فرۆشیارو كریاردا هە بووە. فرۆشیار یان بازرگان پەیوەندییەكی باش دەیبەستەوە بەكریارەكەی خۆیەوەو فرۆشتن شتێكی بەرزتربوو لەسەوداو مامەڵە. فرۆشیار بەفرۆشتنی شتی سوودمەندو باش بەكریارەكەی هەستی بەرەزامەندی دەكرد. هەڵبەتە دەكرێت

ئەمرۆش ئەو هەلومەرجە ببینرێتەوە" بەڵام دەگمەن بووەو پاوانە لەسەر موغازە بچووك و کۆنەکان. لەفرۆشگایەکی گەورەدا فرۆشیار زەردەخەنەیەکی بەئەدەبانەی لەسەر لێوە. بەڵام لەفرۆشگای شمەکە هەرزانەکاندا فرۆشیار لالوتانە رووی وەردەگێرێت. پێویست بەوەش ناکات کە بڵێین زەردەخەنەی فرۆشیاری فرۆشگا گەورەکە زەردەخەنەیەکی ساختەیەو نرخەکەی وا لەسەر شمەکەکە .

خاڵێکی تر ئەوەیە کەلەم چاخەی ئێمەدا هاوخەمی وبەشداری لەخەفەت و کەسەری خەڵکانی تردا کەم بووەتەوەو، لەگەڵ ئەمەشدا بەرگەی ئازارو دژوارییش کەم بووەتەوە. هەڵبەتە مەبەستم ئەوەنییە کەئەمرۆ خەڵك کەمتر لە جاران دوچاری ئازارو غەم دەبن، بەڵکو هێند لە خۆ بێگانەبوون کە ئاگایان لەئازاری خۆیان نەماوە، وەکو ئەو کەسانەیان لیٚ هاتووە کەدوچاری نەخۆشیەکی بەردەوام بوون و ئازاری خۆیان بەشتێکی ئاسایی لە قەڵەم دەدەن و وەختێك سەرنجیان رادەکێشیٚ کەئازارەکە لەو سنوورە ئاساییە تێپەرێت. هەڵبەتە هەستی ئازار هەستێکە لەتەواوی خەڵکدا هەیە. بۆیە ئەو مرۆڤەی دووچاری ئەم ئازارە بووە جۆرە ئاسوودەییەك لە بەشداربوونی خەمی مرۆڤانی تردا دەبینێتەوە. زۆرن ئەو کەسانەی کە هەرگیز تامی شادییان نەچەشتووە. بەڵام کەسێك نابینیتەوە کە دوچاری ئازارو ئەشکەنجە نەبووبێت، گەرچی هەمووان ئەوپەری تەقەللا دەکەن کەخۆیان لەئاگابوون لەو ئازارە بدزنەوە. هاوخەمی لە خۆشەویستیی مرۆڤایەتی جودا ناکرێتەوە. هەرکوێیەك خۆشەویستیی لیٚ نەبوو هاوخەمیشی لیٚ نابێت. بەرامبەرەکەی هاوخەمیش بیٚ دەربەستییە. لەدیدێکی پزیشکیانەوە بیٚ دەربەستی جۆرێکە لە شیزۆفرینیا. خۆشەویستی بەرامبەر کەسێك مانای وابەستەییە بەو کەسەوە. هەرکەسێکیش بەتەنها یەك کەسی خۆش بوێت" لەراستی دا کەسی خۆش ناوێت.

**ناوی کتێبەکە لە چاپە ئینگلیزیەکەیدا:**

**For The Love of Life**
**Erich Fromm- 1983**

**ئەمە دەقی وەرگێڕراوی کتێبەکەیە بە فارسی:**

**((بنام زندگی)) ، اریك فروم ، ترجمە اکبر تبریزی**

**چاپ اول، ١٣٦٧ (١٩٨٨) ، انتشارات مروارید– تهران**

# كتێبە چاپكراوەكانی تری وەرگێڕ

**بەكوردی:**

- چاوەكانی (ڕۆمان)_بوزورگی عەلەوی
- نەورەس (كورتە ڕۆمان)_ڕیچارد باخ
- خەونێك لەولاتی پیاوە بچكۆلەكاندا (كورتە چیرۆكی جیهانی)
- بەناوی ژیانەوە( چاپی یەكەم ١٩٩٧) ئەریك فرۆم
- شۆڕش یا ڕیفۆرم (گفتوگۆ لەگەڵ ماركۆزو پۆپەردا)
- پیدرۆ پارامۆ (ڕۆمان)_خوان ڕۆلفۆ_(بەهاوكاری لەگەڵ ڕێبوار سیوەیلیدا)
- چەند وێستگەیەكی فیكریو ئەدەبی(وتار و باسی فیكری و ئەدەبی)
- تریفەی تەنیایی (ژیانو شیعری سوهراب سپهری)
- توركیا لەسەردەمی گۆڕاندا _محەمەد نورەدین
- لەگەڵ ئەقڵی خۆرئاوادا (چەند گفتوگۆیەكی فەلسەفیو ئەدەبی)
- نیچە _ پۆڵ ستراتێرن
- ژنێ لەبەردەم وەرزێكی سارددا (ژیان و شیعری فروغ فەروخزاد)
- سارتەر_پۆڵ ستراتێرن
- مۆدێرنەكان_رامین جەهانبەگلو

**بەعەرەبی:**

- مضيق الفراشات (قصيدة طويلة للشاعر الكردى شيركو بيكه س ترجمة أزاد البرزنجي, دار الرازى –بيروت- لبنان.
- عار تماماً كالماء (مختارات شعرية لدلاوةر قرةداغى)- ترجمةأزاد البرزنجي, دار الطليعة الجديدة – سوريا – دمشق.
- سِفرالروائح (قصيدة طويلة للشاعر شيركو بيكه س) - ترجمةأزاد البرزنجي, دارنينوى -دمشق –سوريا.